ک. م. شریفاسلافا

# ئاژانسەکانی دەنگوباس

## لە کۆترەوە بۆ ئینتەرنێت



وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە:

**شاخەوان کەرکووکی**

ک. م. شریڤاستاڤا

# ئاژانسەکانی دەنگوباس

## لە کۆترەوە بۆ ئینتەرنێت

وەرگێڕانی:

شاخەوان کەرکووکی

ناوی کتێب: ئاژانسەکانی دەنگوباس لە کۆترەوە بۆ ئینتەرنێت
نووسینی: ک. م. شریڤاستاڤا
وەرگێڕانی: شاخەوان کەرکووکی
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٨٢٣
هەڵەگری: بەدران ئەحمەد حەبیب
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
بەرگ: مریەم موتەقییان
چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٨
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ١٩٤١ی ساڵی ٢٠٠٨ی دراوەتێ

# پێشەکی

ئەم کتێبە باسی بەشێکی گرینگی بازرگانیی جیهانیی بواری هەواڵ دەکا، کە ئاژانسەکانی دەنگوباسن. هۆی داهێنانی ئەم ئاژانسانە خواستی فرەوانکردنی بواری هەواڵ بوو لە لایەن ڕۆژنامەکانەوە و بێتوانایی ڕۆژنامەکان بوو لە بەدیهێنانی ئەم خواستە. یەکەمین ئاژانسەکانی دەنگوباس لە سەردەمێکدا دەستیان بەکار کرد کە خێراترین تێکنۆلۆجیای گواستنەوەی هەواڵ تێکهەڵکێشکردنی تێلیگراف و کۆتری نامەبەر بوو. لەو کاتەوە ئاژانسەکانی دەنگوباس چەندین پێشکەوتنی تێکنۆلۆجیاییان بەخۆوە دی و ئەو تێکنۆلۆجیایانەیان بۆ زیادکردنی خزمەتگوزاری و داهات بەکار هێنا. کارە بازرگانییەکان و حکوومەتەکان، لە پاڵ کەناڵەکانی میدیاوە، پشت بەئاژانسەکانی دەنگوباس دەبەستن بۆ ئەوەی بتوانن شان بەشانی نوێترین پێشهاتەکان بەڕێوە بچن.

لەگەڵ پەیدابوونی ئینتەرنێت، هەندێک پێیان وا بوو ئیتر ئاژانسەکانی دەنگوباس لەم بازرگانییە وەدەر دەنرێن، هەر ڕەنگە لە کۆتاییدا ببنە داینۆسۆری بواری ڕۆژنامەوانی. بەڵام لەبەرئەوەی ئاژانسەکان لە پێش لەدایکبوونی ئینتەرنێتیشەوە تێکنۆلۆجیا دیجیتاڵەکانیان بەکار دەهێنا، ئەو ئاژانسانەی دەنگوباس کە بەشێوەیەکی باش بەڕێوە دەبران ئەم مەترسییەیان وەک هەلێکی نوێ قۆزتەوە. بگرە هەندێ ئاژانس کە لە گیانەڵا بوون ئینتەرنێتیان بۆ بوو بەدەرمانێکی نوێی ژیانبەخش.

هەرچەندە هەندێ ژینامەی هاوبەش و چەند سیمینار و کۆنفرانسێک لەبارەی ئاژانسەکانی دەنگوباسەوە هەبوون، بەڵام لە ڕاستیدا لەم ٢٥ ساڵەی دوایی هیچ کارێکی شیکاریی گشتگر لەبارەی ئەم بازرگانییەوە نەکراوە. ئەم کتێبەش هەوڵێکە بۆ پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییییەی ئەدەبیاتی جیهانیی تایبەت بەڕۆژنامەوانی و تۆژینەوەکانی تایبەت بەمیدیا و گەیاندنی نێودەوڵەتی و تۆژینەوەکانی بەڕێوەبردنی

بازرگانی. جگە لەوەش خوێنەرانی ئەم دیسپلینە ئەکادیمیاییانە و دیپلۆماتەکان و داڕێژەرانی سیاسەت و هەموو تایبەتمەندانی جۆراوجۆری گەیاندن دەتوانن سوود لەم کتێبە وەرگرن. هەروەها سوودبەخشیشە بۆ ئەو خوێنەرە ئاساییانەی بێ ئەوەی مەبەستیان بێ بەرهەمەکانی ئاژانسەکانی دەنگوباس لە ڕێی گشت کەناڵەکانی میدیاوە ـ لە ڕۆژنامەوە تا تەلەفۆنی مۆبایل ـ بەکار دەهێنن.

بایەخدانی من بەئاژانسەکانی دەنگوباس لە ساڵی ١٩٧٨ەوە دەستی پێ کرد کاتێ وەک ڕۆژنامەوانێکی کارا بەنوێنەرایەتیی ئاژانسی دەنگوباسی ساماچار بهارتی لە خولێکی تایبەت بەڕۆژنامەوانانی ئاژانسی دەنگوباس لە پەیمانگەی هیندستان بۆ ڕاگەیاندن بەشداریم کرد. ئەو کات خاتوون ئەندێرا گاندی وەک سەرۆک وەزیرانی هیندستان ئەو خولەی، لە کۆبوونەوەی لووتکەی گفتوگۆی جیهانی بۆ ڕێکخستنی زانیاری و گەیاندن لە جیهانی نوێدا، ڕاگەیاند. ئەو کاتە بەڕێز شاردا پراساد ڕاوێژکاری ئەو بوو بۆ ڕاگەیاندن. پێش ئەوەی خولەکە دەست پێ بکات، خاتوون گاندی لە هەڵبژاردنەکاندا دۆڕاندی و ڕاوێژکاری ڕاگەیاندنەکەی وەک بەڕێوەبەر ڕەوانەی پەیمانگەی هیندستان بۆ ڕاگەیاندن کرا. ئەمیش لەبەرئەوەی پێشتر نووسیار بوو لە ئیندیان ئێکسپرێس دەیزانی گرینگیی ئاژانسی دەنگوباس لە ڕووی ڕۆژنامەوانییەوە چەندە و لەبەرئەوەی وەک ڕاوێژکاری سەرۆک وەزیران کاری کردبوو، لە ڕووی سیاسیشەوە لە بابەتە پێوەندارەکان دەگەیشت. من تا ساڵی ١٩٨٥ لە ساماچار بهارتیدا کارم کرد و لەو ساڵەوە پیشە ئەکادیمیاییەکەی خۆم لە زانکۆی پاتیالای ناوچەی پونجاب گرتە دەست. لە ساڵی ١٩٩٣شەوە گەڕامەوە پەیمانگەی هیندستان بۆ ڕاگەیاندن وەک بەڕێوەبەری خولەکانی ڕۆژنامەوانیی ئاژانسەکانی دەنگوباس و لە ساڵی ١٩٩٥ەوە پرۆفیسۆرم لە بواری ڕۆژنامەوانیی ئاژانسەکانی دەنگوباس.

سەرباری ئەوەی لە ماوەی کارمدا لە ساماچار بهارتی بواری تێکەڵاویم لەگەڵ زۆر لە پسپۆڕانی ئاژانسەکانی دەنگوباسدا بۆ ڕەخسا، توانیشم لەو ماوەیەدا سەردانی بارەگاکانی زۆر لە ئاژانسەکانی دەنگوباس بکەم لە هەموو کونجێکی ئەم جیهانەدا، وەکو نۆتیمێکس (مەکسیک) و پرێنسا لاتینا (کووبا) تا دەگاتە ڕۆیتەرز (لەندەن) و

ئاژانسی دەنگوباسی ڤێتنام (هانۆی) و بەرناما (مالیزیا) و ئەسۆشیێتد پرێسی ئوستراليا (سیدنی) و زۆری تر. زۆر لە بەڕێوەبەرانی ئاژانسەکانی دەنگوباس بەدەنگی ویستی منەوە بۆ وەرگرتنی زانیاری دەهاتن، بۆ نموونە ئەوانەی ئەسۆشیێتد پرێس و فرانس پرێس و ئانسا. هەروەها ئاهەنگەکانی یۆبیلی زێڕینی PTI هەلی باشیان بۆم ڕەخساند بۆ گەیشتن بەشارەزایانی ئەم بوارە لە سەرتاسەری جیهاندا. جگە لەمەش نزیکەی هەموو زانایانی جیهانم لە بواری ئاژانسەکانی دەنگوباسدا لە چەندین کۆنفرانسدا دیوە، وەک پرۆفیسۆر میشێل پالمەر (زانکۆی پاریس) و ئۆلیڤەر بۆید-بارت (زانکۆی فرەتەکنیکی ویلایەتی کالیفۆرنیا) و تێرهی رانتانین (لەندەن) و ئیلینا ڤارتانۆڤا (زانکۆی مۆسکۆ) و گیرتروود رۆبنسن (زانکۆی مەکگیل) و س جیم کیم (زانکۆی تاوسن).

لە کۆتاییدا دەڵێم سوپاسگوزار دەبم بۆ هەر زیادکردنێک و هەر پێشنیازێکی گۆڕانکاری بۆ چاپەکانی داهاتووی ئەم کتێبە.

ک. م. شریڤاستاڤا

# یەکەم

## پێشکەوتن: دیدی جیهانی

ئاژانسی دەنگوباس، جا هەر ناوێکی لێ بنێین، دەکرێ بەوە بیناسێنین کە ئەو ڕێکخراو یان بازرگانییەیە هەواڵ لە ناو وڵاتێک یان لە سەرتاسەری جیهانەوە کۆ دەکاتەوە و دەنووسێ و بڵاوی دەکاتەوە بەسەر ڕۆژنامە و بڵاوکراوەی وەرزانە و ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و دەزگاکانی حکوومەت و بەکارهێنانی تری هەواڵدا. ئەوان کۆفرۆشی نەبینراوی هەواڵ و بەرهەمە زانیاریئامێزەکان بوون بۆ زۆربەی کڕیارەکانی دەزگاکانی میدیا، ئەوانەی بەگشتی ئەو لۆگۆیانەی لە سووچێکی شاشەی تەلەفزیۆن یاخۆ لە نێو دوو کەوانەدا لە چاپکراوەکاندا دەنووسرێن پشتگوێ دەخەن. تەنیا ڕادیۆیە کاتێ گومانی لە زانیارییەک هەبێ ناوی سەرچاوەکەی دێنێ. جگە لەمەش ئەو دەزگایانەی میدیا کە دەیانەوێ داپۆشینی فرەوان پێشکێشی خوێنەرەکانیان بکەن ناتوانن پشت لە ئاژانسەکانی دەنگوباس بکەن.

هەر لە سەرەتاوە فرەجۆریی سەرچاوەکانی داهات یەکێک بووە لە بنەماکانی بەڕێوەبردنی ئاژانسەکانی دەنگوباس. ئەمڕۆش ئەم فرەجۆرییە بەشێوەیەک فرەوان بووە کە مرۆڤ نەتوانێ پێناسەیەکی گشتیی تەواو بۆ چالاکییەکانی ئاژانسەکانی دەنگوباس دابڕێژێ. ئەگەر بێ و وردی بکەینەوە، ئاژانسەکانی دەنگوباس بازرگانییەکن خزمەتگوزارییەکانیان لە بازاڕێکی چوارچێوەداری میدیادایە. هەروەها لە بازاڕی ڕێکلامدایە. هەندێکیان ڕۆژنامە دەردەکەن و هەندێکی تریان

تاقمی کامێرایان هەیە بۆ بەکرێدان و هی تریش هەیە خولی ڕاهێنانیان لە بوارە جیاجیاکانی میدیادا هەیە. هەر وەک چالاکییەکانیشیان، خاوەنداریی ئاژانسەکانی دەنگوباس جۆراوجۆرن، تایبەت و هاوبەش و گشتی و حکوومیشیان هەیە، هەر جۆرێکیش لەمانە چەندین شێوەی بەڕێوەبردنی هەیە. ئاژانسەکانی دەنگوباس بۆ ئەوەی یەکەم بن لە وەدەستهێنانی هەواڵ لە کێبەرکێدان، بۆ ئەم مەبەستەش خێراترین هۆکار و تێکنۆلۆجیا نوێکانی گەیاندن بەکار دێنن. لە سەدەی نۆزدەیەمدا ئاژانسەکانی دەنگوباس کۆتریان بۆ گەیاندنی هەواڵ بەکار دەهێنا و ئەمڕۆش تەلەفۆنی سەتەلایت و ئینتەرنێت بەکار دێنن.

لە وتارەکەیدا لە یەکەمین کۆبوونەوەی کۆمەڵەی جیهانیی ئاژانسەکانی دەنگوباس لە ٢٤ی ئەیلوولی ٢٠٠٤ لە مۆسکۆ، بەڕێوەبەری گشتیی یونسکۆ کۆیچیرۆ ماتسوورا گوتی: بەشێوەیەکی تایبەت، سەربەخۆیی بۆچوون و گەیشتنی بێ قەید و شەرت بەزانیارییەکان و ستانداری توندوتۆڵی پرۆفیشیناڵ زۆر پێویستن بۆ ئاژانسەکانی دەنگوباس، چونکە ئەوان بابەتی هەواڵ بەژمارەیەکی زۆر لە کەناڵەکانی تری میدیا دەفرۆشن، بەتایبەتی ئەو کەناڵانەی ناتوانن سەرچاوەی هەواڵ لە هەموو ناوچە گەرمەکانی جیهاندا (گەرم بەڕووداو- وەرگێڕ) دابین بکەن یان ئەو ڕاپۆرتە لێکۆڵەوانەیان پێ دەستەبەر ناکرێ کە پێویستیان بەدامەزراندنی ژمارەیەکی زۆری کادر یاخۆ زانیاریی تایبەت دەبێ. ئەگەر ئاژانسەکانی هەواڵ نەبن دەبێ ئێمە خۆمان ئەو جۆرە ڕاپۆرتانە دروست بکەین.

## پێشەنگەکان

چارلز لویس هاڤاس (١٧٨٣-١٨٥٨) بەپێشەنگی ئەم بازرگانییە دادەنرێ، هەر ئەویش ناوی ئاژانسی لەم جۆرە دەزگایانە نا. پێش ئەوەی هاڤاس بازرگانیی ئاژانسی دەنگوباس دابهێنێ، تەنیا سەرچاوەی هەواڵەکانی دەرەوە بۆ ڕۆژنامەکان ڕۆژنامەکانی وڵاتانی تر بوون. هاڤاس خۆی لە ڕۆژنامەکاندا وەک وەرگێڕی هەواڵ لە ڕۆژنامەکانی بیانییەوە کاری دەکرد. لە ساڵی ١٨٣٢دا هاڤاس نووسینگەی وەرگێڕانی ڕۆژنامەکانی بیانی و کتێبفرۆشیی لە پاریس دامەزراند. لە ساڵی ١٨٣٥دا ئەو نووسینگەیە بووە ئاژانسی هاڤاس، کە یەکەمین ئاژانسی جیهانیی

دەنگوباسە. لە ساڵی ١٨٤٠ و بەهۆی کۆترەوە، هەواڵی دەگەیاندە ژوورەکانی هەواڵ لە ڕۆژنامەکانی پاریس، کاتی نیوەڕۆ هەواڵەکانی بەیانیی ڕۆژنامەکانی بەلجیکا دەگەیشتن و سات ٣ی دوای نیوەڕۆ هەواڵەکانی ئەو ڕۆژەی ڕۆژنامەکانی بریتانیا دەگەیشتن. زۆری پێ نەچوو ساموێل مۆرس تێلێگرافی ئیلیکترۆموگناتیسیی داهێنا و لە ساڵی ١٨٤٥دا گەیشتە فرانسە و یەکسەر هاڤاس دەستی بەبەکارهێنانی ماشینەکانی مۆرس کرد. جگە لەمەش، هاڤاس لە ساڵی ١٨٥٢دا ئاژانسێکی ڕێکلامی دروست کرد ئەم کارەش داهاتی بۆ کڕیارەکانی ڕۆژنامەکان دروست کرد و هانیانی دا بۆ ئەوەی خزمەتگوزارییەکانی ئاژانسەکە بکڕن. لە ساڵی ١٨٧٩دا بنەماڵەی هاڤاس قازانجەکانی خۆیان بەحەفت ملیۆن فرانک فرۆشت و ئاژانسی هاڤاس بوو بەکۆمپانیایەکی گشتیی سنووردار. لە ساڵی ١٩٤٠دا بەیاسا ئاژانسی هاڤاس ناچار کرا چالاکییەکانی خۆی لە هەردوو بواری ڕێکلام و کۆکردنەوەی هەواڵ لە یەکتر جیا بکاتەوە. بەشی چالاکییەکانی کۆکردنەوەی هەواڵ ئێستا موڵکی دەوڵەتە و ناوی نراوە نووسینگەی زانیاریی فرانسەیی OFI و لە ساڵی ١٩٤٤ەوە بوو بەئاژانسی فرانس پرێس AFP کە کۆمپانیایەکی گشتییە.

دوو لە کارمەندانی هاڤاس، پاوڵ یۆلیۆس ڕۆیتەر و بێرنارد ڤولف، دواتر بوونە دامەزرێنی دوو ئاژانسی دەنگوباس بەناوی خۆیانەوە لە لەندەن و بەرلین. زۆربەی زۆری ئاژانسەکانی دەنگوباسی ئەورووپا لە سەرەتادا تایبەت بوون و بەناوی دامەزرێنەکانیانەوە ناو دەنران، بۆ نموونە فابرا لە ئیسپانیا و ڕۆیتەرز لە بریتانیا و ستیفانی لە ئیتاڵیا و ڤولف لە ئەڵمانیا. لەگەڵ ئەمەشدا جۆزێف توڤارا کە ئووستریخیشە کۆرێسپۆندێنز (ئاژانسی دەنگوباسی نەمسا)ی خستە گەڕ لە ڤیەننا تەنیا بەناو تایبەت بوو و لە ڕاستیدا بەپشتگیریی ئەلێکزاندەر باخی وەزیری داد و ناوخۆی ئەو وڵاتە بوو. توڤارا کە ڕۆژێ لە ڕۆژان شۆڕشگێڕ بوو، لە ئەیلوولی ١٨٤٩دا بۆ باخی نووسیبوو کە "قازانجی بەکارهێنانی چەکێکی نەرم و بەرفرەوانی وەکو ئاژانسی دەنگوباس بۆ حکوومەت بەجۆرێکە مرۆڤ ناتوانێ بیخەملێنێ".

مەبەستی سەرەکیی ڕێکخراوە تایبەتەکەی ئەوە بوو هەواڵی لە لایەن حکوومەتەوە کۆنترۆڵ کراو بدا بەو ڕۆژنامانەی بەزمانەکانی چیک و سلۆڤینیایی و سربۆکروات و

ئیتاڵیایی دەردەچوون و حکوومەت دەسەڵاتی بەسەریاندا هەبوو، ئامانجیش ئەوە بوو ئەمە وەک هێمایەک بێ بۆ یەکێتی و پاراستنی وڵات و لەخۆگرتنی دەنگە شۆڕشگێڕ و ناسیۆنالیستەکانی شانشینەکە. ئەم ئاژانسە تا ٣١ی کانوونی یەکەمی ١٨٥٩ بەردەوام بوو، کاتێ دوای دۆڕانی ئیتاڵیا کۆنت ئەگینۆر گۆلوکۆڤسکی بووە وەزیری ناوخۆ لە جێی باخ و توڤاراش بەمووچەیەکی ساڵانەی ١٢٠٠ گڵدن قەرەبوو کرایەوە و ئاژانسەکە درایە بیرۆی KK تێلێگراف کۆرێزپۆندێنز.

لە ٢٨ی تشرینی دووەمی ١٨٤٩، ڕۆژنامەی ناسیۆنال تسایتونگ کە ساڵی پێشتر لەلایەن حیزبی لیبراڵەوە لە بەرلین دامەزرا بوو، ڕای گەیاند کە لەوەودوا بەڵاڤۆکی هەواڵ لە پاریس و لەندەن و ئەمستەردام و فرانکفۆرت دەردەکات. هەروەها لە ڕۆژانی دواتریشدا بەڵاڤۆک لە هامبۆرگ و شتێتنیشەوە دەردەچن. ڕۆژی ئاشکراکردنی ئەم ڕاگەیاندنە بەڕۆژی لەدایکبوونی نووسینگەی ڤولفیشز تێلێگرافیشیز WTB کە دواتر دەبێتە یەکەمین و تا ساڵی ١٩٣٣، گرینگترین ئاژانسی دەنگوباسی ئەڵمانیا. بەناوی بێرنارد ڤولف، کە بەڕێوەبەری ناسیۆنال تسایتونگ و هەڵسووڕێنی هەموو دەزگاکە بوو، ناو نرا.

ئەوەندەی پێ نەچوو بیرۆکەی فرۆشتنی ئەو بەڵاڤۆکی هەواڵانە بەڕۆژنامەی تر لای ڤولف دروست دەبێ، ئەمەش وا دەکا کردنەوەی نووسینگەیەکی تایبەت بەهەواڵ کارێکی پێویست بێ. نووسینگەی ڤولفیشز تێلێگرافیشیز لەسەر خۆ و هێدی هێدی گەشەی دەکرد. لە ساڵی ١٨٦٥دا ئەم بازرگانییە گوێزرایەوە بۆ کۆمپانیایەکی هاوبەشی کەلوپەل بەناوی کۆنتینێنتاڵ تێلێگراف ئەگێنتووە کە سەرمایەی نوێی وەدەست دەهێنا. جگە لەمەش حکوومەت دەستی کرد بەپارە بەخشین بە WTB. ئەمەش جۆرێک لە سەربەخۆیی دارایی و پایەیەکی نیمچە فەرمیی بە WTB بەخشی. ئەم پێگە نوێیەی WTB ئەو کاتە بەئاشکرا دەرکەوت کە ئاژانسەکە لە ١٨٦٩دا چووە ناو ئەو بەشەی باڵەخانەی ئۆفیسی پۆست لە بەرلین کە وێستگەی تێلێگرافی تێدا بوو، بێگومان ئەمەش قازانجێکی گەورە بوو لە بواری کارەکەیدا.

بەڵاڤۆکەکان دەبوایە سەرەتا دووبارە بڵاو بکرێنەوە بەسەر کڕیارەکانی ناو شاردا، ئەمەش لە ڕێی پۆستەچی یان لوولەی هەوای پەستێنراوەوە ئەنجام دەدرا. WTB تا

ساڵی ١٨٧٧ لەناو بارەگای فەرمانگەی پۆستەی رایشدا مایەوە. کارەکەشی بریتی بوو لە رێکخستنی کاری کۆکردنەوەی هەواڵ بەهاوئاهەنگی لەگەڵ دەزگاگەلی بچووکتری هەواڵ لە بەشەکانی تری وڵاتدا. ئەم هاوئاهەنگییە تا ساڵی ١٨٧٧ بەهۆی زیادبوونی نرخی تێلێگرافەوە تووشی ئاستەنگ دەهات. لە ساڵی ١٨٩٣دا WTB یەکەمین لقی خۆی لە کۆلن کردەوە.

پاوڵ یۆلیۆس رۆیتەری دامەزرێنەری رۆیتەرز، ئەو ئاژانسە جیهانییەی هەواڵ و زانیاری، لە ٢١ی تەمموزی ١٨١٦دا لە کاسلی ئەڵمانیا بەناوی ئیسرائیل بیر یۆزافات لەدایک بوو. لە ٢٩ی تشرینی یەکەمی ١٨٤٥دا بەناوی یۆزێف یۆزافاتەوە هاتە ئینگلتەرە و دوای چەند رۆژێک، لە ١٦ی تشرینی دووەم، لە کلێسایەکی لۆتەریی ئەڵمانیایی لە لەندەن چووە سەر رێبازی لۆتەری و ناوی خۆشی گۆری و بوو بە پاوڵ یۆلیۆس رۆیتەر. دوای هەفتەیەک لەمە، لە ٢٣ی تشرینی دووەمدا، لەگەڵ ئایدا ماریا ئێلیزابێت کلێمێنتاین ماگنۆس، کە کچی خاوەن بانکێک بوو، لە هەمان کلێسادا خێزانیان پێک هێنا. لە ساڵی ١٨٤٧دا بووە هاوبەش لە خاوەنداریی کتێبفرۆشی (رۆیتەر و شتارگارت) لە بەرلین. لە ساڵی ١٨٤٨ بەهۆی نووسینە رادیکاڵەکانیەوە ناچار بوو ئەڵمانیا بەجێ بهێڵێ و بەرەو پاریس هەڵات و لەوێ بووە وەرگێڕ لە ئاژانسی هاڤاس. دوای ساڵێک لەمە، ئاژانسی هاڤاسی جێ هێشت بەنیازی ئەوەی بەڵاڤۆکێکی هەواڵی تایبەت بەخۆی دامەزرێنێ. ئەم هەوڵەی شکستی هێنا و خۆشی چووە ئاخن و لەوێ لە ١ی تشرینی یەکەمی ١٨٤٩دا یەکەمین هێڵی بازرگانیی تێلێگراف کرایەوە بەناوی هێڵی حکوومەتیی برووسیایی لە بەرلینەوە. ئەمیش دەستی بەکار کرد و سەرەتا هەواڵی بۆ کڕیارەکانی لە پایەتەختی برووسیادا دەنارد و، دوای ئەمە بەماوەیەکی کورت کڕیاری لە ئانتڤێرپ و برۆکسل پەیدا کرد. کاتێکیش فرانسەییەکان، لەو بەهارەدا هێڵێکیان لە نێوان برۆکسل و پاریسدا کردەوە، ئەو ئەم کەلێنەی پڕ کردەوە، سەرەتا بەکۆتر و دواتر بەئەسپ. ساڵی ١٨٥٠ رۆیتەر لە ئاخندا ئاژانسێکی دەنگوباسی بەڕێوە دەبرد و لە ٢٤ی نیسانی ئەو ساڵەدا بۆ بەدەستهێنانی کۆتری پێویست بۆ گەیاندنی هەواڵ لە نێوان برۆکسل و ئاخندا، رێککەوتننامەیەکی لەگەڵ هاینریش گێلەردا مۆر کرد. ئاژانسەکە زیاتر لە

ساڵێک بەم شێوەیە کاری کرد تا ئەو کاتەی کەلێنی تێلێگرافی نێوانیان نەما. لەگەڵ فرەوانبوونی تۆڕی تێلێگرافیشدا، رۆیتەر سوودی لەمە دی و لە ١٨٥١دا بەمەبەستی سوود وەرگرتن لە هێڵی ژێرئاوی نێوان کالا و دۆڤ خۆی لە لەندەن دامەزراند، رێک لە ١٤ی حوزەیرانی ١٩٥١دا گەیشتە لەندەن و نزیکەی چوار مانگ دوای ئەوە، لە ١٠ی تشرینی یەکەمدا، رۆیتەر نووسینگەیەکی دوو ژووریی بۆ خۆی بنیات نا لە ١ی رۆیال ئێکسچەینج بیلدینگز لە لەندەن. لە ١٣ی تشرینی دووەمیشدا ئەو هێڵی تێلێگرافی ژێرئاوەش کەوتە کار.

کۆمەڵەی رۆژنامەوانی، لەلایەن کۆمەڵێ خاوەن رۆژنامەی رۆژانەی ناوخۆییی بریتانیاوە بەئامانجی گەیاندنی خێرا و وردی هەواڵ و زانیاری بەئەندامەکانی، لە ١٨٦٨دا دامەزرا. دامەزرێنەرەکانی لە هەوڵی ئەوەدا بوون جێگرەوەیەکی وردتر و برواپێکراوتر لە کۆمپانیاکانی تێلێگراف بدۆزنەوە. ئەوان دەیانویست لە رێی هاوکاریی نێوانیانەوە دەزگایەکی کۆکردنەوەی هەواڵ و دروستکردنی راپۆرت لە لەندەن بنیات بنێن و هەواڵنێرانیان لە هەموو شارە سەرەکییەکانی تردا ئەم کارەیان بۆ دەستەبەر بکەن. بۆ دامەزراندنی ئەم کۆمپانیایەش کۆمیتەیەک دروست کرا و گوترا: "کۆمەڵەی رۆژنامەوانی لەسەر بنەمای هاوئاهەنگی دروست کرا و هەرگیز نابێ بۆ بەرژەوەندیی تاک کار بکات یاخۆ ببێتە تاقانە لە بواری خۆیدا". کۆمەڵە کۆمپانیایەکی کەرتی تایبەتن و خاوەنەکانی کە ٢٧ پشکدارن زۆربەیان بڵاوکەرەوەی رۆژنامەی نیشتمانی یان ناوچەیین.

مێژووی ئاژانسەکانی دەنگوباس لە ئیتاڵیا لە ٢٦ی کانوونی دووەمی ١٨٥٣وە دەست پێ دەکا، ئەویش لەگەڵ دامەزراندنی تێلێگرافیک نۆتیزیاریۆ ستیفانی، هەفتەیەک دوای دەست بەکار بوونی هێڵی تێلێگرافی تورین-کامبێری کە بووە هۆی دروستبوونی پێوەندی لەگەڵ پاریسدا. خاوەن و بەڕێوەبەری ئەم ئاژانسە گەنجێکی تەمەن ٣٤ ساڵ بوو کە لە ڤینیسیا دوورخرابووەوە و ناوی گوگلیێلمۆ ستیفانی بوو، ئەم پیاوە لە ساڵانی ١٨٤٤-١٨٤٥دا کاری رۆژنامەوانیی لە پادۆڤا کردبوو و دوو رۆژنامەی بەناوی یوگانیۆ و پێدرۆچی کۆفی دامەزراندبوو. ستیفانی دوای رووخانی کۆماری ڤینیسیا لە ١٨٤٩دا بەرەو تورین هەڵات و لەوێ دەستی بەکاری

ڕۆژنامـەوانـی و بڵاوکردنەوە کـرد، هـەروەها بووە بەڕێوەبەری پـێـمـۆنتـێس گازێتێ کە ڕۆژنامـەی فـەرمـیـی ئەو هـەرێـمـە بوو. ئەم ڕۆژنامـەیە زۆری پێ نەچوو بـووە ئاژانسـی تایبـەتی سـتـیـفانـی بـۆ تێلێگراف، ئەویش بەهاوکـاری و پێـشنیـازی کـۆنت کـامـیـللۆ بێنسـۆ دی کـاڤـۆر (١٨١٠-١٨٦٨). دوای ئەمـە سـتـیـفـانـی هـاوپەیمانیـیـەکی لەگەڵ هاڤـاس دروست کـرد بۆ هـەواڵەکـانی نێـودەوڵەتی و هـەواڵیـان لـە نێـو سنوورەکـانی ناوچەی ئیـتـاڵیـا دادەپۆشـی و بەشـدار و هەواڵنێـریان لە هـەرێـمـە ئیـتـاڵیـاییـەکـانی تریشـدا هـەبوو وەک: فلۆرانسـە و مـیـلان و پارمـا و بۆلۆگنا و ڕۆمـا. ئەم ئاژانسـە موڵکی گوگلیێلمۆ سـتـیفانی بوو و دوای خـۆی بووە موڵکی مـیراتگرانی و هـاوکـاریی ڕاسـتـەوخـۆ و ناڕاسـتـەوخـۆی حکوومـەتی هـەرێـمی ئیـتـاڵیـای بـەدەست هێنابوو لەپێناو باڵادەستی و ڕێکخستنی "نافەرمی"ی ڕۆژنامەوانیی هـەرێمەکەدا.

ئاژانسی دەنگوباس بۆ ئەوەی لە فـرانسـەوە بگاتە ئیـسـپـانیـا ٣٥ سـاڵی پێ چوو. یەکەمـین جـاریش ئەم شـێـوازە لەلایەن ڕۆژنامـەوان و پیشـەسـاز نایل مـاریا فـابرا یێ دیس بەکـار هـات. ئەو لە سـاڵی ١٨٦٥دا سـەنتەری هـەواڵنێـرانی لە مـەدرید دامـەزراند کە دەزگایەکی تایبەت بەهەواڵ بوو. هـەر خـۆی هـەواڵی کۆ دەکردەوە و دەینووسییەوە و دواتر دەیگەیاندە کـڕیارەکان. لە سـاڵی ١٨٦٦دا ڕۆژنامـەی بەرشـەلۆنا داوای لێ کـرد شـەڕی فـەرەنسایـی و بڕووسـیـاییـیـەکانی بۆ داپۆشـێ. فـابرا بەدەنگی ئەم داواکارییەوە چوو و لە ڤیەننا توانیی پێوەندی بەهەواڵنێرانی ترەوە بکا کە لە ئاژانسـە گەورەکانی دەنگوباسدا کاریان دەکرد. دوای داپۆشـینی شـەڕەکە چەند ڕۆژێک لە پاریس مایەوە، لەوێ چاوی بەئۆگـۆست هـاڤـاس کـەوت کـە یەکـێـکە کـوڕەکـانی دامـەزرێنـی ئاژانسـی هـاڤـاس. کـە گـەڕایەوە بۆ ئیـسـپـانیـا، لە سـاڵی ١٨٦٧دا و بەجـێـبـەجـێکـردنی هـەنگاوەکانی هـاڤاس، سـەنتـەری هـەواڵنێـرانی کـرد بەئاژانسـی فـابرا. فـابراش وەک هـاوسـەردەمـانـی خـۆی لە سـاڵی ١٨٧٤دا کـۆتری بەکـار هێنا بـۆ گـەیاندنی هـەواڵ و خـانەی کۆتری لە ڤالێنسـیـا و بەرشـەلۆنا و پالما دی مـالۆرکـا دامـەزراند بۆ ئەوەی زانیـاری لەبارەی کـەشـتـیـیـەکـانەوە بەدەست بهـێنێ پێش ئەوەی بگەنە گـەورە بەندەرەکانی ئیسپانیا.

ئاژانسی تێلێگرافی سویسرا لە ٢٥ی ئەیلوولی ١٨٩٤دا لە بێرن دامەزرا. پێش ئەوە،

هاڤاس و ڤولف بازاری سویسرایان له نێوان خۆیاندا دابەش کردبوو. نووسیار و ڕۆژنامەوانانی سویسرا بەو حاڵە دڵخۆش نەبوون، بۆیە له ١٨٩٤دا ئاژانسی تێلێگرافی سویسرا ATSیان دامەزراند تاکو ببێتە سەرچاوەیەکی سەربەخۆی زانیاری. ATS له ١ی کانوونی دووەمی ١٨٩٥دا بەهەشت ڕۆژنامەوانەوە له ئەپارتمانێکی سادەدا له شپیتالگاسەی بێرن دەستی بەکار کرد. جگە له بەڕێوەبەر سێ کەسی تر له بێرن و دووان له جنێڤ و دووی تر له زیوریخ و بازل کاریان بۆی دەکرد و لەگەڵ کۆتاییی ساڵدا نزیکەی پەنجا هەواڵنێر کاریان بۆ ئاژانسەکە دەکرد.

زۆربەی پشکدارانی ئەو دوو سەد پشکە تۆمارکراوە، کە هەر یەکێکیان بایی پێنج سەد فرانک بوو، له دامەزرێنانی ڕۆژنامەکە بوون. هەر له سەرەتاوە دامەزرێنان بڕیاریان دا ئەو بڕە پارەیەی له داهات زیاد دەبێ، بۆ بەهێزکردن و پێشخستنی خزمەتگوزارییەکان بەکار بهێنن. ژمارەی بەشداربووان کە له ساڵی ١٨٩٥دا ٥٤ بوو له ساڵی ١٩٠٠دا بوو بە ٧١ بەشداربوو کە نزیکەی هەموو ڕۆژنامە ڕۆژانەکانی سویسرا بوون.

ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسی بولگاریا له ١٨٩٨دا دامەزرا، دامەزراندنەکەی بەبڕیاری میر فێردینانێدی یەکەم بوو. ئێستاش ئەم ئاژانسە ڕێکخراوێکی سەربەخۆی دەنگوباسی نیشتمانییە و پەرلەمان بەڕێوەبەرە گشتییەکەی هەڵدەبژێرێ. ئەم بارە تایبەتەی ئاژانسەکە سەربەخۆییی گوتاری سیاسی مسۆگەر دەکا و له هەر دەستێوەردانێکی ئابووری و سیاسیی دەپارێزێ.

لەوبەری ئۆقیانووسی ئەتلانتیکیش، چیرۆکی پێشکەوتنی شێوازی کارکردنی ئاژانسەکانی دەنگوباس جیاواز بوو. له ساڵی ١٨٤٨دا، دە کەس کە نوێنەرایەتیی شەش ڕۆژنامەی شاری نیویۆرکیان دەکرد لەسەر مێزێک له نیویۆرک سەن کۆ بوونەوە بۆ تاوتوێکردنی بابەتی زۆریی خەرجیی کۆکردنەوەی هەواڵ بەبەکارهێنانی هێڵی تێلێگراف. هێڵی تێلێگراف کە داهێنانێکی نوێ بوو گواستنەوەی هەواڵی له ڕێی وایەرەوە فەراهەم کردبوو، بەڵام تێچووی ئەم خزمەتگوزارییە زۆر بوو، لەوە زیاتر کە هیچ ڕۆژنامەیەک بەپشت بەستن بە داهاتەکانی خۆی بتوانێ دەرەقەتی بێ. دیڤید هەیڵ له ڕۆژنامەی جۆرناڵ ئەڤ کوممێرس پێی وا بوو کە تەنیا کارێکی

هاوبەش لە نێوان ڕۆژنامەکانی نیویۆرکدا دەتوانێ سوود وەرگرتن لە تێلێگراف دەستەبەر بکا و بەشێوەیەکی کاریگەر ڕێ لە دەستوەردانی کۆمپانیاکانی تێلێگراف لە پرۆسەی کۆکردنەوەی هەواڵ بگرێ. بەمەبەستی وەدەستهێنانی هەواڵەکانی کەناری ڕۆژئاوای ئەمەریکا و وڵاتانی تریش، هەیل پێی وا بوو کە پێویستە ڕۆژنامەکان بەیەکەوە کار بکەن ئەگەر پێویست بوو داپۆشینی زیاتری هەواڵ پێشکێش بەجەماوەر بکرێ. هەرچەندە بەنەبەدڵیشەوە بوو، بەڵام سەرەتا هەر شەش ڕۆژنامەکە بەوە قایل بوون کۆمەڵەیەکی هاوکاری پێک بهێنن، بەم شێوەیە ئەسۆشییێتد پرێس AP لەدایک بوو و زۆر بەخێرایی ڕەگی خۆی داکوتا. سەرەتا بەیەک هەواڵنێر لە هالیفاکس دەستی پێ کرد و ئەوەندەی پێ نەچوو هەواڵنێری لە ویلایەتە ئەمەریکاییەکانی وەک بۆستن و فیلادلفیا و واشنتۆنی پایەتەخت پەیدا کرد و دوای ئەوە پەلی بەرەو ڕۆژئاوای ناوەڕاستیش هاویشت. AP بەبەکارهێنانی تێلێگراف و زمانی خاڵ و داش کە بەکۆدی مۆرس ناسراوە، گەشەی کرد و لە ١٨٧٥دا بووە یەکەمین دەزگای هەواڵ کە بتوانێ هێڵێکی تێلێگراف بۆ خۆی بەکرێ بگرێ.

ئەندامانی AP لە سەرەتاوە بڕیاری ئەوەیان دا کێ بۆی هەیە ببێتە هاوبەشکیان و کێ بۆی نییە. EW سکریپس، کە بڵاوکەرەوەی ڕۆژنامەکانی سکریپس-مەکری (دواتر سکریپس-هاوەرد) بوو، دەستی بەبڵاوکردنەوەی کۆمەڵێ ڕۆژنامە کردبوو و دەیویست دەستی کراوە بێ بۆ ئەوەی ئەم کارە لە هەر شوێنێک، کە بیەوێ، ئەنجام بدا. هەروەها دەیویست کەسانی تریش لەم بارەیەوە ئازاد بن، لەبەرئەوەی پێی وا بوو و بگرە پرینسیپەکەشی ئەوە بوو و دواتر بووە ناونیشان بۆ ڕۆژنامەکانی سکریپس- هاوەرد: "ڕووناکی بەخەڵک ببەخشە و ئەوان خۆیان ڕێی خۆیان دەدۆزنەوە". ئەو وای بۆ دەچوو هەبوونی تەنیا یەک کۆمەڵەی ڕۆژنامەوانیی بەهێز وا دەکا ئەو تەنیا کۆمەڵەیە وەک مۆنۆپۆلێک دەست بەسەر کۆکردنەوە و دابەشکردنی هەواڵدا بگرێ، بەمەش دەتوانێ بڕیاری ژیان و مردنی هەر بڵاوکەرەوەیەک بدا ئەگەر بۆچوونە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی ئەو بڵاوکەرەوەیە لە هی کۆمەڵەکە جیا بوون. بەپێی مەرجە توندەکانی ئەوسای ئەندامی لە AP ئەم جۆرە بڵاوکەرەوانە بۆیان

هەبوو بڵاوکەرەوەی تر لە خزمەتگوزارییەکانی AP بێبەش بکەن. پێگیریی ئەم لە دژایەتیکردنی ئەم شتانە وای لێ کرد کۆمەڵەی سکریپس-مەکری بۆ دەنگوباس لە ڕۆئاوای ناوەڕاست و کۆمەڵەی دەنگوباسی سکریپس لە کەناری پاسیفیک لە سەرەتای سەدەی بیستدا دامەزرێنێ. لە ساڵی ١٩٠٦دا توانیی پەبلیشەرز پرێس، کە دەزگایەکی بچووکی دەنگوباس بوو لە ڕۆژهەڵاتدا، بکڕێ. ساڵی دواتر هەر سێ دەزگاکەی تێکەڵ بەیەک کرد و یونایتد پرێس ئەسۆشیەیشنزی دامەزراند. ئەم بەپێچەوانەی AP یەوە پێی وا بوو کە پێویستە هەواڵ بدرێ بەهەموو ئەوانەی دەیانەوێ و دەتوانن بیکڕن بەبێ ئەوەی گوێ بەبابەتی کێبەرکێ و ململانێی نێوان ڕۆژنامەکان بدرێ. ئەو بڕوای وا بوو کە پێویستە زانیاری ئازادانە و بەلێشاو بگەیەنرێن. سکریپس دوای ماوەیەک لەمە گوتی: "من بڕوام بەمۆنۆپۆل نییە. بگرە بڕوام وایە لە مەودای دووردا، مۆنۆپۆلەکان لە قوربانییانی دەستیان زیاتر زەرەر دەکەن. من بڕوام وایە کە لە بەرژەوەندیی ڕۆژنامەوانیی ئەم وڵاتەدا نییە تەنیا یەک دەزگای مەزنی دەنگوباس هەبێ، وەک ئەوەی دامەزرێنانی AP بەبڕوای تەواوەوە ویستیان دروستی بکەن".

## تێکەڵبوونی حکوومەت

هۆکاری بنەڕەتیی داهێنان و پێشکەوتنی ئاژانسگەلی دەنگوباس ویستی ڕۆژنامەکان بوو بۆ پێشکێشکردنی فرەوانترین داپۆشینی هەواڵ. هەر ڕۆژنامەیەک توانای نەبوو تێچووی ئەم پرۆسەی کۆکردنەوەی هەواڵە بەتەنیا بگرێتە ئەستۆ. بۆیە دەیانتوانی لە دووان یەکێ هەڵبژێرن، یان ئەوەیە بەهاوبەشیی ڕۆژنامەی تر خەرجیی ئەو کۆکردنەوەی هەواڵە لە ئەستۆ بگرن، یان پارە بەدەزگایەکی تر بدەن کە هەواڵ کۆ دەکاتەوە و دەیانفرۆشێ. هەڵبژاردەی سێیەم ئەو کاتە دەرکەوت کە حکوومەتەکان، وەک خانەکانی بازرگانی، گرینگیی هەواڵیان لا ڕوون بووەوە. حکوومەتەکان زوو تێکەڵی ئاژانسی کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی هەواڵ بوون. بۆ ئەم تێکەڵبوونەش چەندین شێواز و هۆکاری ئاوێتەیان گرتە بەر هەر لە خاوەندارێی ڕاستەوخۆ و کۆنترۆڵکردن و بەخشینی مۆڵەتی بەکارهێنانی دامودەزگاکانی حکوومەت بۆ ئەم مەبەستە تا دەگاتە خۆ هەڵقورتاندن لە ناوەڕۆکی هەواڵ و

پارەدارکــردنی ئاشکرا و شــاراوەی ئاژانسگەلی دەنگوباس. یەکــەمین ئاژانسی دەنگوباسی حکوومەتی کەی کەی تێلێگراف کۆرێسپۆندێنس بیرۆ لە ساڵی ١٨٦٠دا هاتە کایەوە، کــاتێ دەســتی بەوەشــاندنی بابەت کــرد بۆ ئەو ڕۆژنــامــانەی لەلایەن حکوومەتی نەمسا – هەنگاریاوە بڵاو دەکرانەوە.

هەرچەندە ڕۆڵی حکوومەت لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر جیاواز بوو، بەڵام زوو ئەو ئاژانســانەی لەلایەن حکوومــەتەوە بەڕێوە دەبران بەشــێوەیەکی بەرفــرەوان ناسـران. زۆریش لەو ئاژانسانەی لای خــەڵک بەکەرتی تایبەت ناسـرابوون پێوەندیی توندوتۆڵ و نزیکیــان لەگەڵ حکوومــەتی وڵاتەکانیــاندا هەبوو. ڕۆیتــەرز نموونەیەکی ئەمــەیە، ئەم ئاژانســە کــە بارەگــای ســەرەکیی لە لەندەنە لە زۆربەی زۆری ســەدەی بیســتــەمــدا پشــتگیــرییــەکی باشی لەلایەن حکوومــەتەوە لێ دەکــرا. بۆ نمــوونە لە هینـدســتــاندا ڕۆیتەرز وەک ئاژانسێکی سەر بەئیمپراتۆریا کاری دەکرد، حکوومەت هــاوکاری بوو بۆ لەناوبردنی هەر ململانێیەک. ئەسۆشیێتد پرێسی هیندستان کە لەلایەن کەی سی ڕۆی لە ســاڵی ١٩١٠دا دامــەزرا کــەوتە ژێر کۆنتــرۆڵی ڕۆیتــەرز و لە ســاڵی ١٩١٩دا بەتەواوی بووە موڵکی ڕۆیتەرز. ئاژانسی ئازادی دەنگوباســی سوامینات ساداناند کە کــاری بــۆ ئەوە دەکــرد هــەواڵەکــانی دەرەوە لە ئاژانســی ترەوە وەرگـــرێ ڕووبەڕووی هێزی ئیمپراتۆریای بریتانیا بووەوە و بەناچاری داخرا.

لە کاتــی شــەڕی جیــهانیی یەکــەمدا، ڕۆیتــەرز بــەوە قــایل بوو هەواڵ و ڕاگــەیاندنە فــەرمــیــیــەکانی وڵاتانی هاوپەیمان بەنێو وڵاتانــی بێلایــەن و بریتــانیــا و هــێزەکــانی هاوپەیماندا دابەش بکا، حکوومەتیش لە بەرامبەردا پارەی گواســتنەوەی هەواڵەکانی بەتێلێگراف دەدا. بەڕێوەبەری گشــتیی ئاژانســەکەش زۆر جــار لــە پاڵ ئەم پۆســتــەدا پۆســتی لــە حکوومــەتدا هەبووە. لە ١٩٣٠دا ئەســۆشــیــێــتــد پرێس بێ بەرامــبــەر خــۆی خـــســـتـــە بەر دەســـتی حــکوومـــەت لە ڕووی پڕۆپاگــانداوە و لە کـــاتی داپۆشـــیـــنی "سەرکێشییەکانی دەرەوەی یاسای نیشتمــانی"ی ئەمەریکادا، ئاژانســەکە "بەردەوام هەمــوو هەڵوێســتــەکانی بەو پێوانەیە دەنرخــاند کــە لەلایەن کــارمــەندانی حــکوومــەتی ئێــمــەوە پێیــان ڕادەگــەیەنرا". هــەر بەپێــشــنیــازی وەزارەتی دەرەوە، لە کــاتی شــەڕی یەکەمی جیهانیدا، ئەسۆشیێتد پرێس بۆ یەکەمین جار چووە نێو بازاڕی ئەمەریکای

باشـوورەوە، هەرچەندە تا دوای شـەڕی دووەمی جیـهـانیش هەر ئاژانسی یونایتـد پرێس بەهێزترین ئاژانس بوو لەوێ. لە بەرەبەیانی شـەڕی دووەمی جیهاندا رۆیتـەرز بەخـشـینێکی پارەدارکـردنی پێ گـەیشت بۆ ئەوەی توانای گـەیاندنی خـۆی بەهۆی بێتەلەوە بۆ ئاسـتێکی جیـهانی فرەوان بکا. لە کاتی شـەڕیشدا رۆیتـەرز پارەی لە حکوومـەت وەرگـرت بۆ پاراسـتنی نووسـینگەکـانی ئاژانسـی هاڤـاس لە باشـووری ئەمـەریکا. تەنیـا سـەرچاوەی دارایی ئاژانسی فـرانسـەی ئـازادیش، کـە بارەگـای سـەرەکیی لە لەندەن بوو و دوایی بووە یەکێ لە دامـەزرێنە سـەرەکییـەکانی ئاژانسی فرانس پرێس، لە سالانی ١٩٤٠ تا ١٩٤٣ وەزارەتی ڕاگەیاندنی بریتانیا بوو.

هەر وەک پێشـتـر وترا، ئاژانسی سـتیفـانیی ئیتـالیاش هـەرچەندە سـەر بەکەرتی تایبـەت بوو بەلام لەلایـەن کـۆنت کـامـیلۆ بێنسـۆ دی کـاڤـۆر، ئـەو کـەسـایەتیـیـەی شـانشینی ئیتالیای داهێنا و نەخشـەی پێکهاتە دەستوورییەکەی ولاتێکی یەکگرتووی داڕشت و یەکـەمین سـەرۆک وەزیرانی بوو، پشـتـگیـریی لێ دەکـرا. پێـوەندیی نێـوان ستیفانی و حکوومەت لە سالی ١٨٨٨دا بەتەواوی ئاشکرا بوو، کاتێ ئاژانسـەکە (کە ئەو کـات خـاوەنی نیـوەی ئاژانسـی هاڤـاس بوو) کـەوتە چەقی گـەمـەی دیپلۆمـاتی ئیـتالیـاوە لە ئۆپەراسیـۆنی پۆتێنزیامێنتۆی دروسـتکردنی هاوپەیمانیی سێ قۆلیـدا. سـەرۆک وەزیران، فـرانسـیسـکۆ کریسپی، دەسـتی بەئۆپەراسیـۆنێکی ئالۆز کـرد بۆ جیاکردنەوەی لە فەرەنسییەکە و دروستکردنی فیدراسیـۆنێک لەگەل ئاژانسەکانی پرووسـیا و نەمـسـا - هەنگاریادا. بۆ مـاوەی چەند مـانگێکیش بالیـۆزخـانەکـان لە لەندەن و بەرلین و ڤیەننا لەسـەر ئەم بابـەتە کاریان لەگەل وەزارەتەکانی ئەو ولاتانەدا دەکرد. کریسپی نووسیویەتی: "ستیفانی بەتەواوی لە دەستی ئێمەدایە و لە هەردوو ڕووی مـادی و مـەعنەوییـەوە لە لایەن حکوومـەتەوە پشـتـگیـری دەکرێ". سـالێک دوای ئەوە، ڕێککەوتنەکە گەلالە بوو: ستیفانی لە هاڤاس جیا کرایەوە، بەلام تەنیا لە ڕووی فەرمییەوە چونکە پێوەندیی نێوانیان لە ڕێی رۆیتەرزەوە هەر بەردەوام بوو. لە ماوەی نێوان ١٩٠٠ و ١٩٢٠دا ستیفانی کۆمپانیایەکی هاوبەش بوو، ئەویش بەوەی تیۆدۆرۆ مـایەری بەناوبانگ (نووسیاری پیچۆللۆ) خـاوەنی نیوەی بوو و سـەرمایەدار گۆستێپی ڤـۆلپی دی مـسـتـووراتا خـاوەنی نیـوەکـەی تری بوو. دوای ئەمـە و لە سـەردەمی

فاشستەکاندا، ستیفانی بووە بالآترین مەکینەی پرۆپاگاندای ڕێژیمەکە. خاوەنداری و سەرۆکایەتیی ستیفانی کەوتنە دەستی مانلیۆ مۆرگاگنی کە پێشتر بەڕێوەبەری کارگێڕیی پۆپۆلۆ دی ئیتالیا بوو، ئەم توانیی برەو بەئاژانسەکە بدا و بیگەیەنێتە ئاستی نێودەولەتی. بەلام بەهۆی پابەندبوونی بەپرنسیپەکانیەوە، مۆرگاگنی لە ئێوارەی ٢٥ی تەمووزی ١٩٤٣دا خۆی کوشت. لە ٨ی ئەیلوولی ئەو ساڵەشدا ستیفانی گوێزرایەوە باکور و لە کۆتادا بووە مولکی دەولەت بەتەواوی و بووە زمانحالی فاشستەکان و دوایین بەڕێوەبەریشی ئێرنستۆ داکوانۆ بوو کە لە ٢٨ی نیسانی ١٩٤٥دا لەگەل ژمارەیەک لە هاوڕێکانی لە سەرکردایەتیی حیزبی فاشیستدا بەگوللەبارانکردن حوکمی کوشتنیان بەسەردا جێبەجێ کرا.

ئاژانسی سانت پیتەرسبێرگ تێلێگراف SPTA یەکەمین ئاژانسی فەرمیی دەنگوباسی ڕووسیایە و باوکی ئیتار-تاسە و لە ١ی ئەیلوولی ١٩٠٤دا دەستی بەکار کرد. سێ وەزارەتی خکوومەتی ڕووسیا، وەزارەتەکانی دارایی و ناوخۆ و دەرەوە، پێشنیازی دامەزراندنی یەکەمین ئاژانسی فەرمیی دەنگوباسی ڕووسیایان کرد. کۆبوونەوەیەک لە ٤ی تەمووزی ١٩٠٤ لە نێوان نوێنەرانی ئەو سێ وەزارەتەدا بەسترا و بووە هۆی بەهێزکردنی بیرۆکەی دامەزراندنی ئاژانسێکی حکوومەتیی تێلێگراف و بڕیاری لەسەر ئەو بەلگەنامە سەرەتاییانە دا کە بۆ داهێنان و کارکردنی ئاژانسی SPTA پێشکێش کرابوون. پرۆژەی دامەزراندنی SPTA لەلایەن دوایین سیزاری ڕووسیاوە، نیکۆلاسی دووەم، پەسەند کرا. کاری ئاژانسەکەش بریتی بوو لە "بلاوکردنەوەی هەوالەکانی سیاسی و دارایی و ئابووری و بازرگانی و زانیارییەکانی تر کە جێی بایەخی بەرژەوەندیی گشتین لە سەرانسەری ئیمپراتۆریاکە و لە جیهانی دەرەوەدا. ئاژانسەکە لەلایەن دەستەیەکی سێ کەسییەوە بەڕێوە دەچوو، ئەو سێ بەڕێوەبەرە هەر یەکێکیان نوێنەرایەتیی یەکێ لەو سێ وەزارەتەی دەکرد: دارایی و ناوخۆ و دەرەوە. لە ٣١ی کانوونی یەکەمی ١٩٠٩دا، لەگەل دەستنیشانکردنی سەرۆک وەزیران پیتەر ستۆلیپین، ئاژانسەکە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ درایە دەستی ئەنجوومەنی وەزیرانەوە. لە ١٩ی ئابی ١٩١٤، ڕۆژێ دوای ئەوەی نیکۆلاسی دووەم بڕیاری دا ناوی سانت پیتەرسبێرگ بگۆڕێ و بکرێ بە

پێتـرۆگراد، SPTA یش ناوی خۆی گـۆڕی و بوو بە ئاژانسی تێلێگرافی پیتـرۆگراد PTA. لە مـاوەی شـۆڕشی بۆلشـەڤیکدا، لە ٢٥ی تـشرینی یەکەمـەوە تا ٧ی تشرینی دووەمی ١٩١٧، کۆمـەڵێ لە شۆڕشگێڕان بەسەرکردایەتیی لیۆنید ستارک باڵەخانەی PTA یان لە شـەقـامی پۆختـامـپت داگیـر کـردبوو. بۆیە PTA یەکسـەر یەکـەمین راپۆرتگەلێک کـە لە لایـەن سـتـارکـەوە لە بارەی شـۆڕشی بۆلشـەڤـیک دەنووسـران بەهـەموو جیهان دەگەیاند. لە ١٨ی تشرینی دووەمی ١٩١٧دا حکوومەتی بۆلشـەڤیک (سۆڤنارکۆم) بڕیاری دا PTA ببێتە ئاژانسی ناوەندیی زانیارییەکـانی حکوومەت. لە ئاداری ١٩١٨شـدا بارەگـای سـەرەکـیی PTA گوێزرایـەوە مۆسکۆ و لەوێ لە مـانگی حـوزەیراندا تێکەڵ بەنـووسـینگەی ڕۆژنـامـەوانـیی حکوومـەت بـوو. لە ٧ی ئەیلوولی ١٩١٨دا لێـژنەی هەمیـشـەییی ڕاپەڕاندنی حکوومـەت بڕیاری گـۆڕینی ناوی PTA و نووسـینگەی ڕۆژنامـەوانی حکوومـەتی دا و بـەهـەردووکـیـانەوە بـوون بەئاژانسی تێلێگرافی ڕووسـیـا ROSTA. بەم شـێـوەیەش ROSTA بووە ئاژانسی ناوەندیی زانیاری بۆ هەموو یەکیەتی سۆڤێت.

بۆ باشتـر ناساندنی ئامـانجەکان و تێکۆشانی کۆماری تازە دروسـتکراوی لاتیڤیا بەجـەمـاوەری هەواڵخـوازی دەرەوە و ناوەوە، حکوومـەتە کـاتییـەکەی کـارلس ئولمانس (کە بەشێوەیەکی کاتی بارەگاکەی لە لیپایا بوو) نووسینگەی ڕۆژنامەوانیی دەوڵەتی بەناوی لاتۆپرێس لە ٤ی ئاداری ١٩١٩دا دروست کـرد. دوایی نووسـینگەکـە لە ژێر دەسـەڵاتی سـەرۆکـایەتیی حکوومـەت گـوێزرایەوە ریگۆ. لەم ماوەیـەدا لاتۆپرێس چەند چالاکییـەکی ئەنجـام دا کـە دواتر درانە فـەرمـانگـەی زانیـاری لە وەزارەتی کـاروباری دەرەوە. لە سـاڵی ١٩١٩دا لاتۆپـرێس ڕێکـکـەوتنی هـاوبـەشـیی لەگـەڵ ئاژانسی دەنگوباسی ئیستۆنیا ئیستور (ئێستا ETA یە) و ئاژانسی دەنگوباسی پۆڵەندا PAT (ئێستا PAPە) بەئەنجام گەیاند. هاوکاری لەگەڵ پۆڵەندا پێوەندیی لە بواری هـەواڵی ڕادیۆیی لە نێـوان ریگا و وارشـۆ لێ کـەوتەوە. لە ٥ی ئایاری ١٩٢٠دا حکوومـەتی کـاتی ئاژانسی تێلێگرافی لاتڤـیـای دروست کـرد و نـاوی نا LETA و ریهـارد بێرزینسی کردە بەڕێوەبەری و ئەمیش تا ١٩٤٠ لەم پۆستەدا مایەوە. ڕێککەوتنێک لە نێوان ئاژانسەکانی تێلێگرافی ئیستۆنیا و لاتڤیا و لیتوانیا ئەنجام درا بەمەستی

هاوکاریی توندوتۆڵ و LETA کرایە سەرپشک بۆ ئەوەی بەناوی ئەوانەوە گفتوگۆ لەگەڵ گەورە ئاژانسەکانی دەنگوباسی جیهاندا بکات. بەئەنجامدانی چەند گرێبەندێک لەگەڵ رۆیتەرزی بریتانیا و هاڤاسی فرانسە و ڤولفی ئەڵمانیا، LETA توانای فرەوان و خێرای گەیشتنی بەهەواڵەکانی جیهان، لە هەردوو بواری وەرگرتنی هەواڵ و دابەشکردنیدا بەدەست هێنا. لەو ماوەیەدا LETA توانیی پێوەندی لەگەڵ ٢٦ ئاژانسی دەنگوباس لە سەرانسەری جیهاندا هەبێ و زانیاریی دروست و باوەڕ پێکراوی لە تۆڕێکی هەواڵنێرانی بێگانەوە پێ دەگەیشت. هەواڵنێری مۆسکۆی LETA سەرچاوەیەکی گرینگی زانیاری بوو بۆ ئەورووپا لەبارەی ڕووسیاوە، کە لە ساڵی ١٩٢٥ەوە بەڕووی ڕۆژنامەوانانی بێگانەدا داخرا بوو. زۆر جار LETA کێبەرکێی لەگەڵ دیپلۆماتکارەکاندا دەکرد لە وردی و خێراییی ئەو زانیارییە گرینگانەی لە دەرەوە پەیدای دەکردن. لە ١٧ی حوزەیرانی ١٩٤٠دا ستافی LETA توانییان وێنەی سوپای داگیرکەری سۆڤێت بگرن لە کاتی گەیشتنی بەریگا و دوایی بەڵگەکانیان بۆ سوید گواستەوە.

هێزەکانی ڕۆژئاوا لە ١٦ی ئاداری ١٩٢٠دا ئیستانبووڵیان داگیر کرد. دوای داخستنی پەرلەمانی عوسمانی، مستەفا کەمال پاشا بانگهێشتنی هەموو حاکمی ویلایەتەکان و بەرپرسانی هێزەکانی سوپای کرد بۆ ئەوەی نوێنەر هەڵبژێرن بۆ بەشدار بوون لە ئەنجوومەنی مەزنی نەتەوەیی کە لە ئەنکەرە کۆ دەبێتەوە. لە ٣١ی ئاداردا، یونس نادی (ئابائۆغڵو)ی خاوەنی ڕۆژنامەی یەنی گون و نووسەر و ڕۆژنامەوان خالیدە ئەدیب (ئادیڤار) کە خۆیان بەو خەڵکە گەیاند کە بەرەو ئەنکەرە بەدەنگی بانگهێشتنەکەی مستەفا کەماڵەوە دەچوون، لە گەیڤە بەیەک گەیشتن. ئەم دوو ڕۆشنبیرە، کە بەیەکەوە سواری شەمەندەفەر بووبوون بەرەو ئەنکەرە، لە وێستگەی گەیڤە – ئاقهیسار (ئێستا ناونراوە پاموکۆڤا) گفتوگۆیان دەکرد لەسەر گرینگی و پێویستیی ئەوەی کە دەبێ وەک هەنگاوی یەکەم ئاژانسێکی دەنگوباس دامەزرێ. کاتێکیش یونس نادی و خالیدە ئەدیب باسی ناونانی ئاژانسە نوێکەیان دەکرد، لە نێوان چەندین ناوی تری وەک تورک و ئەنکەرە و هی تر ناوی ئەنادۆڵویان پەسەند کرد. ئاژانسی ئەنادۆڵ AA لە نیسانی ١٩٢٠دا دامەزرا. مستەفا کەمالیش

لەلای خۆیەوە یەکسەر چەندین دەستپێشخەریی کرد بۆ ئەوەی ئەم ئاژانسە ناوبانگ دەر بکا. بۆیە لە "ڕاگەیاندنێکی مێژووییدا" کە ئاراستەی دەسەڵاتەکانی سەربازی و مەدەنیی کرد، نەک تەنیا ئاماژەی بۆ دامەزراندنی ئاژانسی ئەنادۆڵ کرد بگرە باسی ئەوەی کرد چەند گرینگە دەنگوباسی تێکۆشانی نەتەوەییان بگاتە هەموو خەڵک لە دەرەوە و ناوەوەدا. بەردەوامیش هەواڵنێرانی ئەم ئاژانسە لە هەموو گەشتەکانی ناو وڵاتدا بەتەک مستەفا کەمال ئەتاتورکەوە بوون بۆ ئەوەی بەباشی خەڵک لە چاکسازییەکانی بگەیەنن. لەساڵی ١٩٢٥دا ئاژانسی ئەنادۆڵ بەگۆڕانکارییەک لە بنیاتدا تێ پەڕی و بوو بەکۆمپانیایەک. بەم شێوەی بنیاتەی ئەو کاتە لە ڕۆژهەڵاتیش زۆر باو نەبوو، ئاژانسی ئەنادۆڵ توانیی ببێ بەخاوەن کەسایەتیی سەربەخۆ.

لە ١٠ی تەممووزی ١٩٢٥دا، ئاژانسی تێلێگرافی یەکیەتی سۆڤێت TASS دامەزرا و دەستی بەسەر چالاکییە سەرەکییەکانی ئاژانسی تێلێگرافی ڕووسیادا گرت وەک ئاژانسی ناوەندیی زانیاری لە وڵاتدا. TASS بووە تەنیا خاوەنی مافی کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی زانیاری بۆ دەرەوەی یەکیەتی سۆڤێت لە پاڵ بڵاوکردنەوەی هەواڵی ناوخۆیی و دەرەکی لە ناو یەکیەتی سۆڤێتدا، هەروەها بەرپرس بوو لە ڕێکخستنی ئاژانسەکانی دەنگوباس لە کۆمارەکانی سۆڤێت. TASS هەموو ئاژانسەکانی دەنگوباسی کۆمارەکانی سۆڤێتی خستە ژێر باڵی خۆی: راتاو (ئۆکرانیا)، بێلتا (ڕووسیای سپی)، ئوزتاگ (ئۆزبەکستان)، کازتاگ (کازاخستان)، گروزئینفۆرم (گورجستان)، ئازرەئینفۆرم (ئازەربایجان)، ئیلتا (لیتوانیا)، ئاتێم (مۆڵداڤیا)، لاتئینفۆرم (لاتڤیا)، کیرتاگ (قیرغیزیا)، تاجیکتا (تاجیکستان)، ئەرمەنپرێس (ئەرمینیا)، تورکمانئینفۆرم (تورکمێنیا) و ئیتا (ئیستونیا).

هەواڵ و وێنەکانی TASS دەگەیشتنە چوار هەزار ڕۆژنامە و تەلەفزیۆن و رادیۆی سۆڤێت و زیاتر لە هەزار دەزگای ڕاگەیاندنی بێگانەش ئەو هەواڵ و وێنانەیان دەکڕی. ئەم ئاژانسی دەنگوباسە یەکێک لە گەورەترین تۆڕەکانی هەواڵنێرانی لە جیهاندا بەڕێوە دەبرد، ٦٨٢ نووسینگە و ٩٤ بیرۆی هەبوو، نزیکەی دوو هەزار ڕۆژنامەوان و وێنەگر وەک کارمەند کاریان بۆی دەکرد. ناوی ئێستای ئاژانسی تێلێگرافی زانیاریی ڕووسیا ITAR-TASS لە کانوونی دووەمی ١٩٩٢دا داهێنرا،

دوای ئەوەی یەکیەتی سۆڤێت هەڵوەشایەوە و کۆماری دیموکراتی فیدراڵی ڕووسیا بووە کۆمارێکی سەربەخۆ. ئێستا ITAR-TASS ئاژانسی ناوەندیی زانیاریی دەوڵەتە، بەڵام بەهۆی گۆڕانکارییە دیموکراتەکانی وڵاتەوە و پێویستییە نوێکانی تەکنیکەکانی گەیشتن بەزانیاری و تەکنۆلۆجیاکانی گواستنەوەی زانیاری لە ڕێی کۆمپیوتەرەوە هەندێ زەبری بچووکی بەرکەوتووە.

ئاژانسی تێلێگرافی ئەلبانیا ATA ساڵی ۱۹۲۹ دامەزرا. دامەزرێنەکەی میهال شێرکۆ بوو و هۆکارەکەش پێویستیی لە ڕادە بەدەری خەڵکی ئەلبانیا بوو، لەو ڕۆژگارەدا بەناساندنی ڕاستیی ئەلبانیایی لەو سەردەمەدا. هەموو جارێکیش ناوی ATA هاوشانی ناوی نووسینگە یان وەزارەتی ڕاگەیاندن دەهات. هەر لە سەرەتاشەوە ATA تۆڕێکی هەواڵنێرانی هەبوو لە شارە سەرەکییەکانی وڵاتەکەدا و پێوەندیی لەگەڵ ئاژانسی هاڤاس لە پاریس و ستیفانی لە ڕۆما و ڕۆیتەرز لە لەندەن و نووسینگەی ڕۆژنامەوانیی ئەڵمانیا لە بەرلین هەبوو.

لە ئیسپانیا کێشەی سەرەکیی فابرا ئەوە بوو بۆ هەواڵی دەرەوە بەتەواوی پشتی بەهاڤاس بەستبوو، هاڤاسیش لە بەرامبەردا داوای لە فابرا دەکرد ئەو هەواڵانەش بڵاو بکاتەوە کە ڕەنگ بوو دژ بەبەرژەوەندییەکای ئیسپانیا بن، لە کاتێکدا هاڤاس ناچار نەبوو هەمان شت سەبارەت هەواڵەکانی کە لە فابرای وەردەگرت بکا. بۆیە زۆر دەنگ دژ بەم باڵادەستییە فرانسەییە بەرز بوونەوە لە کاتێکدا هاڤاس تەنیا دەروازە بوو بەڕووی جیهانی دەرەوەدا و کاتێ کە بەرژەوەندییەکان دژ دەبوون، وەک لە شەڕی باکوری ئەفریقا، ڕاپۆرتەکانی هەواڵ لە بەرژەوەندیی لایەنی فرانسەیی بوون. بەرامبەر بەم ستەمە فرانسەییەش ئیسپانیاییەکان بیریان لە دروستکردنی ئاژانسگەلێکی تر کردەوە. ئەمەش وای کرد فیبەس و سپێس و سپەین ئەمێریکا لەدایک ببن. لەدایکبوونی ئەم ئاژانسانەش وای کرد زانیارییەکان جۆراوجۆر بن، بەڵام هەندێ دەنگ بەرز بوونەوە و داوای دروستکردنی ئاژانسێکی ئیسپانیاییان دەکرد کە توانای نێودەوڵەتیشی هەبێ. پێویستیی جێبەجێ کردنی ئەم خواستە، دامەزراندنی ئاژانسێکی ئیسپانیایی کە توانای نێودەوڵەتیی هەبێ، لای ڕۆژنامەوانان و دەزگاکان لە ماوەی شەڕی ناوخۆدا (۱۹۳٦ تا ۱۹۳۹) زیاتر هەستی

پێ کرا. بۆیە لە ٣ی کانوونی دووەمی ١٩٣٩دا کیلیدۆنیۆ دی نوریێگا رووێز، کە مارکیزی تیرۆهۆیۆی و کەسایەتییەکی سەربازی بوو، لەگەڵ لویس ئاماتۆ دی ئیبارۆلا، کە رۆژنامەوان بوو، لەبەردەم خۆزێ ماریای کاتب عەدلدا (دادنووس) رایان گەیاند کە رێک کەوتوون لەسەر پێکهێنانی کۆمەڵەیەکی بازرگانیی خاوەن کەسایەتییەکی نەناسراو و ناویان نا ئەژانسیا ئیفی س، ئەم دوو کەسەش نوێنەرایەتیی فابرایان دەکرد. ئەم ئاژانسە شایان بوو بچێتە ناو یانەی ئاژانسە هاوپەیمانەکانەوە کە سی یانەی لەخۆ دەگرت و لە هەر وڵاتێک تەنیا یەک ئاژانس بۆی هەبوو ببێتە ئەندامی یانەکە. بەمەش ئیفی EFE لەسەر پاشماوەی فابرا شین بوو بەڵام ئەم نیازیَ گەیشتن بەجیهانی دەرەوەی هەبوو. چەندین ساڵیشی برد تا EFE توانیی ببێتە یەکەمین ئاژانسی نێودەوڵەتی لە وڵاتانی ئیسپانی زماندا و بەسەر ئاژانسە ئەنگلۆئەمەریکایی و فەرانسەییەکاندا زاڵ بێ و لێیان بباتەوە. لە بەڵگەنامەی دامەزراندنی ئیفیدا هاتووە کە ئاژانسێکی "سەربەخۆی بازرگانییە" بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا حکوومەت وەک دەزگایەکی "نافەرمی" پشتگیریی دەکا نەک وەک دەزگایەکی "فەرمی".

## یەکیەتی ئەورووپایی

لەبەر گرانیی تێچووی هەواڵ کۆکردنەوە لە رێی تێلێگرافەوە، بۆیە ستراتیجی هاوئاهەنگی لە هەواڵ کۆکردنەوەی نێودەوڵەتیشدا پێویست بوو و جێبەجێ کرا.

یەکەمین رێککەوتننامەی گرینگ لەم بوارەدا لە ساڵی ١٨٥٦دا لەنێوان رۆیتەرز و هاڤاسدا مۆر کرا کە تایبەت بوو بەگۆڕینەوەی هەواڵ تەنیا لە بواری بازرگانی و کەلوپەلدا. لە ساڵی ١٨٥٩ش ئەم رێککەوتننامەیە فرەوان کرایەوە بۆ ئەوەی ڤولفیش بگرێتەوە و لە ساڵانی دواتردا هەموو جۆرە هەواڵێکی گرتەوە و ئەو ناوچە جوگرافیيانەش دیاری کران کە هەر ئاژانسێک تیایدا خاوەنی بازاڕی هەواڵە. ناوچەکانیش بەم شێوەیە بوون: بۆ هاڤاس لە ئەورووپا فرانسە و ئیسپانیا و ئیتاڵیا و ئەمەریکای باشوور و لە ئاسیا هیندستان و چین. بۆ ڤولف ئەڵمانیا و ڕووسیا و وڵاتانی سکاندیناڤیا و وڵاتانی سلاڤ. بۆ رۆیتەرزیش هەموو ئیمپراتۆریای بریتانیا و ڕۆژهەڵاتی دوور. ئەم کارە تێچووی کۆکردنەوەی هەواڵی دەرەوەی کەم کردەوە و

بازاڕەکانیشی پاراست. ئەم شێوازی ڕێکخستنی کارەش بەیەکیەتیەکی هەواڵی نێودەوڵەتی وەسف کرا.

بەپێی ڕێککەوتننامەکەی ساڵی ١٨٧٠، ناوچەی تایبەت بەرۆیتەرز بریتی بوو لە ئینگلتەرا و هۆڵاند و ئەو وڵاتانەی لەلایەن ئەم دووانەوە داگیر کراون. سەبارەت بە ئەڵمانیا و وڵاتانی سکاندیناڤیا و شارەکانی سانت پیتەرسبێرگ و مۆسکۆ، ئەمانە هەمووی بۆ ڤولف بوون. هاڤاسیش مافی قۆرغکردنی هەواڵەکانی فرانسە و ئیتاڵیا و ئیسپانیا و پۆرتوگالی پێ درا بوو. ئیمپراتۆریای عوسمانی و میسر و بەلجیکاش لە نێوان هاڤاس و رۆیتەرزدا دابەش کرابوون، جگە لەمانەش، ئەو ناوچانەی تر کە بەبێلایەن ناسێنرابوون هەر سێ ئاژانسەکە وەک یەک بۆیان هەبوو کاریان تێدا بکەن. دوای ئەمە ڕێککەوتنگەلێک هاتنە کایەوە کە هەموو جیهانیان دەگرتەوە.

هاوبەشەکانی ڕێککەوتننامەکانی پێش ساڵی ١٨٧٠ تەنیا بۆیان هەبوو ئەو هەواڵانە بفرۆشن کە لە ناوچەکانی خۆیاندا بەدەستیان دێن، ئەگەر هات و هەواڵیان لە دەرەوەی ئەو ناوچانە کەوتە دەست ئەوە تەنیا دەیدەنە ئەو هاوپشکەیان کە ئەو ناوچەیە پاوانی ئەوە.

لە ڕێی ڕێگرتن لە فرەوانبوونی ناوچەکانی ڤولف و ناچارکردنی بەوەی دەست لە ٢٥٪ی قازانجی خۆی بۆ ئەوان بەر بدا، هاڤاس و رۆیتەرز توانییان چالاکیی هاوپشکەکەیان سنووردار بکەن. لە ساڵی ١٨٨٧یش نووسینگەی نەمسایی-هەنگاریی کۆرێسپۆندێنز وەک هاوپشک هاتە ناو ڕێککەوتنەکەوە. ئەم لەگەڵ ئەسۆشیێتد پرێسی ئەمەریکایی پێگەی جیاوازیان هەبوو.

نووسەری مێژووی رۆیتەرز، دۆناڵد رید، دەڵێ لە ماوەی نێوان ١٨٦٠ و ١٩٠٠ رۆیتەرز بەزۆری وەک "دەزگایەکی ئیمپراتۆریای بریتانیا کاری دەکرد. حکوومەتی بسمارک کە لە هەوڵی ئەوەدا بوو ڕێ لە زاڵبوونی رۆیتەرز بەسەر ئاژانسی ئەڵمانیاییدا بگرێ، دەستی بەپارەدارکردنی ڤولف کرد. چەند ئاژانسێک وەک ستیفانی و ڤولف و کۆرێسپۆندێنز بەهاوکاریی رۆیتەرز لە ساڵی ١٨٨٧دا هەوڵیان دا هاڤاس لاواز بکەن. کەچی ڕێککەوتننامەکەی ساڵی ١٨٨٩ ئیتاڵیای هەر وەک پاوانی هاڤاس هێشتەوە، کۆرێسپۆندێنزیش نە توانیی وەک هاوپشکێکی تەواو

بەشـدار بێ و نە دەسـەڵاتی پـاوانکردنی کۆکـردنەوە و فرۆشـتنی هـەواڵەکـانی وڵاتی خۆشی پێ درایەوە کە پێش ١٨٨٩ هەیبوو.

ئەسۆشیێتد پرێس لەگەڵ رۆیتەرزدا چەند رێ و شوێنێکیان گرتبووە بەر سەبارەت هەواڵەکـانی دەرەوە. یونایتـد پرێسـیش کـە هـەوڵی دەدا هـەواڵ لە دەرەوە کـۆ بکاتەوە رووبەڕووی یەکـیـەتیـەک بووەوە کـە "پێک هاتبـوو لە ئاژانسـە فـەرمی و نیـوچە فەرمییەکـانی دەنگوباسی سـەر بەحکوومـاتەکـانی وڵاتانی ئەوروپا". ئەم "ئـاژانسـە هاوپەیمـانانە" لەگـەڵ ئەسـۆشـیـێـتـد پرێس هـەواڵی پاوانکراویان ئاڵوگـۆڕ دەکـرد. سـەرباری ئەمـەش ئەوان بەهەر ئەندامێک مـافی پاوانکردنی ناوچەگەلی دیاریکراوی جیـهـانیـان بەخشـی بۆ ئەوەی بۆ وەبەرهێنان سـوودی لێ وەرگرێ. بۆ نموونە تـەنیا ئاژانسی هاڤاسی فرانسـەیی بۆی هەبوو هەواڵ لە باشووری ئەمـەریکا بفرۆشێ، لە کـاتێکدا لە رۆژهەڵاتی دوور کـە ناوچەی رۆیتـەرز بوو، دەبوایە رۆژنـامـەکـانی چین و ژاپۆن بۆ هـەواڵی دەرەوە پشت بـەئاژانسەکەی بریتـانیا ببەسـتن. یونایتد پرێس بووە یەکەمین ئاژانسی دەنگوباسـی ئەمـەریکای باکور کە رۆژنامـە لە ئەوروپا و ئەمەریکای باشـوور و رۆژهـەڵاتـی دوور بڵاو بکـاتەوە. ئەم ئـاژانسـە بیـرۆی خـۆی لەو ناچـانەدا دامـەزراند. سـەرکـەوتنی یونـایتـد پرێس لەم هـەوڵەدا وای کـرد لە سـاڵی ١٩١٢دا بانگهێشـتن بکرێ بۆ ئەوەی ببێتە هـاوپەیمان لەگەڵ رۆیتەرزدا، بەڵام خـۆی بەوە قایل نەبوو.

لە سەرەتای دامـەزراندنیدا لە سـاڵی ١٩٠٧ ژمارەی ئەو رۆژنامانەی یونـایتد پرێس UP لە ویلایـەتە یەکگرتووەکــانی ئەمــەریکا بڵاو دەکــردەوە ٣٦٩ رۆژنامــە بـوو. هەواڵەکانیشی لە رێی ئاژانسی ئێکسچێنج تێلێگرافی بریتانیاوە دەچوونە ئەوروپا. دوو سـاڵ دوای ئەوە، لە ١٩٠٩دا، UP دەسـتی بەگـەیاندنی هـەواڵ لە رێی کێبڵـەوە بۆ ئاژانسی نیپـۆن دیمۆ تسـوشین شای ژاپۆن کـرد، کە دواتر تێکەڵ بەدۆمێی بوو. ئەم خزمەتگوزارییە تا ٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٤١، ئەو رۆژەی ژاپۆن هێرشی کردە سەر پیرل هـاربەر، بەردەوام بوو. لە سـاڵی ١٩١٤دا ژمارەی کڕیارەکانی دوو ئەوەندە بوو. لەگەڵ دەست پێکردنی شـەڕی یەکـەمی جیـهـان، رۆژنامـەکـانی ئەمـەریکای باشـوور بێـزار بوون لەو کـۆت و بەندانەی ئاژانسـە هـاوپـەیمانەکـان کـە ناچاریان دەکـردن

هەواڵەکانی شەڕ تەنیا لە ئاژانسی هاڤاسی فرانسەییەوە وەرگرن و دەیانگوت ئەو ئاژانسە لەلایەن حکوومەتەوە پارەدار دەکرێ بۆیە تەنیا هەواڵەکانی دیوی هاوپەیمانان دادەپۆشێ. بۆ ئەوەی هەواڵی هەردوو لایان دەست بکەوێ ڕوویان لە UP کرد، کە لە ساڵی ١٩١٥وە دەستی بەبڵاوکردنەوەی هەواڵ لە باشووری ئەمەریکا کردبوو. ڕۆژنامەی لا پرێنسای بۆینس ئایرس لە ١٩١٩وە دەستی بەسوود وەرگرتن لە خزمەتگوزارییەکانی یونایتد پرێس کرد. دوای شەڕی یەکەمی جیهانیش، لە ساڵی ١٩٢١دا، خزمەتگوزاریی ڕاستەوخۆی یونایتد پرێس بەڕۆژنامەکانی ئەورووپا گەیشت، کڕیارەکان لە کۆڵن و فرانکفۆرت و ڤیەننا یەکەمینی ئەو شوێنانە بوون لە ئەورووپا. گەیشتنی خزمەتگوزاریی ڕاستەوخۆی یونایتد پرێس بۆ ڕۆژنامەکانی ناوچە گرینگەکانی ئاسیا لە ساڵی ١٩٢٢ بوو کاتێ گەیشتە ڕۆژنامەکانی بەکین و تیانستسین. هەر لە ساڵی ١٩٢٢ بوو کاتێ بریتیش یونایتد پرێس لیمیتد کەوتە گەڕ بۆ گەیاندنی خزمەتگوزاری بەڕۆژنامەکانی ئیمپراتۆریای بریتانیا. هەر لەگەڵ هاتنی ساڵی ١٩٢٩ UP هەواڵی بە ١١٧٠ ڕۆژنامە لە ٤٥ دەوڵەت و هەرێمدا دەفرۆشت. لە ٢٤ی ئایاری ١٩٥٨ UP لەگەڵ ئینتەرناشناڵ نیوس سێرڤس (کە لە ساڵی ١٩٠٩ لەلایەن ویلیەم ڕاندۆلف هێرست دامەزرا بوو) یەکیان گرت و ئاژانسی UPIیان دروست کرد.

یەکەمین ڕووبەڕووبوونەوەی ئەسۆشیێتد پرێس AP لەگەڵ پاوانخوازیی ئەورووپادا لە ساڵی ١٩٠٢ بوو کاتێ خزمەتگوزاری لە ڕێی کێبڵەوە کەوتە کار بۆ بەدەنگەوە هاتنی داواکانی کووبا و فیلیپین و ئەمەریکای ناوەڕاست. ڕووبەڕووبوونەوەی زیاتریش لە نێوان AP و یەکیەتیەکەی ئاژانسەکانی ئەورووپا لە ساڵی ١٩١٩دا بوو. دەستەی کارگێڕیی AP بۆ بەدەنگەوە هاتنی داخوازییەکانی ٢٢ ڕۆژنامەی ئەمەریکای باشوور ڕێی بەخزمەتگوزاریی تەواو بۆ ئەمەریکای لاتین دا. هەمان شتیش لە ساڵی ١٩٣٣دا بۆ ژاپۆن کرا، دوای ئەوەی ئاژانسی دەنگوباسی رینگۆ لە ژاپۆن داوایەکی هاوشێوەی ئاراستەی AP کرد. لەبەرئەوەی UP مەترسییەکی گەورە بوو بۆ یەکیەتیە ئەورووپاییەکە، بۆیە بەناچاری لە کۆتاییدا APیان وەک هاوپشک و ئەندامی تەواوی یەکیەتیەکە وەرگرت، ئەمەش بەپێی ڕێککەوتنێکی چوارقۆڵی لە

ساڵی ۱۹۲۷دا. بەڵام ئەمەش توانای پاراستنی ئەو یەکیەتیەی نەبوو، چونکە AP دوای ئەوەی بەتەواوی دەستی لە ئەمەریکای باشوور کرایەوە، داوای هەمان شتی لە ڕۆژهەڵاتی دووریش دەکرد. کێشەکەش لەوێوە سەرچاوەی دەگرت ڕۆژهەڵاتی دوور پاوانی ڕۆیتەرز بوو، ڕۆیتەرزیش لە بواری هەواڵی دەرەوەدا باڵادەستتر بوو لە هاڤاس و هەرگیز ئامادە نەبوو ئەو ناوچەیەی پاوانی خۆی بوو بەئاسانی بەدەستەوە بدا. سەرەڕای هەموو ئەمانە، یەکیەتیەکە لە ساڵی ۱۹۳٤دا لەبەریەک هەڵوەشایەوە و ئاژانسە ئەمەریکاییەکان و دوو لە ئاژانسە ئەوروپاییەکان ڕۆڵی سەرەکییان لەمەدا هەبوو. هەنگاوێکی گەورەی تر ئەو ڕێککەوتنە بوو لە نێوان TASSی سۆڤێت و دوو ئاژانسەکەی ئەمەریکا لە ساڵی ۱۹۳٤دا کە پرەنسیپەکانی یەکیەتیە ئەوروپاییەکە بەهیچ جۆرێک ڕێی پێ نەدەدا. هەنگاوی گەورەی دووەمیش ئەو بۆندە بوو ئاژانسی رینگۆی ژاپۆن لەگەڵ APدا مۆری کرد و بەتەواوی دژی پاوانخوازیی ڕۆیتەرز بوو لەو ناوچەیەدا. سێیەمینیان، کە ڕەنگە لە دووەکەی تر کاریگەرتر بووبێ، ئەوە بوو UP جارێکی تر بانگهێشتنەکەی ڕۆیتەرزی بۆ هاتنە ناو یەکیەتیەکە ڕەت کردەوە. بەم شێوەیە سەردەمی یەکیەتی دەنگوباسی ئەوروپا بەسەرچوو.

## دوای شەڕی جیهان

لەگەڵ کۆتاییی شەڕی یەکەمی جیهان (۱۹۱٤-۱۹۱۸) ئاژانسەکانی دەنگوباسی ئەڵمانیا و نەمسا پێگەی خۆیان لە بازاڕەکانی هەواڵی جیهاندا لەدەست دا. لە ڤیەننا ئاژانسی ئیمپریالی شاهانە کە بە kk ناسرابوو نەما و بووە تێلێگرافن کۆرێزپۆندێنتس بیرۆ و دوای ماوەیەکی زۆر کورت بووە ئاژانسی فەرمیی دەنگوباس ئامتلیشە ناخریشتنشتێلە ANA. دوای یەکەمین دۆڕاندنی ئەڵمانیا، هاوپەیمانەکان چالاکییەکانی ئاژانسەکانی ئەڵمانیا، ڤولف یان کۆنتینێنتالیان لەوبەری دەریاکاندا قەدەغە کرد. بەڵام نازییەکان ماشێنێکی هەواڵی نێودەوڵەتیی تایبەت بەخۆیان دروست کرد بەناوی ترانس ئۆشن و بەهۆی ڕادیۆوە هەواڵەکانی خۆیان بڵاو دەکردەوە، هەروەها ئاژانسی دۆیچز ناخریشتن بیرۆ DNB کە تێکەڵەیەکی زۆرەملێی ئاژانسەکانی پێشووتر بوو بەتایبەتی کۆنتینێنتال و TU. ئەم ئاژانسانە بەدوو ڕێ کاریان لە ڕۆیتەرز و هاڤاس کرد: هەواڵەکانیان یان بەخۆڕایی یان بەنرخێکی زۆر

هەرزان بڵاو دەکردەوە، ئەمەش بەهۆی پشتگیریی دارایی دەوڵەتەوە بوو، هەروەها ئاژانسە کۆنەکانی ئەوروپایان لە پشکداری بێبەش کرد. بەمەش توانییان لە ڕووی داراییەوە لاوازیان بکەن.

ترانس ئۆشن TO ئاژانسێکی دەنگوباسە ساڵی ١٩١٥ لە لایەن سەندیکای دۆیچەر ئوبەرزیدێنشت دامەزرا، ئەم سەندیکایەش لە لایەن حکوومەتەوە دامەزرا و لە ڕێی پیشەسازی و بازرگانییەوە پارەدار دەکرا. ئامانجەکەشی ئەوە بوو زۆرترین و باشترین زانیاری لەبارەی ئەڵمانیاوە بەوەرگری بێگانە بگەیەنێ زیاتر لە ڤولفشز تێلێگرافیشز بیرۆ، کە بووچوونەکە وا بوو کاریگەریی نەبێ. لە ماوەی یەکەمین شەڕی جیهانیدا وەزارەتی دەرەوەی ئەڵمانیا TOی بۆ بانگەشەکردن بۆ پرسی ئەڵمانیا بەکار هێنا. لە ڕاستیدا، کاری بۆ ئەوە دەکرد هەواڵەکانی بگەیەنێتە بازارەکانی ئەودیوی دەریاکانەوە لەبەرئەوەی ئاژانسەکانی تری وەک AP و UP و INS ڕاپۆرتە فەرمییەکانی ئەڵمانیایان لەبارەی شەڕەوە تەنیا بۆ پیشاندانی بێلایەنیی خۆیان بڵاو دەکردەوە. جگە لەمە سەرکەوتنی TO گەورە نەبوو لەبەرئەوەی ئەڵمانەکان لەوە بێئاگا بوون چ جۆرە زانیارییەک بەلای ڕۆژنامەوانیی ئەمەریکاوە جێی بایەخە. لە سەردەمی دوای شەڕدا TO چالاکییە نێودەوڵەتییەکانی خۆی چڕ کردەوە و دەستی بەخزمەتگوزارییەکی ڕۆژانە کرد بەزمانی ئینگلیزی. لە بڵاوکردنەوەی هەواڵیشدا دووبارە بەشێوەیەکی سەرەکی ڕوویان لە ئەمەریکای باشوور و ئاسیا بوو.

ریچارد شینکل ئاژانسێکی تری دەنگوباسی لە نیویۆرک دامەزراند. شینکل پێشتر لەوێ وەک پەیامنێر کاری دەکرد بۆ بەرلینەر بۆرزن کۆرێر کە ڕۆژنامەیەکی بازرگانی و کڕیاری سەرەکیی ئەو بوو. لە ساڵی ١٩١٣ ئاژانسێکی تری دەنگوباسی ئەڵمانیایی ئاژانسەکەی شینکلی کڕی. ئاژانسەکە ناوی تێلێگرافن یونیەن TU بوو. ئەم ئاژانسە بەزۆری لە ژێر کاریگەریی پیشەسازیدا بوو و سەر بەباڵی ڕاستڕۆی پارێزکاری هوگنبێرگ هۆلدینگ بوو. لە ساڵانی دوای هەڵاوسانەکەی ئەڵمانیا، TU کاری بۆ ئەوە کرد لایەنی کۆکردنەوەی هەواڵی دەرەوە بەهێز بکا. بۆ ئەم مەبەستەش هەواڵنێری خۆی دامەزراند و بۆندی هاوئاهەنگیی لەگەڵ ئاژانسگەلی تردا بەست.

یەکێ لەو بۆندانە لەگەڵ یونایتد پرێسدا بوو بۆ بەدەستهێنانی هەواڵەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان. چونکە TU نەیتوانی تۆڕی هەواڵنێرانی سەربەخۆی لە ئەمەریکادا هەبێ. ئەم شکستەش لەبەر هۆکاری تێکنۆلۆجیایی نەبوو چونکە تێلێگراف و بێتەل ماوەیەک بوو هەبوون، بگرە هۆکارەکە نەبوونی سەرچاوەی دارایی بوو. لە ١٩٢٠ەکاندا ڤۆلفشز تێلێگرافیشز بیرۆ WTB بەردەوام بوو لە پشتبەستن بە AP بۆ داپۆشینی هەواڵەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان. لە ساڵی ١٩١٣ و بەدەرکەوتنی ئاژانسی ڕکابەر، WTB گرینگیی خۆی لەدەست دا. نازییەکان لە ساڵی ١٩٣٤دا TU و ڤولف کۆنتینێنتالیان لە DNBدا تێکەڵ بەیەک کرد و تا کۆتایی شەڕی دووەمی جیهانی کاریان بەم ئاژانسە کرد. DNBیەکەی ئەڵمانیای نازی کارێکی بازرگانیی کەرتی تایبەت (کۆمپانیای پشکداریی سنووردار) بوو بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا خاوەن پشکەکان هەموویان لاینگری حکوومەت بوون. تەنیا وەک ڕووکەش ئەم ئاژانسە وەک کۆمپانیایەکی کەرتی تایبەت بەڕێوە دەبرا. ئیتر لەمەودوا پێویستی بەوە نەبوو لەگەڵ کۆمپانیاگەلی بێگانەدا ڕێککەوتنی ئاڵوگۆڕی دەنگوباس ئەنجام بدا، بگرە بەهۆی پشتگیریی دارایی حکوومەتەوە تۆڕی هەواڵنێرانی خۆی لە دەرەوە دامەزراند بۆ ئەوەی سەربەخۆیی خۆی و سەروەریی تەواوی هەواڵەکانی مسۆگەر بکا.

ئاژانسی دەنگوباسی دۆمای ساڵی ١٩٣٦ دامەزرا، بەهاوکاریی حکوومەتی ژاپۆن و وەک جێگرەوەی رینگۆ و بۆ ئەوەی دەست بەسەر هەواڵ و ئۆپەراسیۆنەکانی گەیاندنی دێنتسودا بگرێ. ئامانجی سەرەکیی دامەزراندنی گەیاندنی هەواڵ و دەنگی ژاپۆن بوو بەجیهان. دۆمای لەو سەردەمەدا تاکە ئاژانسی دەنگوباس بوو لە ژاپۆن. لە ساڵی ١٩٣١ بەدواوە، ژاپۆن بەرەکانی شەڕی خۆی فرەوانتر کرد بەرەو چین تا لە کۆتاییدا گەیشتە ناوچەی ئۆقیانووسی ئارام. دۆمای ژمارەیەکی زۆری لە هەواڵنێران و وێنەگرانی شەڕی ناردە شەڕگەکان و ڕۆڵێکی سەرەکیی لە گەیاندنی ئەو راپۆرت و هەواڵانەدا دی کە باسی چۆنێتیی بەڕێوەچوونی شەڕیان لە بەرەکانی ئاسیا و پاسیفیکدا دەکرد. دەکرێ بگوترێ دۆمای ڕۆژانە بەلاڤۆکی (وێنەهەواڵەکانی دۆمای)ی بڵاو دەکردەوە بەسەر هاولاتییانی ئاساییی ژاپۆندا بۆ ئەوەی لە بەڕێوەچوونی شەڕ ئاگەدار بن. ڕۆژانە نزیکەی سەد هەزار دانە لەم بەلاڤۆکە چاپ

دەکرا و بڵاو دەکرایەوە بەسەر قوتابخانە و کارگە و دوکان و شوێنەکانی تری ژاپۆن و ئەودیوی دەریاکاندا. بەڵاڤۆکەکە لە دیوارەکان دەدرا بۆ ئەوەی زۆرترین ژمارەی خەڵک بیبینن. ئاژانسی دەنگوباسی دۆمای دوای تەواوبوونی شەڕی پاسیفیک، لە تشرینی دووەمی ١٩٤٥دا چالاکییەکانی ڕاگیران و هەڵوەشێنرایەوە.

## شەڕی دووەمی جیهانی

لەگەڵ دروستبوونی دەوڵەتانی نوێ لە چەندین وڵاتی ئەوروپا، لە سەردەمی دوای شەڕدا، شەپۆلێکی دامەزراندن و ڕێکخستنەوەی ئاژانسەکانی دەنگوباس دەستی پێ کرد. بەگشتی لە نێوان ساڵانی ١٩٤٥ و ١٩٤٩دا ٢٤ ئاژانس دەستیان بەکار کرد. لەو کاتەدا کە هەموو ئەوروپا لە ژێر دەستی هیتلەردا بوو، ئاژانسی تێلێگرافی یۆگۆسلاڤیای نوێ TANJUG لە ناوچە ڕزگارکراوەکانی یۆگۆسلاڤیا لە ٥ی تشرینی دووەمی ١٩٤٣دا دامەزرا. ئەم ئاژانسە سەرەتا بەهۆی ئامێرێکی گواستنەوەی رادیۆتێلێگرافەوە، کە هی دوژمن بوو و دەستی بەسەردا گیرابوو، دەستی بەوەشاندنی هەواڵەکانی خۆی کرد. TANJUG سەرەتا بارەگاکەی لە یایکە بوو و دوایی چووە درڤار و دوای ئەوە بۆ دوورگەی ڤیس لە ناو دەریای ئەدریاتیک، دواتریش بۆ ئارانییلۆڤاک، پێش ئەوەی سوپای ڕزگاریخوازی گەل لە ٢٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٤دا بچێتە ناو بەلگرادەوە.

لە ئیتاڵیا ئاژانسی نەتەوەیی ئەسۆشیێتد پرێس ANSA لە ساڵی ١٩٤٥دا وەک جێگرەوەیەکی ئاژانسی ستیفانی ATS، کە لە ساڵی ١٨٥٣وە چالاک بوو، دامەزرا. ANSA کۆمپانیایەکی هاوبەش بوو لە ٥١ پشک پێک هاتبوو. هاوپشکیش لەم کۆمپانیایەدا تەنیا مافی ڕۆژنامە ڕۆژانەکان بوو. هەفتەنامەکان و وەرزنامەکان و رادیۆ و تەلەفزیۆنەکان تەنیا مافی بەشدارییان لە ANSAدا هەبوو بەبێ ئەوەی لە کۆمپانیاکەدا مافی دەنگدانیان هەبێ. بەپێی پێڕۆی کۆمپانیاکە، ئامانجی ئەم ئاژانسە مسۆگەرکردنی "بەرژەوەندییە دوولایەنەکانی ئەندامەکان بوو لە سایەی ئەو ئازادییە دیموکراتییای کە دەستووری وڵات مسۆگەری کردوون وبۆ ئەوەش کە بەشێکی فرەوانی زانیاریی ڕۆژنامەوانی بگاتە کۆمپانیاکانی ئیتاڵیا، ئەوانەی ڕۆژنامە بڵاو دەکەنەوە و ئەو کریارانەی تریش بەپابەندبوونی تەواو بە سەربەخۆیی و

دەستپاکی و بابەتیبوون". لە ژاپۆن، دوای ئەوەی لە کۆتایی شەڕی دووەمی جیهاندا ئاژانسی دەنگوباسی دۆمایی حکوومەتی هەڵوەشێنرایەوە، کیۆدۆ: کە یەکیەتیەکی قازانجنەویستی ڕۆژنامەوانانی ژاپۆن بوو، لەگەڵ ژیژی پرێس لیمیتد: کە کۆمپانیایەکی پشکداری بوو و ۱۰۰٪ی موڵکی ئەوانە بوو کە کاریان تێدا دەکرد، لە تشرینی دووەمی ١٩٤٥دا هاتنە کایەوە.

لە ١٣ی ئاداری ١٩٣٨، کاتێ هێزەکانی ئەڵمانیا چوونە ناو خاکی نەمسا و دەوڵەتی نەمسا نەما، ئاژانسی ئامتلیشە ناخریشتنشتیلە ANAش نەما و ئیتر DNB کارەکانی ئەوی دەکرد. بەهەمان شێوەش، لەگەڵ ڕووخانی ڕایشی سێیەمیش DNB لەناو چوو. ANA دووبارە لە ٢ی ئابی ١٩٤٥ دەرکەوتەوە و درابووە پاڵ وەزارەتی ڕاگەیاندنی حکوومەتی فیدراڵ. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، پاڵەپەستۆکانی پێشتری هێزەکانی داگیرکەر و بایکۆتکردنی ANA لەلایەن ئاژانسەکانی دەنگوباسی ئەنگلۆ ئەمەریکاییەوە وایان کرد ئەم ئاژانسە کۆتایی پێ بێ و ئاژانسی هاوبەشی APA دەرکەوێ. APA لە ٣١ی ئابی ١٩٤٦دا ناوی لە تۆمارەکانی دادگەی بازرگانیی ڤیەننا تۆمار کرا وەک کۆمپانیایەکی هاوبەش دوای ئەوەی بۆندێکی لەگەڵ حکوومەتی کۆماری نەمسا مۆر کرد و ئەوەی لە ANA مابوو کڕییەوە. ئاژانسی دەنگوباسی نەمسا APA وەک ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباس دامەزرا و خاوەنەکەی ١٤ ڕۆژنامەی جۆراوجۆر و وێستگەی وەشانی نەمسایی ORF بوون.

ئاژانسی دەنگوباسی ئەڵمانیا DPA ساڵی ١٩٤٩ دەستی پێ کرد و بارەگا سەرەکییەکەی لە هامبۆرگ بوو. DPA بەتێکەڵکردنی سێ ئاژانس DENA و DPD و SUEDENA لەلایەن بریتانیا و ئەمەریکا و فەرانسەوە، هەر یەک لەو ناوچەیەی خۆی داگیری کردبوو دروست کرا. DPA وەک کۆمپانیایەکی کەرتی تایبەت و ئاژانسێکی سەربەخۆ هاتە پێشەوە و وەک وەبەرهێنانێکی هاوبەش خاوەنداریەتی دەکرا و بەڕێوە دەبرا لەنێوان ڕۆژنامە و رادیۆ و تەلەفزیۆنەکانی کۆماری ئەڵمانیای فیدراڵدا. یەکێ لە پابەندییە سەرەکییەکانی ئەم ئاژانسە، لە پێڕۆکەشیدا هاتووە، پابەندبوونە بەبابەتیبوون و دادپەروەری. ئەوانە DPAیان تێکەڵ بە DENA و DPD و SUEDENA کرد لە گۆزلار لە ١٨ی ئابدا ڕێک کەوتن لەسەر ئەوەی پشکی دەستپێک لە

سەرمایەکە ٣٥٠ هەزار مارکی ئەڵمانیایی بێ. ئاژانسی دەنگوباسی ئەڵمانیا لە ١ی ئەیلوولی ١٩٤٩دا دەستی بەکارەکانی خۆی کرد.

## شەپۆلی سەربەخۆیی

ئاژانسی دەنگوباسی ئیندۆنیسیا، ئانتارا، لە ١٣ی کانوونی یەکەمی ١٩٣٧ لەلایەن ئادەم مالیک و سۆمانانگ و سیپانهۆنتار و پاندۆ کارتاویگۆناوە دامەزرا بەمەبەستی خزمەتکردنی تێکۆشان لە پێناو سەربەخۆیی نەتەوەیی و ڕزگاربوون لە کۆلۆنیالیزمی هۆڵەندا و داگیرکاریی ژاپۆن. ئانتارا یەکەمین ئاژانس بوو لە ١٧ی ئابی ١٩٤٥دا سەربەخۆیی ئیندۆنیسیای ڕاگەیاند. ئەجێنسیا تێلێنۆتیسیۆسا ئەمەریکانا، تیلام، لە ١٤ی نیسانی ١٩٤٥دا لەدایک بوو وەک وەڵامدانەوەیەکی حکوومەتی ئەرجەنتین بۆ قۆرخکردنی زانیاری لەلایەن UPI و AP یەوە. ئاژانسی دەنگوباسی ڤێتنام VNA لە ئەیلوولی ١٩٤٥ دامەزرا، یەکەمین بەڵاڤۆکی هەواڵی بەزمانگەلی ڤێتنامی و ئینگلیزی و فەرەنسەیی بوو و بریتی بوو لە ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی کۆماری دیموکراتی ڤێتنام، کە لە ٢ی ئەیلوولی ١٩٤٥ لەلایەن سەرۆک هۆ چی مین لە گۆڕەپانی با دین لە ها نۆی خوێندرایەوە. ئاژانسی ناوەندیی دەنگوباسی کۆریا KCNA کە ئاژانسی حکوومەتیی کۆماری دیموکراتی گەلی کۆریایە لە ٥ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٦دا دامەزرا. وەک قسەکەرێکی پارتی کرێکارانی کۆریا و حکوومەتە و بارەگای سەرەکیی لە پیونگیانگی پایەتەختی کۆریایە.

لە هیندستان بیرۆکەی وەرگرتنەوەی دەسەڵاتی ڕۆیتەرز لەلایەن ئەسۆشیێتد پرێسی هیندستانەوە API لە ساڵی ١٩٤٦دا باس کرا، باسکردنەکە لە کۆبوونەوەیەکی کۆمەڵەی ڕۆژنامەکانی هیندستان و خۆرهەڵات بوو IENS کە لە خاوەن ڕۆژنامەکانی ناوچەکە پێک هاتووە، کۆبوونەوەکە لە لاهوور ئەنجام درا. دێڤداس گاندی لە هیندستان تایمز و کاستووری سرینیڤاسان لە هیندو و تووشار کانتی گۆش لە ئامریت بازار پاتریکا لەو کەسانە بوو کە پشتگیریان لەم بیرۆکەیە کرد. پرێس ترەستی هیندستان PTI لە ٢٧ی ئابی ١٩٤٧ لە مادراس دامەزرا. لە ساڵی ١٩٤٨ پرێس ترەستی هیندستان کە کۆمەڵەی ڕۆژنامەکانی هیندستانە لەگەڵ

ڕۆیتەرزدا گەیشتە ڕێککەوتنێکی سێ ساڵی کە ئەسۆشیێتد پرێسی هیندستانی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی و بووە هاوبەشی ڕۆیتەرز و مافی ئەوەی هەبوو لە هەموو جیهاندا هەواڵ کۆ بکاتەوە و بڵاو بکاتەوە. لە یەکی شوباتی ١٩٤٩وە PTI دەستی بەکارەکانی خۆی کرد. لە ساڵی ١٩٥٣شەوە PTI بووە ئاژانسێکی سەربەخۆ دوای ئەوەی دەستەی کارگێڕیی PTI لەسەر بنەمای تاقیکردنەوەکانی کار، پێشنیازەکانی ڕۆیتەرزی ڕەت کردەوە.

ئەسۆشیێتد پرێسی پاکستان AAP لە ساڵی ١٩٤٨ دامەزرا. سەرەتا وەک کۆمپانیایەک بەڕێوە دەچوو، بەڵام دوایی بەبڕیارێک حکوومەت لە ١٥ی حوزەیرانی ١٩٦١ دەستی بەسەردا گرت. لە میسر، ئاژانسی دەنگوباسی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست MENA لە ١٥ی کانوونی یەکەمی ١٩٥٥دا دامەزرا وەک کۆمپانیایەکی هاوبەش خاوەندارێتییەکەی هی دامەزراوەکانی ڕاگەیاندن بوو لەو وڵاتەدا. لە ساڵی ١٩٦٠دا MENA وەک دامەزراوەکانی تری ڕاگەیاندن بەنیشتمانی کرا و درایە پاڵ وەزارەتی ڕاگەیاندنەوە. لە ساڵی ١٩٧٨ MENA بووە دامەزراوەیەکی ڕۆژنامەوانیی نیشتمانی و وەک دامەزراوە ڕۆژنامەوانییە نیشتمانییەکانی تر، لکێنرا بەئەنجوومەنی شووراوە. ئاژانسی پاکستان پرێس ئینتەرناشناڵ PPI کۆمپانیایەکی سنوورداری کەرتی تایبەت بوو، بارەگای سەرەکیی لە کاراچی بوو، لە ساڵی ١٩٥٦ دامەزرا. ئاژانسی پرێنسا لاتینا PL کە بارەگای لە هاڤانای کووبایە لە ١٥ی حوزەیرانی ١٩٥٩ دامەزرا دوای سەرکەوتنی شۆڕشی کووبا بەماوەیەکی کورت. ئاژانسی مەغریبی عارەبی MAP ساڵی ١٩٥٩ لە مەراکیش دروست کرا. ئاژانسی دەنگوباسی جەزائیر APS لە ١ی کانوونی یەکەمی ١٩٦١ لەگەڵ سەرهەڵدانی شەڕی ڕزگاریخوازیی نیشتمانی دامەزرا بۆ ئەوەی ببێتە هەڵگری پەیامەکەی لە گۆڕەپانی میدیای جیهاندا.

ئاژانسی دەنگوباسی گانا GNA ساڵی ١٩٥٧ وەک یەکەمین ئاژانسی دەنگوباسی ناوچەی بیابانی ئەفریقا دامەزرا، ئەم ئاژانسە بەلایەنداری بۆیان، پشکدار بوو لە پرۆسەی ئازادکردنی ئەفریقا و گانادا. بۆیە یەکەمین سەرۆکی گانا، دوکتۆر کوام نکوما، GNA ی بەڕاستکەرەوەی ئەو لاسەنگییە دانا کە لایەندارییی ئاژانسەکانی

نێودەوڵەتیی دەنگوباس دروستیان کردبوو. دوای ئەوەی بۆ ماوەی سێ ساڵ وەک وەزارەتێکی حکوومەت کاری کرد، GNA لە ١ی تەممووزی ١٩٦٠ (ڕۆژی ڕاگەیاندنی کۆماری گانا) بوو بەدەزگایەکی سەر بەحکوومەت.

ساڵی ١٩٥٧ هەوڵێک درا بۆ دامەزراندنی ئاژانسێکی نیشتمانیی دەنگوباس لە نایجیریا. ئەو ئاژانسە بڕیار بوو کۆمپانیایەکی هاوبەش بێ و خاوەنەکانی کۆمپانیا سەرەکییەکانی وەشان و ڕۆژنامەوانی بن لە نایجیریادا. بەڵام کاتێ دەیلی تایمز خۆی لە پرۆسەکە کێشایەوە، ئەو هەوڵە دووچاری شکست هات.

ڕێکخراوی فێرکردن و زانست و کولتووری نەتەوە یەکگرتووەکان (یونسکۆ) سەرپەرشتیی سێ کۆنفرانسی لەبارەی پێشکەوتنی میدیای زانیاری لە ئەفریقادا کرد، لە داکار لە ١٩٦١ و لە پاریس لە ١٩٦٢ و لە تونس لە ١٩٦٣دا. ئەم کۆنفرانسانە پێکهێنانی یەکیەتی ئاژانسەکانی دەنگوباسی ئەفریقایان لێ کەوتەوە. لەم شەپۆلی فرەوانبوونی ئاژانسانەدا لە ساڵانی ١٩٦٠ تا ١٩٦٢ ژمارەی ئەو ئاژانسانەی دامەزران گەیشتە ٢٣ دانە.

ڕێکخراوی ئاژانسەکانی دەنگوباسی ئاسیا OANA لە ٢٢ی کانوونی یەکەمی ١٩٦١ لە بانکۆک لە کۆبوونەوەیەکی ئاژانسەکانی ئاسیادا کە بەچاودێریی یونسکۆ ئەنجام درا ڕاگەیەنرا. بەشداربووانی کۆبوونەوەکە بریتیبوون لە ئانتارا و APP و باختار و CNA و کیۆدۆ و PNS و PTI و ئۆریێنت پرێس و VP و وەزیرانی ڕاگەیاندنی سیلان و ئێران و مالیزیا و نیپال و، کۆمەڵەی ڕۆژنامەکانی تایلاند و، ٢٠ چاودێر، لەوانە ئەسۆشیێتد پرێس و ڕۆیتەرز و فرانس پرێس و چمارەیەک لە ڕێکخراوگەلی سەر بەنەتەوە یەکگرتووەکان و ڕێکخراوە جیهانییەکانی ڕۆژنامەوانی.

بەگوێرەی ڕاپۆرتی ساڵی ١٩٧٥ی یونسکۆ لەبارەی گەیاندن لە جیهاندا، لە ٩٠ وڵاتی خاوەن سەروەریی جیهاندا ئاژانسی دەنگوباس هەن و، لە ٤٠ دەوڵەتدا ئەم ئاژانسانە نین کە ٢٥ لەمانە ژمارەی دانیشتووانیان لە یەک ملیۆن کەس زیاتر دەبێ. لە ٥٠ لەو ٩٠ وڵاتەدا ئاژانسەکانی دەنگوباس موڵکی حکوومەتن و لەو ٤٠ەی تریش ئاژانسەکان کۆمپانیای هاوبەشن موڵکی ڕۆژنامەکان و دەزگاکانی میدیان و لەلایەن ئەوانەوە بەڕێوە دەبرێن. لە ژمارەیەکی زۆری ئەو وڵاتانەدا، تەنانەت لەوانەشدا کە

ئاژانسـەكان خـۆیان بەسـەربەخـۆی و دوور لە سـیـاسـەت پیـشـان دەدەن، تارمـاییی دەوڵەت بەرادەیەكی ڕوون بەسـەر ئاژانسـەكانی دەنگوباسـەوە دیارە.

لە ١ی كانوونی یەكـەمی ١٩٥٣دا،ئینستـیتیـۆی نێودەوڵەتیی ڕۆژنامـەوانی، ئەو كات بارەگاكـەی لە زیوریخ بوو، ڕاپۆرتێكی دەركرد لەبارەی لێشـاوی هـەواڵ، ئەم ڕاپۆرتە بریتـی بوو لە تۆژینەوەیەک بەهـاوكـاریی نووسـیـاران و بەڕێوەبـەرانی ئاژانسـەكـانی دەنگوباس و هـەواڵنێرانی دەرەوە لە دە وڵاتدا، هـەشـتـیـان لە ئەوروپای ڕۆئاوا بوون و دوانەكـەی تر لە ئەمـەریكا و هـیندسـتـان. ئـەم ڕاپۆرتە كـە لایـەنێكی ڕۆژنامـەوانی بۆ ڕۆژنامەوانیی ئامادە كردبوو ئاماژە بۆ نەبوونی هـاوسـەنگی لە وێنەی ڕۆژنامەوانی لە وڵاتێكی تردا دەكـا. هـەروەهـا ئەوەش دەخـاتە ڕوو كـە داپۆشینی ئاژانسـەكانی هـەواڵ بەزۆری جـەخت لەسـەر چەند وڵاتێكی دیاریكراو دەكـەنەوە، ئەمـەریكا و بریتـانیـا و ئەڵمانیا و فرانسە و یەک یا دوو وڵاتی تریش، هـەروەهـا جەخت لەسـەر ئەو ڕێكخراوە نێودەوڵەتییانەش دەكەنەوە كە ئەم وڵاتانە تیایاندا ئەندام و بەشدارن.

پرسـیـار لەبارەی لێـشـاوی گـونجـاو و دادوەری زانیـاری بۆ هـەمـوو وڵاتەكـان، پێشكەوتوو و ناپێشكەوتووەكان، لە چوارچێوەی نەتەوە یەكگرتووەكاندا خرایە بەر لێكۆڵینەوە. ئەنجوومەنی گشتیی نەتەوە یەكگرتووەكان لە دانیشتنی هـەفتەمی ساڵی ١٩٥٢ بڕیاری دا ئامـارێک لەبارەی میدیا گشـتییـەكانەوە بكرێ و ئەم ئەركە خستە ئەسـتـۆی یونسكۆوە. سـاڵی ١٩٥٧ بـەڕێوەبەری گـشـتـیی یونسكۆ نـەگـونجـاویی زانیارییەكانی لەمەڕ ئەم بابەتە ڕاگەیاند و ئەوەشی گوت هـەر كاتێ باری ڕاستەقینە بەتەواوی زانراو نەبێ مـەحـاڵە هیچ پرۆگرامـێک ئامـادە بكرێ. دوابەدوای ئەمــە چەندین كۆنفرانس لە ناوچەگەلی جیاجیا پێویستیی پێشخستنی میدیای ناوخۆ و هـاندانی هـاوبەشـیی نێـودەوڵەتـیـان لەم بوارەدا ڕاگـەیاند، بەتایبـەتی لە وڵاتـانی جیهانی تازە پێگەیشتوودا.

## NAM و NWICO

یەکەمین کۆنفرانسی فەرمی و بگرە گرینگترینیان کە لەنێوان حکوومەتگەلدا گرێ درابێ کۆنفرانسی بلۆکی ئەفرۆئاسیایی بوو ساڵی ١٩٥٥ لە باندونگی ئیندۆنیسیا ئەنجام درا. ئەم کۆنفرانسە بەگشتی وەک کۆبوونەوەی دامەزراندنی بزووتنەوەی بێلایەن NAM دەژمێررێ. زۆربەی ئەو ٢٩ وڵاتەی لەو کۆنفرانسەدا بەشدار بوون تازە لە چنگی کۆلۆنیالیزم رزگاریان بووبوو و ئەو بۆچوونە دژە کۆلۆنیالیزمانەی لەوێ دەربڕان زۆر بەهێز بوون، ڕاگەیاندنی کۆتایی کۆنفرانسەکەی باندونگ لە چەندین ئاست و بۆنەدا نەفرەتی لە کۆلۆنیالیزم کرد و کۆلۆنیالیزمی بەوە ناوبرد کە "هۆکارگەلێکە بۆ چەوساندنەوەی کولتووری" و بەوەش ناساندی کە "ملکەچکردنە بەخەڵک بۆ کۆیلایەتی بۆ بێگانە و باڵادەستی و قازانجی بێگانە". کاتی دامەزراندنی NAM بواری زانیاری بەپێی پێویست گرینگیی پێ نەدرا. هەرچەندە لە ڕاگەیاندنی لووتکەی بەلگراددا ئاماژەگەلێک بەدی دەکرێن بۆ "پێشکەوتنی کولتوور" و "ئاڵوگۆڕکردنی نێوان کولتوورەکان". یەکەمین باسکردنی ڕوونی پرسگەلی پێوەندیدار بەمیدیاوە لە بەرنامەی کاری هاوکاریی ئابووریدا بەدی دەکرێن، ئەم بەرنامەیەش لە کۆبوونەوەی سەرانی وڵات و حکوومەتەکان لە جەزائیر (لە ٥ تا ٩ی ئەیلوولی ١٩٧٣) لەلایەن NAMەوە پەسەند کرا:

١- پێویستە وڵاتانی گەشەکردوو بەیەکەوە کار بکەن لە بواری گەیاندنی گشتیدا بۆ ئەوەی پێوانەی هاوبەشیان لا گەڵاڵە ببێ تاکو ئاڵوگۆڕی هاوبەشی بۆچوونەکان لە نێوانیانیاندا بەهێزتر ببێ، بۆچوونەکانیش هەڵقوڵاوی ئەم پرنسیپانەن:

أ- داننان بەو تۆڕی گەیاندنانەی ئێستا هەن و وەک میراتییەک لە ڕابردووی کۆلۆنیالەوە بۆمان ماونەتەوە و کۆلۆنیالیزم ڕێی پێیان نەدەدا بەئازادی و ڕاستەوخۆ و خێراییەوە کاری گەیاندن ئەنجام بدەن.

ب- دەستپێشخەری بۆ دانانی پێوانەی هاوبەش لەپێناو پێداچوونەوەی ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکان بۆ هەموارکردنی نرخی هەواڵەکان و دابینکردنی گەیاندنی خێراتر و هەرزانتر.

ج- گرتنەبەری ڕێوشوێنی بەپەلە بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی وەرگرتنی بەکۆمەڵ لە سەتەلایتەکانی (مەبەستمان لە سەتەلایت لێرە و لە هەر شوێنێکی تری داهاتووی ئەم کتێبە مانگی دەسکردە- وەرگێڕ) گەیاندنەوە و داهێنانی بەرنامەیەکی کار بۆ دیاریکردنی شێوەی بەکارهێنانیان.

د- پێویستە پێوەندیی توندوتۆڵتر لە نێوان ئاژانسەکانی دەنگوباس و زانکۆکان و کتێبخانەکان و دەزگاکانی پلاندانان و تۆژینەوە و پەیمانگەگەلی تریش کاری بۆ بکرێ، تا وڵاتانی گەشەکردوو بتوانن ئەزموون و زانیارییە تێکنۆلۆجییەکانی خۆیان ئاڵوگۆڕ بکەن و بیرۆکەی هاوبەش داهێنن.

٢- پێویستە وڵاتانی بێلایەن زانیاری لەمەڕ دەستکەوتە هاوبەشەکان لە گشت بوارەکان و لە ڕێی ڕۆژنامە و کۆوار و ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و میدیاکانی زانیاریی وڵاتەکانیانەوە بگۆڕنەوە و بڵاو بکەنەوە.

"پێویستە پلان داڕێژن بۆ هاوبەشی لە ئەزموون لە چوارچێوەی ڕێکخراوەکەدا و بۆ ئەم مەبەستە لە پاڵ شتی تردا دەبێ سەردانی شاندگەلی پسپۆڕانی میدیای زانیاری لە نێوان وڵاتەکانیدا ڕێک بخەن، هەروەها لە ڕێی بەرنامەیەکی ئاڵوگۆڕکردنی فۆتۆگراف و شاندی کولتوور و فیستڤاڵی هونەریی تایبەت بەم مەبەستە".

لە کانوونی دووەمی ١٩٧٥دا ئاژانسەکانی دەنگوباسی ١٢ لە وڵاتانی بێلایەن بەهیوایەکی گشتیی ئاڵوگۆڕی دوولایەنەی زانیاری کۆمەڵەیەکیان دروست کرد (بەناوی پوول = گۆم). لەنێو ڕاپۆرتەکانی سەرەتای پوولدا وتارەکانی ١٧ لە سەرکردەکانی دەوڵەت و حکوومەتیان تێدا بەدی دەکران. سێ مانگ دوای ئەمە، نووسینگەی ڕێکخەریی وڵاتانی بێلایەن کە لە هاڤانا کۆ بووەوە، خۆشحاڵیی خۆی بۆ ئەم دەستپێشخەرییە دەربڕی و پشتیوانیی سیاسی و ئەخلاقیی خۆی بۆ پێشخستنی پوول دەربڕی. لە ئابی ١٩٧٥، تانجونگ بەکۆنفرانسی وەزیرانی دەرەوەی وڵاتانی بێلایەنی، لە لیمای پیرۆ، ڕاگەیاند کە ژمارەی ئاژانسەکانی بەشدار لە پوول گەیشتووەتە ٤٠ ئاژانس. کۆنفرانسەکەش بەخۆشحاڵییەوە باسی ئەو سەرکەوتنانەی کرد لە بواری بەهێز کردنی هاوئاهەنگیی نێوان وڵاتانی بێلایەن

له بواری میدیای گشتیدا بەدی هاتوون، یەکێکیش لەو سەرکەوتنانە دامەزراندنی پوولی ئاژانسەکانی وڵاتانی بێلایەن بوو لە کانوونی دووەمی ۱۹۷٥دا. هەر ئەم کۆنفرانسە بڕیاری دا کۆنگرەیەکی تایبەت بۆ نوێنەرانی حکوومەت و ئاژانسەکانی دەنگوباسی وڵاتانی بێلایەن ساز بکرێ بەمەبەستی ئامادەکردنی ڕەشنووسی دەستووری ئەندامانی پوول، هەروەها کۆنفرانسەکە دەستپێشخەریی هیندستانی پەسەند کرد بۆ میوانداریی کۆنگرەکە لە ساڵی داهاتوودا. وڵاتی تونسیش وەک ڕێکخەری ئەم بوارە دەستنیشان کرا. جگە لەمانەش کۆنفرانسەکە پشگیریی خۆی نیشان دا بۆ سازدانی کۆبوونەوەیەک سەبارەت بە میدیای وڵاتانی بێلایەن لە تونس.

لە کاتی خۆ ئامادەکردن بۆ کۆبوونەوەی نوێنەرانی حکوومەت و ئاژانسەکانی دەنگوباسی وڵاتانی بێلایەندا کە نیاز وا بوو لە هیندستان ئەنجام بدرێ، لە کۆتاییی کانوونی دووەمی ۱۹۷٦دا وۆرکشۆپێک بۆ ئاژانسەکانی دەنگوباسی هیندستان و تونس و یۆگۆسلاڤیا ئەنجام درا مەبەستی ئەو وۆرکشۆپە داڕشتنی ڕەشنووسی دەستوورێک بوو بۆ پوول. هەر دوای تەواوبوونی ئەم وۆرکشۆپە، لە مانگی ئاداری ۱۹۷٦، کۆبوونەوەکەی تونس بۆ هاوئاهەنگیی نێوان وڵاتانی بێلایەن لە بواری ڕاگەیاندندا گرێ درا.

سێ ساڵ دوای کۆنفرانسەکەی جەزائیر، ئەم کۆبوونەوەیەی لە تونس ئەنجام درا ڕێخۆشکەر بوو بۆ یەکەمین کۆنفرانسی وەزیرانی ڕاگەیاندنی وڵاتانی بێلایەن لە نیودێلهی. کۆنفرانسەکە نزیکەی ۲۰۰ بەشداربووی هەبوو، کەسایەتیی دیار بواری میدیای تێدا بوون لەگەڵ نوێنەرانی حکوومەتەکان و چالاکانی بوارەکانی گشتی و زانست لە زیاتر لە ٥۰ وڵاتەوە. کۆبوونەوەکە گەیشتە ئەو ئاکامەی کە وڵاتانی بێلایەن و گەشەکردوو پێگەی هاوشانی یەکیان لە لێشاوی نێودەوڵەتیی ڕاگەیاندن و سیستمەکانی ئێستای گەیاندندا نییە.

شاندی ٥۹ وڵات، بەسەرۆکایەتیی وەزیرانی ڕاگەیاندن و سەرۆکگەلی ئاژانسەکانی دەنگوباس و حەفت چاودێر لە یەکەمین کۆنفرانسی گشتیی پوولی ئاژانسەکانی دەنگوباسی وڵاتانی بێلایەن لە نیودێلهیی هیندستان، لە ۸ تا ۱۳ی تەممووزی ۱۹۷٦ ئامادە بوون. لە کاتی کردنەوەی کۆنفرانسەکەدا، سەرۆک وەزیرانی

هیندستان خاتوو ئیندیرا گاندی گوتی سەرەڕای جیاوازیی نائاساییی نێوان وڵاتانی بێلایەن، بەڵام یەک ڕابردووی هاوبەش ئەم وڵاتانە بەیەکەوە گرێ دەدا، هەروەها یەک ئەمرۆ و یەک داهاتووش. ئەم وڵاتانە هەموویان لە ژێر چەپۆکی کۆلۆنیالیزمدا ناڵاندوویانە _ لە ڕووی ئابوورییەوە سامانەکانیان دزراون و دووچاری سەرکوتکردنی کولتووری بوونەتەوە و لە ڕووی سایکۆلۆجیشەوە تووشی بێئومێدی هاتوون– ئەم ئازادییەشیان کە وەرگرتووەتەوە زۆر بەنرخە لایان. لەبەرئەوەی ئازادی بەبێ هێزی ئابووری ناپارێزرێ، بۆیە وڵاتانی بێلایەن پشکێکی گونجاویان لە سامان و تێکنۆلۆجیاکانی جیهانیان دەوێ و دواڕۆژێک دەخوازن دوور لە شەڕ و ناکۆکی. بۆیە، ئەو گوتی ئەم ئامانجانە وایان کردووە بزووتنەوەی وڵاتانی بێلایەن یەکێ بێ لە بزووتنەوە مانادار و بەهێزەکانی مێژووی جیهان. ئەم بزووتنەوەیە لەسەر بنەما پۆزەتیڤەکانی متمانە و هیوا و ئامادەیی بۆ هاوکاری دامەزراوە. بەپێچەوانەی ئەمەشەوە، لایەنداری نێگەتیڤ بوو، هەر هیچ نەبێ لەبەرئەوەی گەلەکۆمەک بوو لە دژی ئەوانی تر. خاتوو گاندی ئەوەشی گوت کە وڵاتانی بێلایەن هێشتا بەهۆی ڕابوردووی کۆلۆنیالیانەوە کەمئەندامن. "ئەو زمانە ئەوروپاییەی ئێمە قسەی پێ دەکەین خۆی ئامرازێکی مل پێ کەچکردن بوو... ئێمە پڕ کراوین لە شتە زیانبەخشەکانیان. تەنانەت دیدی ئێمە بۆ خۆمان، گەر بۆچوونی خەڵکی تر بەرامبەر بەئێمە بخەینە لاوە، تا ڕادەیەکی زۆر هاوشێوەی دیدی ئەوانە بۆ ئێمە".

کۆنفرانسەکە بەوە گەیشت کە ئەو نایەکسانی و ناهاوسەنگییە گەورەیەی بەسەر جیهانی ڕاگەیاندندا زاڵە ئاکامی ئەوەیە کە هۆکارەکانی گەیاندن و زانیاری چڕ بوونەتەوە بەدەستی چەند ئاژانسێکی کەمی دەنگوباسی چەند وڵاتێکی پێگەیشتوو. ئەو ئاژانسانەش بڕیار دەدەن چ هەواڵگەلێک گرینگییان پێ دەدرێ و چۆن بەگرینگییەوە دەدرێنە وڵاتانی تری جیهان. خەڵک لە وڵاتانی پێگەیشتوو، بەتایبەتی لە وڵاتانی بێلایەن، وایان لێ هاتبوو خەڵکی تر و بگرە خۆشیان بەچاوی ئەو ئاژانسانەی دەنگوباس ببینن. ڕاگەیاندنی جیهانیش بەشێوەیەکی خراپ هەوڵەکانی وڵاتانی بێلایەنیان دەخستە ڕوو لە بواری هەوڵدان بۆ جیهانێکی ئارام و بڵاوکردنەوەی دادپەروەری و داهێنانی یاسایەکی ئابووریی دادپەروەر لە جیهاندا و

بگره هەوڵیان دەدا ئەم بزووتنەوەیە لەت بکەن.

وڵاتانی بێلایەن بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم بارە بڕیاریان دا زیاتر پشت بەخۆ ببەستن. بۆ ئەمەش پێیان وا بوو دامەزراندنی یاسایەکی نوێی نێودەوڵەتی بۆ ڕاگەیاندن بەقەد یاسای نوێی نێودەوڵەتیی ئابووری گرینگە. هەروەها وای بۆ چوون کە پوول هەنگاوێکی گرینگە بەرەو داڕشتنی یاسایەکی جیهانیی نوێ بۆ ڕاگەیاندن NIIO. کۆنفرانسەکە ڕاگەیاندنێکی دەرکرد و دەستوورێکی بۆ پوول پەسەند کرد بەمەبەستی ئاسانکردنی بڵاوکردنەوەی زانیاریی ڕاست و واقیعییانە لەبارەی وڵاتانی بێلایەنەوە.

کۆنفرانسی پێنجەمی سەرانی وڵات و حکوومەتەکانی وڵاتانی بێلایەن لە کۆلۆمبۆی سری لانکادا گرێ درا لە ١٦ تا ١٩ی ئابی ١٩٧٦، ئەم کۆنفرانسە خۆشحاڵیی خۆی بەڕاگەیاندنی کۆنفرانسی هیندستان دەربڕی و ڕاگەیاندنەکە و بڕیارەکانی تری کۆنفرانسەکەشی پەسەند کرد و بەهەنگاوی گرینگی دانان بۆ پتەوکردنی هاوئاهەنگیی نێوان وڵاتانی بێلایەن لەپێناو بڵاوکردنەوەی هەواڵ و زانیاری بەشێوەیەکی دادوەرانە و بەگوێرەی پێویست بەسەر هەموو خەڵکی جیهاندا. گوتراوە کە ڕزگاری و پێشکەوتنی میدیای نەتەوەیی تەواوکەری تێکۆشانی گشتیی نەتەوەیە لە پێناو سەربەخۆیی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی. پێڕۆی پوولی ئاژانسەکانی دەنگوباسی وڵاتانی بێلایەن لە لووتکەی کۆلۆمبۆدا پەسەند کرا. "لە کاتی کۆنفرانسی جەزائیرەوە ئێمە سەرقاڵی داڕشتنی پرۆگرامی هاوئاهەنگیی نێوان وڵاتانی بێلایەنین. ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە سەرچاوە و شارەزاییەکانی خۆمان لە گۆمێکدا کۆ بکەینەوە. پوولی ئاژانسەکانی دەنگوباسی بێلایەن نموونەیە بۆ پابەندبوونمان بەوەی لە یەکتر ئاگەدار بین نەک تەنیا لە بواری سیاسەتدا بگرە لە ئابووریشدا".

گفتوگۆ لەسەر یاسایەکی نوێی جیهانی بۆ گەیاندن و زانیاری NWICO بەرەو جاختکردن لەسەر موڵکداریی میدیا و گفتوگۆ لەسەر ئەو بیرۆکانەی زانیاری بەکاڵایەکی بازرگانی دەژمێرن و ئەوانەی بەخزمەتگوزارییەکی گشتیی دەژمێرن و لەبارەی ئازادکردنی زانیارییەوە ئاخۆ مافی تاکە یاخۆ کۆمەڵ. گفتوگۆ لەسەر NWI-

CO له زۆربەی حەفتا و هەشتاكانی سەدەی بیستدا لە هۆڵەكانی نەتەوە یەكگرتووەكاندا و بەتایبەتی ئەوانەی یونسكۆدا درێژەی هەبوو. هەردوو لایەنگران و دژەكانی NWICO ئەو پێشەكییەیان قبووڵ بوو كە پێشكەوتنی ئابووریی بەبەردەستبوونی زانیاری دەبەستەوە.

خەڵكی لیبراڵی تیۆری پێیان وا بوو كولتووره نەتەوەییەكان و سەروەری بەچڕبوونەوەی زانیاری ناكەونە بەر مەترسی، كەچی بنیاتگەر و سۆسیالیستەكان پێیان وایە دەكەونە بەر مەترسییەوە. لایەنگرانی NWICO زۆربەیان لە خەڵكی وڵاتانی بێلایەن بوون و پێیان وا بوو موڵكداری و كۆنتڕۆڵی ڕۆئاوا بەسەر میدیا و كەناڵەكانی بڵاوكردنەوەی هەواڵ جۆرێكە لە باڵادەستیی كولتووری و ئامانجی شاراوەشی بریتییە لە فرەوانكردنی ئابووریی سەرمایەداری. ئەم بۆچوونە كە لە كۆنفرانسەكانی بزووتنەوەی وڵاتانی بێلایەن و ئەوانەی یونسكۆ دەخرایە ڕوو پاڵپشتیی یەكییەتی سۆڤیێتی بەدەست هێنا لە تەك دوژمنایەتیی حكوومەتە ڕۆئاواییەكاندا. ئەمەش بەشێكی بۆ ترس لە بەسیاسیكردنی یونسكۆ دەگەڕایەوە كە ئەمەریكا و بریتانیا لە ناوەڕاستی هەشتاكاندا لێی كشانەوە.

هەوڵی تر هەبوون بۆ دۆزینەوەی جێگرەوە و گرینگترینی ئەو هەوڵانە لە بواری ئاژانسەكانی دەنگوباسدا ئینتەر پرێس سێرڤس IPS بوو، كە لە ساڵی ١٩٦٤ لەلایەن گرووپێك ڕۆژنامەوانەوە، لەوانە ڕۆبێرتۆ ساڤیۆ، وەك كۆمپانیایەكی هاوبەش دامەزرا.

لە ١٩٦٤ەوە تا ١٩٦٨ خزمەتی ژمارەیەك لە حكوومەتەكانی ئەمەریكای لاتینی كرد، بەمەستی هێنانە كایەی دیالۆگێك لەنێوان ئەوروپا و ئەمەریكای لاتین لە پێناو بەهێزكردنی تێگەیشتن لەو پرۆژانەی هەمان پێگەی سیاسییان هەیە. لە نێوان ١٩٦٨ و ١٩٧١ باری سیاسی گۆڕانی گەورەی بەسەردا هات و زۆر لە نووسینگەكانی IPS داخران. لە ١٩٧١یشەوە IPS بووە ئاژانسێكی تایبەتمەندی هەواڵ و ئامانجەكەی ئەوە بوو ببێتە ئاژانسێكی جیهانی سێیەم. لە ناوەڕاستی هەشتاكاندا IPS هەواڵنێری لە ٥٠ وڵات هەبوو جگە لە هاوكارگەلێك كە بەشێوەیەكی ڕێكوپێك لە ژمارەیەكی زۆری پایەتەختی وڵاتانەوە ڕاپۆرتیان بۆی

دەنارد. لە ماوەی سێ دەیەدا، خزمەتگوزارییەکانی IPS لە ڕێی ئینتەرنێت و بنکەی زانیاریی ئیلیکترۆنی و بەڵاڤۆکی چاپکراوەوە بەخەڵک دەگەیشتن. هەروەها بنکەی نووسیاری و کارگێڕیی لە ئاسیا و ئەفریقا و ناوچەی کاریبی و ئەمەریکای لاتین و ئەمەریکای باکوور و ئەورووپا هەیە و جیاوازیی کولتووری لە راپۆرتەکانی خۆیدا لەبەرچاو دەگرێ. لە بارەگا جیهانییەکەیەوە لە ئەمستەردامی هۆڵەندا، IPS خزمەتگوزارییە جیهانییەکانی خۆی ڕێک دەخست و لەگەڵ زۆریی گرفتە داراییەکانیش IPS هێشتا ماوە و کار دەکا. خزمەتگوزاریی جیهانیی ڕۆژانە ٣٠ راپۆرت ئامادە دەکا لەسەر ڕووداو و پرۆسەگەلی پەیوەست بەژیانی خەڵک و نەتەوەکانی باشوور. زمانە بنەڕەتییەکانی ئەم ئاژانسە ئینگلیزی و ئیسپانیایین. ڕاپۆرتەکانیش وەردەگێڕێنە چەندین زمانی تر و بەشێوەیەکی بەربڵاو بڵاو دەکرێنەوە. IPS ساڵی ١٩٩٤ دەستی بەبڵاوکردنەوە لە ئینتەرنێت کرد بەبەکارهێنانی ماڵپەڕێک لە کۆمپانیای تێلێنوری نەرویج. ماڵپەڕەکە (دەروازە جیهانییەکە) بنکەکەی لە ڕۆمایە و ساڵ ١٩٩٦ دەستی بەکار کرد و ساڵی ١٩٩٩ هاوشانێکی بەزمانی ئیسپانیایی لە مۆنتیڤیدیۆ بۆ بەرهەم هێنرا. لە ڕێی ڕێککەوتن لەگەڵ چەند دەروازەیەکی تۆڕی ئینتەرنێتدا بوونی خۆی لەم تۆڕەدا بەهێز دەکا، لەوانە وەن وۆرلد ئۆنلاین. هەروەها ئارشیڤێکی هەیە لە ساڵی ١٩٩٤ەوە و دەتوانی بەنووسینی تەنیا وشەیەک بەناویدا بگەڕێی. هەر کەسێک سەردانی ماڵپەڕەکە بکا ناونیشان و دێری یەکەمی هەر بابەتێک دەبینێ، بەڵام تێکستی تەواو تەنیا بۆ ئەو بەشدارانەیە کە ئابوونە دەدەن. نەخشەسازییەکی بەشێوەی گرافیک هاوکاریی ئەو کەسانە دەکا کە پێوەندییان بەئینتەرنێتەوە خاوە. ڕۆژانە ٧٠٠٠ کەس زۆربەیان لە ئەمەریکاوە سەردانی ماڵپەڕەکە دەکەن. هەروەها IPS زیاتر لە ٥٠٠٠ کۆمەڵە هەواڵی تایبەت بۆ بەشداربووان دەنێرێ کە زۆرینەیان فەرمانبەری ڕێکخراوە ناحکوومییەکان و نەتەوە یەکگرتووەکان و یەکیەتی ئەورووپان و پەیمانگە و کەسایەتیی میدیایی و فێرکاری و کتێبخانە و کۆمپانیای بازرگانی و وەزارەتی حکوومەتن.

بڵاوکردنەوە لە ڕێی دەروازەکانی ئینتەرنێتەوە بەشێوەیەکی فروان گەیشتن بەخزمەتگوزارییەکانی IPS زیاد دەکا. ئێستا IPS و وەن وۆرڵد و پانۆس ئینستیتیوت

بەیەکەوە کار بۆ نەخشەڕێژیی رادیۆی ئینتەر وۆرڵد دەکەن بۆ بڵاوکردنەوەی دەقی هەواڵەکان بەسەر ئێستگەی رادیۆکاندا بەشێوەیەک ئامادەی وەشانکردن بن. لە ئەمەریکا کەناڵی سەرەکیی بڵاوکردنەوە گڵوبەڵ ئینفۆرمەیشن نێتوۆرکە GIN کە رۆژانە ٧٠ راپۆرتی ئینگلیزی و ئیسپانیایی بەسەر زیاتر لە ٣٠٠ کڕیاردا دابەش دەکا کە دوو سێیییان رۆژنامەی ئەمەریکاییی ئەفریقاین و زۆربەی خوێنەرانیان توانای بەکارهێنانی تۆڕی ئینتەرنێتیان نییە. هەندێ ئاژانسی نیشتمانی (وەک OPECNA و QNA و WAM) IPS بۆ گەیشتن بەکڕیاری زیاتر بەکار دەهێنن. هەروەها ئینتەرنێت پێوەندیی نێوان هەواڵنێر و نووسینگەکانی IPS ئاسان دەکا.

لە برازیل گرووپگەلی رۆژنامەکان ئاژانسی دەنگوباسی خۆیان دروست کردووە. بۆ نموونە ئەجێنسیا ئێستادۆ سەر بەگرووپی ئێستادۆیە و هەواڵ و زانیاری لە ڕێی فاکس و مانگی دەسکرد و ئێف ئێم و هێڵی تایبەتەوە بڵاو دەکاتەوە. ئەم ئاژانسە ساڵی ١٩٧٠ دامەزراوە وەک بەشێک لە گرووپی ئێستادۆ، کە ساڵی ١٨٧٥ بەبڵاوکردنەوەی رۆژنامەی ئۆ ئێستادۆ دەستی پێ کرد، هەروەهاجۆرنال دا تاردە (١٩٦٦) و ئۆویسپ میدیا دیرێتا (١٩٨٤) و رادیۆ ئێلدۆرادۆ (١٩٥٨) و ئاژانسی ئێستادۆ (١٩٧٠) ئۆویسپ گرافیکا (١٩٨٨). ساڵی ١٩٩١ ئەم ئاژانسە دەستی بەخزمەتگوزارییەکی وەشانکردن کرد و ساڵی ١٩٩٥ برازیل فایناشناڵ وایەر و ساڵی ١٩٩٨ ریلیز ئۆنلاین و هەر ئەو ساڵە ئینفۆکاست. بەهەمان شێوەش ئاژانسی ئۆ گلۆبۆ ساڵی ١٩٧٤ دامەزرا، ئەمیش بەشێکە لە ڕێکخراوی گلۆبۆ کە خاوەنی تۆڕێکی مەزنی وەشانی تەلەفزیۆن و کۆمپانیایەکی بڵاوکردنەوە و تۆڕێکی رادیۆ و بەشی ئینتەرنێت و سێ رۆژنامەیە. ئەو بابەتانەی ئۆ گلۆبۆ بڵاویان دەکاتەوە بابەتەکانی سێ رۆژنامەکە ئۆ گلۆبۆ و ئێکسترا و دیلریۆ دی سانت پاولۆ لەخۆ دەگرێ شان بەشانی نوێترین هەواڵەکان کە لە ڕێی بەشی ئینتەرنێتەوە، گلۆبۆ ئۆن لاین، بڵاو دەکرێنەوە.

## ئەفریقا و ئەمەریکای لاتین

لە سەرەتای هەشتاکانەوە، یونسکۆ پشتگیریی دامەزراندنی ئاژانسگەلی دەنگوباسی نیشتمانیی کردووە بەمەبەستی باشترکردنی پرۆسەی کۆکردنەوە و

بڵاوکـردنەوەی هەواڵ لە وڵاتاندا و زیادکـردنـی جـۆراوجـۆریەتـی لە سـەرچاوەکـانی هەواڵ. ئەم پرۆژانە CANAD (پرۆژەی پێشـخسـتنی ئاژانسـەکـانی دەنگوباسی ناوەڕاستی ئەفریقا) و SEANAD (پرۆژەی پێشخستنی ئاژانسەکانی دەنگوباسی باشـوور و ڕۆژهەڵاتی ئەفـریقـا) و WANAD (پرۆژەی پێشـخسـتنی ئاژانسـەکـانی دەنگوباسی ڕۆژئاوای ئەفـریقـا) پرۆژەی دەسـتـەجـەمـعین بۆ دروسـتکردن یاخـۆ هاوکاریکردن بۆ مانەوەی ژمارەیەکی بەرچاوی ئاژانسە نیشتمانییەکانی دەنگوباس لە ئەفریقا لە هەشتاکان و نەوەتەکاندا (١٣ ئاژانس لە لایەن WANAD و ١٢ لە لایەن SEANADەوە). لەگـەڵ ئەمـەشـدا پرۆژەکـان توانایان نەبوو تەنیـا یەک نموونەی دەسـتـێـوەردانی گـونجـاو بخـەنە ڕوو لەبەرئەوەی بارودۆخی هەر وڵاتێک و هەر ئاژانسێک زۆر جیاواز بوو لەوەی تر. لە زیمبابوی، ئاژانسی دەنگوباسی نیشتمانی، زیانا، بەهێز بوو، کەچی ئاژانسەکەی تانزانیا، شیهاتا، نیوە مردوو بوو (ئێستا لەناو چووە). جگە لە مەشق پێکردن، ئەم پرۆژانە بەدابینکردنی کەلوپەل هاوکاری دەکـران هەر لە سـەرەتاییـترین تێکنۆلۆجـیـاوە (وەک ئامـێـری تایپ) تا دەگـاتە پێشکەوتووترین جـۆرەکـانی کـۆمـپـیـوتەر. ئاڵوگۆڕی دەنگوباس بوارێکی تری ئەم چالاکییانە بوو. SEANAD لە ڕێی تەلەفۆنەوە هاوکاریی پێشکێش دەکرد لە بواری دیزاینی سندووقی پۆستی ئیلیکترۆنی، ئەمە سیستمێک بوو کە لە کۆتاییدا کرا بە سۆفتوێرێک بۆ نووسین و بەفایلکردن و گۆڕینەوەی بابەتی هەواڵ. سێرڤەرەکە لە زیمبابوی بوو و ئاژانسەکانی تر کۆمپیوتەری کەسی PC یان پێ درابوو: ئاژانسەکان تەنیـا پێـوەندییـان بەسـێـرڤـەرەکـەوە دەکـرد بۆ ئەوەی چیـرۆکـەهەواڵ بدەن و چیرۆکەهەواڵ کـۆ بکەنەوە. جـیـاوازی لە نێـوان وڵاتانی ئەفـریقـای فـرانکۆفـۆن و ئەفریقای ئەنگلۆفۆندا هەبوون. لەو ناوچانەی کاتی خۆی لەژێر دەستی فرانسەدا بوون، ئاژانسـەکـانی دەنگوباس وەک سندووقی پۆسـتـەی ئاژانسی فـرانس پرێس، تەنیـا ئاژانسی نێـودەوڵـتـیی دەنگوباسی فـرانسی زمـان، دەسـتـیـان بەکـار کـرد. ناوچەکانی تری دەسەڵات بەلجیکایی (وەک AZAP لە زایر) و پۆرتۆگالی (ئانگۆپ لە ئەنگۆلا) بوون. دەسـتـپێشـخـەرییەکانی یونسکۆ زۆر بوون، لەوانە پشتگیـریکردنی PANA41 (ئەفـریـقـا) و CANA (ناوچەی کـاریبی). ١٩٦٠ەکـانەوە تا ١٩٨٠کـان

بەگشتی ئاژانسە نیشتمانییەکانی دەنگوباس تێکەڵەیەکی سەختی نێوان سەربەخۆیی و پشتبەستن بەحکوومەتیان پیادە دەکرد، هەمیشە بابەتی سەرەکیی ئەو ئاژانسانە بریتی بوون لەو هەواڵانەی پێیان دەگوترێ هەواڵی پرۆتۆکۆلی. زۆر سەخت بوو دەست بەستافی بزێوەوە بگیرێ. بازاڕیان کز بوو و بەردەوام حکوومەت دەستی لە کاریان وەردەدا. هەرچۆنێک بێ، بەهاتنی ساڵی ٢٠٠٠ ئاشکرا بوو کە زۆر لە ئاژانسە نیشتمانییەکان لە تەنگژەدان.

لە زۆر حاڵەتدا، ئەو تێکنۆلۆجیایەی ئاژانسەکان بەکاریان دێنن زۆر کۆنن و لەو وڵاتانەی حکوومەتەکانیان گرینگیی بەرهەمی ئاژانسی دەنگوباس بەهەند هەڵناگرن ئاژانسەکان بەدەستی تێکەڵەیەک لە دەستێوەردانی سیاسی لە کارەکانیان و پشتگیریی کەمی داراییەوە لە گیانەڵادان. بۆ نموونە ئاژانسی دەنگوباسی نێو ئەفریقای زیمبابوی، زیانا، کە ساڵی ١٩٨١ دامەزرا ئاژانسێکی نیشتمانیی سەرکەوتوو بوو لەبەرئەوەی موڵکی هاوبەندیی میدیای زیمبابوی بوو کە بارەگاکەی لە هارارییە. بەڵام دوای ئەوە لەبەر هۆگەلی سیاسی ئەم ئاژانسە ڕاگیرا و لە جێی ئەمدا ئاژانسی نیو زیانا دامەزرا، ئەمیش لەبەر بێپارەیی سەرنەکەوت.

لە ساڵی ١٩٩٢دا ژمارەی ئاژانسە نیشتمانییەکان ٤٨ ئاژانس بوو، نزیکەی هەموویان لە ژێر دەسەڵاتی گشتیدا بوون لە ڕێی داوودەزگا حکوومەتییەکانەوە وەک وەزارەتی ڕاگەیاندن و هەندێ جاریش ڕاستەوخۆ سەر بەنووسینگەی سەرۆکی وڵات بوون. هەر لە سەرەتاوە وەک دەڵاڵێکی نیشتمانی کاریان کردووە و ئەو هەواڵانەیان بڵاو کردووەتەوە کە لە بنەڕەتدا لەلایەن ئاژانسەکانی ڕۆئاواوە دروست دەکران.

دوای ئەو تەنگژە سەختەی سەرەتای ١٩٩٠ەکان، ئاژانسی دەنگوباسی پان ئەفریکان PANA دەستی بەپرۆسەیەکی گۆڕانکاری لە بنیاتی خۆیدا کرد بەپێشەوایی میسر و نایجیریا کە یەک لە دوای یەک بەڕێوەبەرایەتیی دەستەی کارگێڕیی ئاژانسەکەیان دەکرد. ساڵی ١٩٩٣ بەچاودێریی سکرتێری گشتیی OAU و یونسکۆ پلانێکی چاککردنەوە دەست پێ کرا بەمەبەستی بەپیشەییکردنی ئاژانسەکە و جۆراوجۆرکردنی خزمەتگوزارییەکانی.

لە کۆتاییدا و بەپشتگیریی یونسکۆ PANA لە تشرینی یەکەمی ١٩٩٧دا

هەڵوەشێنرایەوە و لە جێی ئەودا کۆمپانیایەک بەناوی پاناپرێس لیمیتد دامەزرا، ئەم کۆمپانیایە تێکەڵەیەک بوو لەنێوان خاوەن پشکی گشتی و تایبەتدا و سەرمایەکەی لە سەرەتادا ١٢ ملیۆن و ٩٠٠ هەزار دۆلار بوو. ئێستا پاناپرێس لیمیتد کۆمپانیایەکی بازرگانییە و ٧٥٪ی موڵکی وەبەرهێنی کەرتی تایبەتی ئەفریقاییە و ٢٥٪ەکەی تریش موڵکی حکوومەتەکانی ئەفریقایە. بەهەواڵنێر و هاوکارەکانی کە لە ٥١ وڵاتدا هەن خۆی پابەند کردووە بە"پێشکێشکردنی وێنەیەکی ورد و بابەتی و خێرای خەڵک و سیاسەتەکان و بارودۆخی بازارەکانی ئەفریقا". بارەگا سەرەکییەکەشی لە داکاری سینیگالە. هەواڵ و بابەتەکانی پاناپرێس بەجۆرێک ڕیک خراون کە بگونجێن لەگەڵ خواستی تاک و ڕێکخراو و میدیای چاپکراو و بینراو و بیستراودا و دەکرێ لە ڕێی ئیمەیڵەوە یاخۆ سایتی پاناپرێسەوە وەرگیرێن.

هەروەها یونسکۆ پشتگیریی دامەزراندنی ئاژانسی دەنگوباسی کاریبی CANAی کرد، کە دامەزراوەیەکی سەربەخۆیە و خزمەتی ١٣ وڵاتی کومنوێڵتی کاریبی دەکا هەر لە بێلایزەوە لە باکور تا دەگاتە گویانا لە باشوور. ئەم ئاژانسە لە ٧ی کانوونی دووەمی ١٩٧٦ دەستی بەکار کرد وەک کۆمپانیایەکی هابەشی نێوان ١٦ ڕێکخراوی میدیا لە شەش لەو وڵاتانەدا، بارەگا سەرەکییەکەشی لە بریجتاونی باربادۆس بوو و هەر لەوێ تۆمار کرا وەک کۆمپانیایەکی بەرپرسیاریی سنووردار. خزمەتی نزیکەی ١٠٠ کڕیار دەکا لە ڕێی تەل و ڕادیۆ و ئینتەرنێتەوە و خزمەتگوزاریی وێنەی فۆتۆگرافی لە هەموو ناوچەی کاریبیدا هەیە. کۆمپانیای میدیای کاریبی CMC لە تێکەڵکردنی چالاکییە بازرگانییەکانی ئاژانسی دەنگوباسی کاریبی CANA و یەکیەتی وەشاندنی کاریبی CBU دروست بوو. فەرمانبەرێکی سەرەکی ڕاپۆرتەکانی ئاراستەی دەستەیەکی کارگێڕی دەکا کە لە هەردوو کۆمپانیاوە دروست کراوە، سەرۆکایەتیی CMC دەکا. ئەمەش ئەوە نیشان دەدا چۆن لەو ناوچانەی جیهانی پێگەیشتوودا کە لە ئابووری و بنیاتنەری تردا هاوبەشن، ئاژانسێکی ناوچەیی دەنگوباس لە ئاژانسێکی نیشتمانیی سەر بەتەنیا دەوڵەتێک زیاتر ئەگەری ژیان و پێشکەوتنی هەیە. CMC ئۆپەراسیۆنەکانی ئاژانسی نەریتیی دەنگوباس و ئینتەرنێت و ڕادیۆ و تەلەفزیۆن تێکەڵ بەیەک دەکا و بەردەوام لایەنی بازرگانی و فرۆشی

بەرهەمەکانی لە فرەوانبووندایە.

ڕەنگە پێویست بێ ئاماژە بۆ ئاژانسی دەنگوباسی ئەمەریکای لاتینیش LATIN بکرێ کە لە ١٣ی کانوونی دووەمی ١٩٧٠دا دامەزرا لەلایەن ١٣ گەورە ڕۆژنامەی ئەمەریکای لاتینەوە. دامەزرێنەران بانگهێشتنی ڕۆیتەرزیان وەک ڕێکخەرێک بۆ LATIN کرد لەگەڵ ئەوەش بەرپرسیاریی هەڵبژاردن و مەشقکردن بەرۆژنامەوانانی ئەمەریکای لاتین و ستافی بەڕێوەبەری و تەکنیکیی ئاژانسەکەیان بەسەریدا سەپاند لەگەڵ دامەزراندنی بنیاتی کارگێڕی و گەیاندنیشدا. لە یەکی تەممووزی ١٩٧١ کاتێ دەستی بەچالاکییەکانی خۆی کرد ٤٤ بەشداری ئابوونەدەری هەبوو و لە کانوونی دووەمی ١٩٧٧ ژمارەیان گەیشتە ١٥٦ LATIN هەواڵەکانی لە هەواڵنێرانی ئاژانسەکەوە لە ئەمەریکای لاتین و واشنتۆن کۆ دەکردەوە و هەواڵەکانی دەرەوەی لە ڕۆیتەرز وەردەگرت لەگەڵ پوختەیەک لە نیویۆرک تایمز. لە بنەڕەتدا ڕۆژانە ١٨ سات کاری دەکرد و لە تشرینی دووەمی ١٩٧٧ەوە ڕۆژانە ٢٤ سات کاری دەکرد و لە ئایاری ١٩٨١ەوە LATIN نەما.

## سەردەمی دوای شەڕی سارد

دوای ڕووخانی ڕژێمە کۆمۆنیستەکان لە ئەورووپای ڕۆژهەلات و هەڵوەشانەوەی یەکیەتی سۆڤێت و دواتر هەڵوەشانەوەی یۆگۆسلاڤیاش، شەپۆلێکی نوێی دامەزراندنی ئاژانسگەلی دەنگوباسی سەر بەکەرتی تایبەت شان بەشانی ڕێکخستنەوەی ئەو ئاژانسانەی هەبوون، سەری هەڵدا. ئاژانسەکانی سەر بەحکوومەتەکان پارەیان کەم کرایەوە. TASS بوو بە ITAR-TASS و ئاژانسەکانی کۆمارە جیاجیاکان ئێستا سەربەخۆن لە ئەنجامدانی هەر ڕێککەوتنێک لەگەڵ ئاژانسەکانی بێگانە و لەگەڵ ITAR-TASS یش. تانجونگ هێشتا ماوە بەڵام وەک جاران گرینگ نییە. ئاگرپس، دوای ڕێکخستنەوەی لە ٨ی کانوونی دووەمی ١٩٩٠ بووە ڕۆمپرس زمانحاڵی ڕۆمانیا وەک دەزگایەکی گشتیی بەرژەوەندیی نیشتمانی ڕێک خرا. لە سەرەتای ١٩٩٦ەوە ئاژانسی دەنگوباسی چیک CTK بەبێ هیچ هاوکارییەکی دەوڵەت یا هەر لایەکی تر دەرکەوت. هەموو خەرجییەکانی خۆی بەچالاکییە بازرگانییەکانی دابین دەکا. ئاژانسی دەنگوباسی بولگاریا ٥٠

نووسینگەی هەواڵنێرانی داخست و ئێستا بەتەواوی پشت بەئاژانسە نێودەوڵەتی و ناوچەییەکان دەبەستێ بۆ بەدەستهێنانی هەواڵی دەرەوە.

هەندێ دەستپێشخەریی کەرتی تایبەت سەرکەوتن و هەندێکی تریان دووچاری شکت هاتن. ئینتەرفاکس ساڵی ١٩٨٩ لەلایەن میخایل کۆمیسارەوە دامەزرا بەهاوئاهەنگیی ژمارەیەک لە هاوڕێیانی لە رادیۆی مۆسکۆ، ئەم ئاژانسە چیرۆکی سەرکەوتنێکی گەورەیە. ئاژانسی دەنگوباسی ئینتەرفاکس بەشێکە لە گرووپی خزمەتگوزاریی زانیاریی ئینتەرفاکس، کە پێک دێ لە نزیکەی ٣٠ کۆمپانیا لەوانە ئاژانسگەلی دەنگوباسی نیشتمانی و ناوچەیی و تایبەت. ئاژانسی دەنگوباس بەلتیک BNS لە مۆسکۆ لە نیسانی ١٩٩٠ دامەزرا لە گەرمەی تێکۆشانی وڵاتانی بەلتیک لەپێناو ئازادیدا بۆ ئەوەی ڕاستەوخۆ هەواڵەکانی سێ وڵاتەکەی بەلتیک بگەیەننە مۆسکۆ. لەو ڕۆژەشەوە BNS هەر لە گەشەدایە تا بووە گەورەترین و باشترین ئاژانسی دەنگوباسی ناوچەی بەلتیک. ئێستا ئەندامە لە گرووپی میدیاییی ئەلما لە فینلاند. ئاژانسی دەنگوباسی BETA کە بارەگاکەی لە بەلگرادە، ساڵی ١٩٩٢ لەلایەن نۆ ڕۆژنامەوانەوە دامەزرا بۆ ئەوەی "داپۆشینی تەواوی بابەتییانە لەسەر ڕووداوەکانی سربیا و مۆنتنیگرۆ و باشووری ئەورووپا" پێشکێش بکا. ئەم ئاژانسە بانگەشەی ئەوە دەکا کە ناوچەییە و سەر بەکەرتی تایبەتە و سەربەخۆیە و سایتێکی لە ئینتەرنێتدا هەیە بەناوی (دەستە پاکەکان) کە تایبەتە بەبابەتەکانی گەندەڵی لە سربیا و مۆنتنیگرۆ و دراوسێکانیان. دامەزراندنەکەی لەلایەن ڕێکخراوی ئایریکس بوو کە بارەگاکەی لە ئەمەریکایە (ئایاری ٢٠٠٢ تا کانوونی یەکەمی ٢٠٠٤) و هاوکاریی گەلی نەرویج.

لە ئاژانسە سەرەکییەکانی کە لە گفتوگۆکانی NWICOدا بەچوار گەورەکە ناو دەبران، AFP و AP لەسەر بناخەی تۆکمە وەستاون ئەویش بەهۆی بنیاتی خاوەندارییانەوە. لە یادی پەنجا ساڵەی دامەزراندنی UP دا لە ٢١ی حوزەیرانی ١٩٥٧ گۆواری تایم گوتی: "یەکەمین گەورە ئاژانسی دەنگوباسی ئەمەریکا کە بەکاری بازرگانی سەرکەوێ، ئەمڕۆ یونایتد پرێس گەورەترین بازرگانی بواری دەنگوباسە". ساڵی ١٩٧٨ UPI 7079 کڕیاری ئابوونەدەری لە سەرتاسەری جیهاندا

هەبوو، لەوانە ٢٢٤٦ لە دەرەوەی ئەمەریکا بوون و زیاتر لە ٣٠ ئاژانسی دەنگوباسی نیشتمانی و هی تریان تێدایە و ئەوانیش راپۆرتەکانی ئەم دەدەنە هەزاران رۆژنامە و دەزگای وەشان. لەناو ئەمەریکاش ١١٣٤ رۆژنامە و بەلاڤۆک کریاری UPIن و ٣٦٩٩ لە کریارەکانیش دەزگای وەشانن. ساڵی ١٩٨٢ خێزانی سکریپس UPIیان فرۆشت. بەڵێندەرانی تێنسی و دۆگلاس رووە و ویلیەم گیسلەر خزمەتگوزاریی هەواڵیان لە خاوەنەکانی زنجیرە رۆژنامەی سکریپس هاوارد سەند. کە ئەمان بوونە خاوەنی UPI بەردەوام پارەی لە دەست دەدا تا گەیشتە ئەوەی لە ١٩٨٥دا داوای پاراستنی لە مایەپووچ بکا. بارەگاکانی کۆمپانیاکە لە نیویۆرکەوە گوێزرانەوە واشنتۆنی پایەتەخت، لە ١٩٨٦دا بڵاوکەرەوەی مەکسیکی ماریۆ ڤازکویز رانا کریی و لە ئیفلاسی رزگار کرد. ساڵی ١٩٩١یش بۆدووەمین جار UPI لە ئیفلاس رزگار کرا بەکرینەوەی لە لایەن کۆمەڵێ وەبەرهێنی سعوودییەوە و چالاکییەکانی لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست فرەوان کرایەوە. ساڵی ٢٠٠٠ گرووپی میدیای نیوس وۆرڵد کۆمونیکەیشنز کە لە لایەن سەن مایونگ موونەوە دامەزراوە و رۆژنامەی واشنتۆن تایمز لەخۆ دەگرێ، UPIی کری. ئێستا بەرهەمەکانی بنەڕەتییەکانی UPI بەزمانەکانی ئینگلیزی و ئیسپانی و عارەبین. بارەگای سەرەکیی لە واشنتۆنی پایەتەختە و نووسینگەی لە بەیرووت و هۆنگ کۆنگ و لەندەن و سانتیاگۆ و سۆول و تۆکیۆدا هەیە.

هەرچەندە یونایتد پرێس یەکەمین ئاژانس بوو کە کلیپی هەواڵی تەلەفزیۆنیی بەئێزگەکانی تەلەفزیۆن دا، ئێستا ئەو بازاڕە بەدەستی رۆیتەرز و ئەسۆشیێتد پرێسەوەیە. یونایتد پرێس ساڵی ١٩٥٢ یەکەمین فیلمی تەلەفزیۆنیی نێودەوڵەتیی دروست کرد بەناوی یونایتد پرێس موڤیتۆن نیوس. لەم بوارەدا دوو بەرهەمی هەبوو یەکەمیان رۆژنامەی سینەمایی کە دەدرایە شانۆکان و ئەوەی تر فیلمی هەواڵەکان بوو کە بەسەر ئێزگەکانی تەلەفزیۆندا دابەش دەکرا. لە ١٩٦٣وە بوو بە UPI نیوس فیلم تا ١٩٦٧ کاتێ ITN هاتە پاڵیەوە و بوونە UPITN. کاتێکیش ABC کریی بووە WTN و لە کۆتاییدا بووە موڵکی دیزنی. لە چارەکی سێیەمی ١٩٩٩دا دیزنی بڕیاری دا چیی تر WTN بەشێک نەبێ لە بواری کاری ئەو و لەبەرئەوەی پێویستی بەپارە

هەبوو بۆ جێبەجێ کردنی پلانەکانی، کۆمپانیاکەی فرۆشت بەئەسۆشیێتد پرێس بە ٥٥ ملیۆن دۆلار. APیش لەگەڵ APTV تێکەڵاوی کرد و کردی بە APTN. ئاژانسێکی تری فیلمەهەواڵ ڤیسنیوس بوو ساڵی ١٩٥٧ وەک تاقیکردنەوەیەکی هاوبەشی BBC و رۆیتەرز و NBC دروست کرا. ساڵی ١٩٨٠ ڤیسنیوس نزیکەی ٣٠ بیرۆی لەوبەری دەریاکاندا هەبوو سەرەڕای ٤٠٠ کامیرامانی ئازاد. ساڵ ١٩٨٥ رۆیتەرزی دەوڵەمەند ڤیسنیوسی کڕی و ناوی نا تەلەفزیۆنی رۆیتەرز. بەڵام پەیدابوونی تەلەفزیۆنە جیهانییەکانی هەواڵ وەک CNN و BBC وۆرلد دەبوایە لەبەر چاو بگیرێ. هەرچەندە رەنگە ببنە کڕیاری APTN و رۆیتەرز بەڵام کەناڵەکانی خۆیان لە رێی سەتەلایت و کێبڵەوە بڵاو دەکرێنەوە و هەواڵ بەوەشانکەری زەوینی و لە رێی ئینتەرنێتەوە وەشان دەکەن.

چارلس لویس هاڤاس کە بازرگانیی ئاژانسەکانی دەنگوباسی داهێنا، هەرگیز بیر بۆ ئەوە نەدەچوو گەشەکردن و فرەجۆریی ئەم ئاژانسانە بەم شێوە فرەوانە لە ماوەی کەمتر لە دوو سەدەدا گەشە بکا. لەو سەردەمی کۆتر و تێلێگرافەدا کێ بڕوای بەوە دەکرد تەلەفۆنی مۆبایل و ئینتەرنێت دێنە کایەوە.

# دووەم

## ئاژانسەکانی دەنگوباس لە هیندستان

یەکەمین ڕۆژنامەی هیندستان کە ئەو هەواڵانەی بڵاو دەکردەوە لە ڕۆیتەرزەوە بەپۆست پێی دەگەیشتن ڕۆژنامەی بۆمبەی تایمز بوو. لە ٢١ی ئاداری ١٨٦٦ هنری کۆلنز گەیشتە بۆمبەی بۆ ئەوەی کاروباری چالاکییەکانی ڕۆیتەرز لە هیندستان ڕێک بخا. کۆلنز وەک نوێنەری بەرژەوەندییەکانی ڕۆیتەرز لە هیندستان و ڕۆژهەڵاتی دوور، نووسینگەیەکی دوو ژووریی لە شەقامی هۆرنبی ڕۆد لە بۆمبای دامەزراند. ئامانجەکە سەرنجڕاکێشانی ڕۆژنامە گەورەکان بوو، لە ڕێی گەیاندنی زانیاریی بازرگانی لەمەڕ بازاڕەکانی ڕۆژهەڵات و بازاڕەکانی بێگانە بەبازرگان و سەوداکەرانی هیندستان و دەرەوە. ئەو هەواڵە سیاسییانەی لەم نیمچە کیشوەرەوە دەست دەکەوتن جێی بایەخ بوون و زۆر لە دەرەوە خوازراو بوون. لە کاتی هەڵگیرسانی شەڕی ئەنگلۆ ئەفگاندا لە ساڵی ١٨٧٨ هێربەرت ڕۆیتەر نووسیی: "شەڕی ئەفگان بەرژەوەندییەکی وای لە هیندستاندا خوڵقاند کە ئێمە نەتوانین ڕێ بدەین سیاسەتی هیندستان لەدەست بچێ". سەرەتا بەرهەمی ئەم نووسینگەیە ڕۆژانە تەنیا ٧٧ وشە لە هیندستانەوە بوو و، تێچووەکەی بۆ هەر وشەیەک یەک پاوەندی ستەرلینی بوو.

لە ڕاستیدا، ڕۆیتەرز لە فرەوانکردنی ئیمپراتۆریای خۆیدا، دوای سیستمی کێبڵی بریتانیا کەوتبوو. هەواڵەکانی ئینگلتەرا و هەواڵەکانی شوێنەکانی تری جیهان وەک

چۆن له لەندەنەوە دەبینران، بەخێراییەکی زۆر باش وەردەگیران، ئەویش بەهۆی تێلێگرامەکانی رۆیتەرزەوە لەو کاتەدا کە هۆکاری کارەبایی گەیاندن لە ۲۳ی حوزەیرانی ۱۸۷۰دا لە رێی کێبڵی تێلێگرافی ژێراوی لەندەن-بۆمبەی کرایەوە. سەرەتا کەس گرینگیی بەهاواڵەکانی هیندستان نەدەدا تا ساڵی ۱۸۸٥ وردەوردە خەڵک روویان لە هەواڵەکانی ئەم وڵاتە کرد. لەو کاتەدا رۆیتەرز لە بنەڕەتدا بەشێک بوو لە بەرنامەی بریتانیا بۆ هەر کارێک. لەگەڵ دامەزراندنی ئێدوارد بەک بەهەواڵنێری رۆیتەرز، ئاژانسەکە دەستی بەفرەوانبوون کرد و خۆی گرتەوە.

## API

کیشاب چاندرا رۆی، رۆژنامەوانێکی کالکوتتا بوو چووە سیملا، کە پایەتەختی هاوینەی حکوومەتی هیندستان بوو و بووە هەواڵنێری تایبەتی ژمارەیەک لە رۆژنامەکانی هیندستان. هەر لە سەرەتای ساڵی ۱۹۰۸ەوە رۆی درکی بەو هۆکارانە کرد کە یارمەتیدەری دامەزراندنی ئاژانسێکی نیشتمانیی دەنگوباسن. ئەو لە ساڵی ۱۹۰٦ لەوە گەیشت کە ئینگلتەرا سیستەمی فرەناونیشانی تێلێگراف بەکار دێنێ بۆ ئەوەی رۆژنامەکان بتوانن تێلێگرامی رۆژنامەوانی بەنرخێکی گونجاو بنێرن و وەرگرن. ئەمیش بەهاوکاریی چەند رۆژنامەوانێکی بریتانی هانی لۆرد مینتۆی نوێنەری شایان دا بۆ ئەوەی کار بکا تاوەکو هەمان سیستم لە هیندستانیش کاری پێ بکرێ، ئەم سیستمە جۆرە بەخششێک بوو و ریخۆشکەر بوو بۆ رێکخستن و کۆکردنەوەی هەواڵنامەکان. رۆی سەرسام بوو بە AP و خەوی بەئاژانسێکی هاوشێوەوە لە هیندستاندا دەبینی. بۆیە لە ۱۹۱۰دا ئاژانسێکی دامەزراند، پرێس بیرۆ، کە نووسینگەی لە بۆمبەی و کالکوتتا و مادراس هەبوو. ئەو دەیگوت هەر یەکێک لە رۆژنامەکانی هیندستان ناتوانێ بەتەنیا کرێی نامەکانی هەواڵنێران بدا کە بەتێلێگراف دەیانێرن، بۆیە وا باشە ئەم هەواڵنامانە بنێردرێن بۆ نووسینگەکانی پرێس بیرۆ و لەوێ کۆپی بکرێن بەسەر رۆژنامەکاندا دابەش بکرێن. بەهاتنی ساڵی ۱۹۱۲ سێ ساڵ و بەسەر کارکردنی پرێس بیرۆدا تێ پەڕی، بەڵام ئاژانسەکە لە کێشەدا بوو چونکە رۆژنامە هیندستانییەکان پارەی ئەو هەواڵنامانەیان نەدەدا کە بۆیان دەچوون. لە نێو بەشداربووانی ئاژانسەکە رۆژنامەی

وەک ستەیتسمان و مادراس مەیڵ هەبوون. رۆی بۆ ئەوەی ئاژانسەکە بەردەوام بێ موڵک و ماڵی خۆی فرۆشت.

لەم سەروبەندەدا، ئێدوارد کۆواتس نوێنەری ستەیتسمانی ئینگلتەرا و رۆیتەرز لەلایەن ئەندامی دارایی ئەنجوومەنی جیبجێکەری نوێنەری شاوە قایل کرابوو بەوەی ئاژانسێکی دەنگوباسی هیندستان پێویستە هەبێ دوای ئەوەی ئەو دوای هەفتەیەکی تەواو لە شکستی بانکێک ئینجا هەواڵەکەی پێ گەیشت. ئەو ئاژانسە هەواڵەکانی هیندستانی دەدایە نزیکەی سەد فەرمانبەر لە سەرانسەری وڵاتدا و گەیشتە رێککەوتنێک لەگەڵ رۆیتەرز بۆ ئەوەی هەواڵی دەرەوەی لێ وەرگرێ. سێر رۆدریک جۆنز، بەرێوەبەری رۆیتەرز توانیی رۆی قایل بکا ئاژانسەکەی خۆی تێکەڵ بەوەی کۆواتس بکا و ئاژانسێکی نوێ دروست بکەن کە ئەو ناوی نابوو ئاژانسی دەنگوباسی رۆژهەڵات. لەگەڵ ئەمەشدا ئاژانسەکە پێی دەگوترا ئەسۆشیێتد پرێسی هیندستان API. کۆواتیس بەشی خۆی فرۆشت و خانەنشین بوو، لە هەمان کاتدا رۆی ساڵی ١٩١٩ بووە بەرپرسی کاروباری هەواڵەکان لە ژێر کۆنترۆڵی بەرێوەبەری گشتیی رۆیتەرز کە بارەگاکەی لە بۆمبەی بوو. رۆی بەوە ناسرابوو کە توانای باشی قایلکردنی هەبوو. بەپێشنیازی رۆی یاسای تێلێگرافی هیندستان هەموار کرا بەشێوەیەک هەمان ئەو پێداویستییانەی بۆ رۆژنامە تۆمارکراوەکان دابین دەکرێن بۆ ئاژانسەکانی تۆمارکراوی دەنگوباسیش تۆمار بکرێن. هەر رۆییش بوو توانیی هوف کیلینگی سەرۆکی ئەندازیاران قایل بکا ئەو شوێنەی لە شەقامی پەرلەمان لە نیو دێلهی دوای چەند ساڵێک بووە باڵەخانەی رێکخراوی رۆژنامەوانیی هیندستان، بۆ ئاژانسەکە تەرخان بکا.

کارەکانی رۆیتەرز بەرەو دەرەوەی هیندستان لە لایەن رۆیتەبەکەوە پڕ دەکرایەوە بەبڵاوکردنەوەی هەواڵنامەگەلێکی دیاریکراو کە جێی بایەخی حکوومەت بوون و لە لایەن گلۆبرۆیتەوە کە هەمان کاری بڵاوکردنەوەی لەسەر ئاستی جیهان ئەنجام دەدا. حکوومەتی بریتانیا بێتەلی فەرمیی بریتانیای خستە کار و لەلایەن نووسینگەی دەرەوەی بریتانیاوە بەرێوە دەچوو. پەیامەکان بەبێتەل لە نێوان رەگبی لە ئینگلتەرا و کیرکی لە هیندستان ئاڵوگۆڕ دەکران. ئەو پەیامانەش هەر لە لایەن رۆیتەرزەوە بڵاو دەکرانەوە. لە سەرەتای ١٩٢٠ەکاندا رۆیتەرز و پاشکۆکەی API، بەباشی لە ژێر

دەسەڵاتی فەرمیدا بوون. ئەو پارانەی لە بودجەی وڵات بۆ رۆیتەرز و API تەرخان دەکرا لە ژێر بەندێکدا بوو بەناوی ئابوونەی بەشداری لە وەرزنامە جۆراوجۆرەکاندا. وەڵامی نەگۆڕی ئەو پرسیارانەش کە ئەنجوومەنی یاسادانان لە بارەی ئەم خەرجییانە دەکران ئەوە بوو ئەمە پارەدارکردنی رۆیتەرز و API نییە، بگرە ئەمە پارەی ئەو خزمەتگوزارییانەی ئەوانە وەری دەگرن.

ساڵی ١٩٣٧ تێلێپرینتەر لە لایەن و. ج. مۆلۆنەی، بەڕێوەبەری گشتیی رۆیتەرز لە هیندستانەوە، پێشکێش کرا. تێلێپرینتەر شۆڕشێک بوو لە سیستمی گواستنەوەی هەواڵدا، چونکە وای کرد ئاژانسەکانی دەنگوباس بتوانن بەنرخێکی کەم هەواڵ بەڕۆژنامە بچووکەکان لە هەموو کونجێکی وڵات بگەیەنن. مۆلۆنەی کە لە ساڵانی ١٩٢٣ تا ١٩٣٧ بەڕێوەبەری APIش بوو، لە یادداشتنامەیەکدا بۆ دەستەی کارگێڕیی رۆیتەرز لە ساڵی ١٩٤٤دا دەڵێ: "لە ماوەی کارمدا لە هیندستان گرینگترین کارەکانم دانای هیندییەکان بوو لە جێی ئەوروپاییەکان لە زۆر بواردا... گەیاندنی هەواڵەکانی رۆیتەرز بەڕۆژنامە بچووکەکانی کە ئەگەر بەپێی گرێبەستەکانمان لەگەڵ رۆژنامەکانی ئینگلیز بێ بەهیچ شێوەیەک نابی سوود لە خزمەتگوزاریی رۆیتەرز وەرگرن. ئەو گرێبەستانە گفتوگۆیان لەسەر کرایەوە تا خزمەتگوزارییەکان بگەنە ئەم رۆژنامە بچووکانە. پێشکەوتنێکی تر لە سەردەمی مندا لە هیندستان دامەزراندنی خزمەتگوزاریی بازرگانیی بێتەلی تایبەت بەرۆیتەرز بوو کە رۆژانە راستەوخۆ و بەماوەی تەنیا دوو خولەک هەواڵی بازاڕەکانی نیویۆرک و لیڤەرپوولی لە رەگبییەوە بۆ نووسینگەی ئێمە لە بۆمبەی دەگواستەوە. ساڵی ١٩٣٧ دەست بەکاربوونی خزمەتگوزاریی تێلێپرینتەری بەخۆوە دی. یەکەمین بازنەشی راستەوخۆ لە بۆمبەیەوە بۆ کالکوتتا بوو، خزمەتگوزاریی تەواویشمان پێش ساڵی ١٩٣٨ بەتەواوی تەواو نەکرا".

## ئاژانسی فری پرێس

پێکەوە گرێدانی رۆیتەرز و ئەسۆشییێتد پرێس بەواتای کۆنترۆڵی حکوومەت دەهات و ئەمە لە سەرەتای بیستەکاندا لە کاتی بزووتنەوەکەی گاندیدا زۆر بەڕوونی دەرکەوت.

له ١٩٢٧ س. ســاداناند ئاژانسی فــری پرێسی FPA دامــەزراند و لـه وتارێکدا لەبارەی ئامانج هۆکارەکانی دامەزراندنیدا گوتی ڕای گشتی له قالب دراوه بەهۆی ئەو هەواڵانەی ڕۆژانه دەگەن و "کارێکی سەختە ئەگەر ئەستەم نەبێ، ڕای گشتیی تەندروست پێک بهێنی له کاتێکدا کە تۆ ملکەچی قۆرخکردنی بازاڕی هەواڵ بی لەلایەن ئەو ئاژانسانەی دەنگوباس کە حکوومەت پشتیوانییان دەکا".

FPA بەشی هەواڵەکانی دەرەوەشی هەبوو. نووسینگەی لەندەن کێبڵی هەندێ له ئاژانسەکانی جیهانی هەڵبژاردبوو و هەواڵەکانیانی کۆ دەکردەوە و دەینارده هیندستان. بێگومان ڕۆیتەرز لەم کێبەرکێیەدا دۆڕاو بوو.

دەسەڵاتی ئیمپریالیست هەموو توانای خۆی خستە کار بۆ ئەوەی ئەم دەزگایه له ڕەوتی خۆی دەرکا. پاڵەپەستۆی فەرمی خرایه سەر بەڕێوەبەرانی هاوکاری ساداناند و له ١٩٢٩دا چواریان دەستیان لەکار کێشایەوه و پێنجەمیشیان له ١٩٣٠ دەستی لەکار کێشایەوه. ئەو یاسای ڕۆژنامەوانییەی له ئایاری ١٩٣٠ دەرچوو گورزێکی زۆر توندی لەو ڕۆژنامانە وەشاند کە هەواڵەکانی FPAیان بڵاو دەکردەوه. تێلێگرامەکانی ئاژانسی فری پرێس خرانه ژێر سانسۆرێکی توندەوه و ڕۆژنامەکان له بڵاو کردنەوەی ئەو هەواڵانەی له ئەژانسەکەوه پێیان دەگەیشت دوور کەوتنەوه له ترسی ئەوەی بکەونه بازنەی سەرپێچیکەرانی ئەو یاسایه و هەر یاسایەکی تری نائاسایی له بارەی ڕۆژنامەوانییەوه. APIیش له لای خۆیەوه پاڵەپەستۆی دەخستە سەر ڕۆژنامەکانەوه بەپێداگرتن لەسەر ئەوەی خزمەتگوزارییەکانی له هەموو ئەو ڕۆژنامانه دەبڕی کە بەشداری ئابوونەدەری ئاژانسەکەی تر بوون.

ساداناند هەوڵی دا ڕێی تر بگرێتە بەر بۆ بەردەوامبوون لەو شەڕەیدا و بۆ ئەم مەبەستەش دەستی بەدەرکردنی فری پرێس جۆرنال کرد، کە ڕۆژنامەیەکی بەیانییان بوو له حوزەیرانی ١٩٣٠ له بۆمبەی دەری کرد و ڕۆژنامەکانی یەککگرتووش دەستیان کرد بەبڵاوکردنەوەی هەواڵەکانی فری پرێس بەتەنیا. له ١٩٣٠دا کۆپییەکی دزراوی فری پرێس جۆرنال بووه مایەی دڵەڕاوکێی زۆر له نووسینگەی ڕۆیتەرز له بۆمبەی و کێبڵەکانی ڕۆیتەرز بەرەو نیشتمان له لایەن ئۆپۆزسیۆنەوه لێدران. له نێو هەواڵه گرینگەکانی FPAدا پرسی هێرشی زرێپۆشەکانی چیتاگۆنگی شوباتی ١٩٣٣

هەبوو. ک راما راو، کە یەکێکە لە ڕۆژنامەوانە گەورەکانی سەردەمی خۆی، لە بنج و بنەوانی ئەو پرسەی کۆڵیبووەوە و چیرۆکی گرتنی سوریا سینی سەرکردەی بڵاو کردبووەوە.

نارەزایی و دژایەتیی ئاژانسێکی دەنگوباس کە ڕۆژنامەشی هەبێ هاتە کایەوە و کاتێ بەڕێوەبەری ئاژانسەکە گەیشتە ڕێککەوتنێک لەگەڵ ئسۆشیێتد پرێس، ساداناند ناچار کرا دەسبەرداری زنجیرە ڕۆژنامەکانی بێ. ساڵی ١٩٣٥یش کاتێ دەست بەسەر بناخەکانی دارایی ڕۆژنامەکانیدا گیرا، ساداناند ناچار بوو ئاژانسەکەی دابخا. ساداناند بەهۆی ئەو هەموو پارە زۆرەی لە دەستی دا و ئەو سزایانەی خرانە سەری مایەپووچ بوو و چەندین جاریش ناچار کرا پارە، لە بەرامبەر ئەو پێشێلکارییانەی دژ بەیاسای ئیمپریالیست کردوویەتی، بدا. دەبوایە پارە بدا بەرامبەر سەروتارێک بەناونیشانی "سواراج تەنیا چارەسەرە" کە ڕۆژنامەی فری پرێس جۆرنالی سەر بەئاژانسەکەی بڵاوی کردبووەوە، هەروەها لەسەر بڵاوکردنەوەی چەند کورتکراوەیەکی بابەتێکی ماهاتما گاندی و لەسەر راپۆرتێک لە بارەی وتارەکەی ڤیتالبای پاتێل لە نیویۆرک.

ئەگەر مۆهانداس کارامچاند گاندی شەرکەری ئازادی بێ، ئەوا سوامینات ساداناند ڕۆژنامەوانێکی شەرکەری ئازادییە. ئەو شەری لە پێناو ئازادیی ڕۆژنامەوانی کرد لەو سەردەمەی بریتانیا حوکمڕانیی هیندستانی دەکرد و دوای ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی هیندستانیش بەردەوام بوو لە شەڕ و ئاگەدارکردنەوەی خەڵک لە مەترسیی باڵادەستیی چەند ئاژانسێکی دیاریکراو لە بواری هەواڵە جیهانییەکاندا. ڕاستە ئەو داهێنی دەربڕینی "یاسای ڕێکخستنی زانیاری و گەیاندنی نوێی جیهان" نەبوو، بەڵام توانیی ئەو کێشەیە ببینێ کە تا ئەمڕۆش جیهان بەدەستیەوە دەناڵێ.

لە سەرەتای کاری ڕۆژنامەوانیدا، ساداناند بۆ ماوەیەکی کورت لەگەڵ ڕۆیتەرز کاری کرد (بگرە لەگەڵ ئەسۆشیێتد پرێسی هیندستان کە ڕۆیتەرز پارەکەی دەدا). هەرچەندە زانیارییەکی شایستە لە بارەی ئەو سەردەمەوە نییە، بەڵام ئاشکرایە کە خولیای هەبوونی ئاژانسێکی سەربەخۆی هیندستان لەو سەردەمەدا لە مێشکی ئەو

سەری هەڵدابوو. پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆمبەی و لەوێ ئاژانسی دەنگوباسی فری پرێسی هیندستان دامەزرێنێ، ماوەیەک لە بورما بووە. س تریکانناد، نووسیاری یاریدەری پێشوو لە فری پرێس جۆرنال دەڵێ "ئەو کاری خۆی بەکارێکی کەم مووچە لە ئەسۆشیێتد پرێسی هیندستان API دەست پێ کرد و دوای ئەوە چووە ئەڵلاهاباد و لەو ڕۆژەدا کە پاندیت مۆتیلال نەهرۆ گیرا ئەو لە ئیندپێندنت دەستی بەکار کرد، دوای ئەوە بەماوەیەک چووە رانگوون تایمز و لەوێ کاری کرد. لەوێش بوو بیرۆکەی دامەزراندنی ئاژانسێکی دەنگوباسی خۆی، کە هەواڵەکانی هیندستان بگەیەنێتە هەموو جیهان، لە مێشکیدا بڵاچەی دا".

چەندین چیرۆک هەن باس لە سەرەتاکانی فری پرێسی هیندستان FPI دەکەن، بەڵام سادانان خۆی نووسیویەتی "فری پرێسی هیندستان ئاژانسێکی نیشتمانیی سەربەخۆی دەنگوباسە لە ساڵی ١٩٢٣وە نەخشەی بۆ کێشرابوو و ساڵی ١٩٢٥ دامەزرا و تا ساڵی ١٩٣٥ چالاکانە لە کارکردن بەردەوام بوو. کاتێ فری پرێسی هیندستان چالاک بوو هەموو ڕۆژنامەوانیی نیشتمانیی هیندستان پشتگیریی لێ دەکرد. ئەو ئاژانسە خزمەتگوزارییەکی ناوخۆیی گشتگری پێشکێش دەکرد. یەکەمین ئاژانسی دەنگوباسی هیندستان بوو کە خزمەتگوزارییەکی کارای ڕێکخستن و وەدەستهێنانی هەواڵەکانی جیهانی پێشکێش بەڕۆژنامەوانیی هیندستان دەکرد لە ساڵانی ١٩٣٢ ەوەوە تا ١٩٣٥".

هەرچەندە چەند ساڵێکی کەم بەر لە دووەمین کۆنفرانسی مێزگەڕ دەستی بەکار کردبوو، بەڵام فری پرێس لە کۆنفرانسەکەدا چەندین دەستپێشخەریی پێشکێش کرد، لەگەڵ ئەوەشدا تەنانەت ڕۆژنامە ناسیۆنالیستەکانیش دەترسان راپۆرتەکانی سادانان بڵاو بکەنەوە. هەندێکیان بەشداربوون و ئابوونەیان دەدا بەڵام هیچ هەواڵێی ئەویان بڵاو نەدەکردەوە. بۆیە ئەویش لەو کاتەوە کەوتە دەرکردنی زنجیرەیەک ڕۆژنامە بەزمانگەلی جۆراوجۆر کە هەواڵەکانی ئەویان بڵاو دەکردەوە".

ک راما راو لە بارەی سادانان نووسیویەتی "سەروەرییەکانی شەڕ لە پێناو ئازادیدا لە ساڵانی ١٩٣٠ تا ١٩٣٣ لە بەرەی ڕۆژنامەوانیدا بەیەکسانی بەشی سوامینات سادانان و فری پرێس جۆرنالن. ئەو ڕۆژنامەیە شەرێکی داستاناویی لە

دژی حکوومـەت دەکـرد و لـە ڕاسـتـیـدا ئەو سـەر و هێـڵـی پێـشـەوەی هێـرشی ڕۆژنامـەوانی بوو. ئـەو کاتـە سادانـاند زۆر بەحـەمـاسـەت بوو و دەوڵـەمـەنـدیش بوو. جۆرنـال ئەو کەشتییە نەترسـە بوو ئەو سواری بوو و خۆشی ئەو باڵەفڕەوانە بـوو کە ڕووبەڕووی هـەزاران گـەردەلوول بووەوە. هەرچەندە کەشتییەکە خـەریک بوو نوقم بێ بەڵام ئەو توانیی بەهـەر شـێـوەیەک بێ ڕای گرێ. سـادانـاند مـردووە، بەڵام لە دوای خـۆی ناوبانگێکی ئەفسـووناویی جـوانی مـەردانەی نەترس و چەندین دامـەزراوەی چەسپاوی سوودبەخش بەوڵاتی بەجێ هێشت".

راو لەو سـەردەمـە چارەنووسـسـازەدا کـاری لەگـەڵ سـادانـاند کـردبوو و زۆر لە نزیکەوە ئەو پیـاوەی دیبوو و بەم شێوەیە باسی دەکا "وەک ئـەوەی لە ئاسن دروست کـرابێ، ئەو پیـاوە بەقـەد تۆزقاڵێکیش ترس لـە لەشـیدا نـەبوو. ئەوەندە بوێر بوو تا ئاسـتی داهێنـەری و، ئەوەندە ڕەسـەن بوو تا ئـاسـتـێک کـەس بیـری بۆی نـەچێ. بەبیانووی پێشێلکاریی یاسا یەک لە دوای یەک سزای دارایی بەسەردا دەسەپێنران و زەبرەکان بەدوای یەکدا ئاراسـتـەی دەکران، کەچی ئەو چاویشـی نەدەترووکاند و یەک ئینجێک لە هێڵی ئاگر پاشەکشەی نەکرد. ئەو بەسەرێکی بریندار بەڵام بەرزەوە هەمیشـە لە هێرشبـردن بەردەوام بوو. بەلای ئەوەوە هیچ زیانێک گەورە نەبوو و هیچ سـەرکێشییەک ملهوڕی نەبوو. ئەو چێژی لە ئاریشەکان وەردەگرت. ئەو سـەربازێک بوو، زۆر کـەڕەت بردییـەوە و زۆر کـەڕەتیش دۆڕاندی، بەڵام هەرگیـز لـە مـەترسـی و سەختیی ئەرک ڕای نەکرد".

سەبارەت بە ئاژانسی فری پرێسیش، راو نووسیویەتی "ئاژانسی دەنگوباسی فری پرێس کـە سـاڵی ١٩٢٧ دامـەزرا، مـەبەسـتی ئەوە بـوو چالاکیـیـە سیـاسـیـیـەکـانی نیشتمـان داپۆشێ، ئەو چالاکییانەی ئەسۆشیێتد پرێس لەبەر لایەنداریی ئاشکرا و پاشکۆییی تایبـەتیـیـەوە توانای نەبوو دایانپـۆشێ یـاخـۆ پشـتگوێی دەخـستن. ئەم ئاژانسـە لە ماوەی ژیانی خۆیدا کارێکی نیشتمانیی باشی کرد، ئەو چەندین کاری لە ناکـاوی کرد کە حکوومـەتیـان وەڕس کـرد و بەسـەختی شـەڕی لە دژی ئەو ڕێژە ڕووخـێنـەرە کـرد کـە لە نێـوان ڕوپێ و پاوەندی سـتـەرلینیـدا دانرابوو، هـەروەها شـەڕێکی سەختـیشی دژی ڕێککەوتنی ئۆتاوا کـرد. ئەم ئاژانسـە لە ١٩٣٥دا لەبەر

نەبوونی پشتیوانی و دژایەتیی حکوومەتی بێگانەی ئەو سەردەمە و بەرژەوەندییە شاراوەکانەوە مرد. هەوڵە مەردانەکەی ساداناند بۆ دامەزراندنی ئاژانسێکی دەنگوباسی هیندستان بەشێکی دەرەوەشی لەخۆ دەگرت کە هاوشانی رۆیتەرز بوو. بێگومان سەرکەوتن شایانی ئەو هەوڵە بوو بەڵام سەرنەکەوت. جگە لەو خزمەتگوزارییانەش کە پێشکێشی دەکردن، پێویست بوو ئەو جوانییە بێگەردەی مۆدوس ئۆپێراندییەکەی پشتگیریی خوێنگەرمانەی هەموو رۆژنامەوانیی هیندستان بەدەست بهێنێ. نووسینگەی لەندەن توانیی کێبڵی ئاژانسە سەرەکییەکانی جیهان بکرێ و کۆیان بکاتەوە و لە هەموویان باشترەکان بنێرێتە هیندستان. زۆر جار رۆیتەرزی دەدایە پاش. کۆپییەکی دزراو لە فری پرێس جۆرنال بووبووە هۆی ئازارێکی رۆژانە و دڵەڕاوکێی بەردەوام لە هۆرنبی رۆد و کێبڵە خەمبارەکان دوای ئەوەی لە لایەن "ئۆپۆزسیۆن"ەوە لێ دران بەرەو ماڵی خۆیان گەڕانەوە. بەپێی شارەزاییی خۆم، دەتوانم بڵێم ئەم ئاژانسە توانیی گرینگیی خۆی بسەلمێنێ. بەڵام رۆژنامەوانیی هیندستان پشتگیریی نەکرد و ساداناند بەهەڵگرتنی ئەو بارە گرانە بەتەنیا، خۆی تێک شکاند".

ساداناند نووسیویەتی "لە رێی کاری هاوبەشی حکوومەتی بێگانە و رۆیتەرز و رۆژنامەوانیی لایەندار و پیاوانی گشتییەوە، توانرا لە تەمووزی ١٩٣٥ و لە ناکاو کۆتایی بەچالاکییەکانی فری پرێسی هیندستان و فری پرێس جۆرنال بهێنرێ. فری پرێس جۆرنال دوای کاوەیەکی کورت لە دامەزراندنی وەزارەتگەلی میللی لە هەرێمەکاندا، لە کانوونی یەکەمی ١٩٣٧ دەستی بەبڵاوکردنەوە کردەوە. فری پرێسی هیندستانیش لە ١٩٤٥دا دەستی بەچالاکییەکانی خۆی کردەوە. گرینگییەکی زۆریشی دا بەکۆکردنەوەی هەواڵەکانی جیهان و دابەشکردنەوەیان بەسەر رۆژنامەوانیی هیندستاندا. فری پرێس توانیی هەواڵنێری تایبەتی خۆی لە دەروە هەبێ و نووسینگەی لە نانکینگ و قاهیرە و سینگاپوورە و باتاڤیا و لەندەن و نیویۆرک بکاتەوە بەمەبەستی جێبەجێکردنی پلانەکانی خۆی بەوەی هەواڵە جیهانییەکانی لە بنەڕەتدا بۆ هیندستان بن و ئینجا بۆ وڵاتانی تری جیهان بن".

لەگەڵ ئەوەی بەڵێن بەساداناند درابوو هێڵەکانی تێلێپرینتی بەکرێ بدرێتێ، بەڵام

لە کاتی پێویستدا ئەم خزمەتەی پێشکێش نەکرا. "لە ٣٠ی نیسانی ١٩٤٧ بەفری پرێسی هیندستان ڕاگەیەنرا کە ناتوانێ پشت بەکرێی کەناڵەکانی تێلیپرینتەر ببەستێ بۆ چالاکییەکانی ئاژانسی دەنگوباسەکەی. بۆیە فری پرێسی هیندستان چالاکییەکانی خۆی هەڵپەسارد تا ئەو کاتەی سیاسەتی حکوومەتی هیندستان جێگر دەبێ و ئەم هەڕەشەیەی جێبەجێ کرد".

ساداناند ئەندامی تیمی گفتوگۆی ڕۆژنامەوانیی هیندستان بوو بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ ڕۆیتەرزدا. لە یاداشتنامەی جیابوونەوەی لە کۆمەڵەی ڕۆژنامەکانی هیندستان و ڕۆژهەڵاتدا، لە ٢٣ی تەمووزی ١٩٤٩، مرۆڤ دەتوانێ هەست بەڕوونیی بیرکردنەوەی بکا:

"ئاژانسی دەنگوباس ئەو هۆکارەیە هەواڵەکانی جیهان کۆ دەکاتەوە و لە هیندستاندا بڵاویان دەکاتەوە و هەواڵەکانی هیندستانیش بەڕۆژنامەوانیی جیهان دەگەیەنێ. ئازادیی زانیاری، یاخۆ وردتر بڵێین مافی گەیشتنی ئازادانە بەهەواڵەکان و گەیشتنی ئازادانە بەهۆکارەکانی بڵاوکردنەوەی هەواڵ سەرنجی باشترین مێشکەکانی جیهانی بەلای خۆیدا بەکێش کردووە. زنجیرەیەک کۆنفرانسی جیهانی ئەنجام دران و گفتوگۆی ژیاری کران لەسەر پرنسیپە بنەڕەتییەکانی کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی هەواڵ. هیندستانیش بەشێکە لەو گردبوونەوەیەی لە لایەن کۆنفرانسی نێودەوڵەتیی ئازادیی زانیارییەوە دروست کراوە. کۆنترۆڵکردنی کەناڵەکانی بێتەل و تێلیپرینتەر لە هیندستاندا، بۆ ڕێکخستن و دەستوەردان لە کاری خزمەتگوزارییەکانی هەواڵەکانی ناوەوە و دەرەوە لە لایەن بریتانییەکانەوە، پێش دامەزراندنی حکوومەتی نیشتمانی و دواتر لە لایەن حکوومەتی نیشتمانییەوە جێی ڕەخنەی بازنە بەرپرسەکانی ڕۆژنامەوانیی جیهانییە".

چیرۆکی شکستی ساداناند لە بەکرێگرتنی هێڵەکانی تێلیپرینتەر بۆ ئاژانسی فری پرێسی هیندستان، دوای چەندین ساڵ لە مردنی خۆی نووسرایەوە. ب دەت، کە یاخیبوویەکی هێزی دەریایی بوو و ساداناند پۆستێکی لە فری پرێس جۆرنالدا پێ دابوو، بابەتێکی لەسەر جووڵانەوەی هێزەکانی چەکدار لە دوای سەربەخۆیی نووسیبوو. ڕۆژنامەگەلی تریش ئەو بابەتەیان بڵاو کردبووەوە. بۆ ڕۆژی دواتر س

ناتاراجانی نووسیار دەستخۆشیی لە دەت نەکرد، بگرە گوتی "پاڵەوانەکەی ئێمە تا ئێستا تەنیا زیندانی هێزی دەریایی دیبوو، بەڵام ئەم جارەیان چەند ساڵێکی لە زیندانێکی سڤیلدا بۆ خۆی مسۆگەر کرد". دوای ئەمە ناتاراجان ئاوڕی لێ دایەوە و بەزەردەخەنەیەکەوە گوتی "مەترسە، من لەوێ چاوم لێت دەبێ، لەبەرئەوەی من نووسیارم، دەبمە میوانی ژمارە یەکی حکوومەتی هیندستان و تۆش بەدوای مندا دێی". دەت زۆر بەسادەیی پرسیی "قوربان، من چیم کردووە؟ کەس ناتوانێ چیرۆکەکەم بەدرۆ بخاتەوە".

"بەڵێ، سەردار پاتێل وەزیری ناوخۆ، نەیگوتووە چیرۆکەکەت هەڵەیە. بەڵام ناوە ڕاستەکانی هەموو کەشتییەکانی هەموو یەکەکانی سوپا و پلەی گەورە ئەفسەرەکانی بەشداربوو، ناسنامەی جەنابتیان ئاشکرا کردووە". لەبەرئەوەی تەنیا شەرکەرێکی پێشوو کە بەو وردییە ئەو ناو و پلەوپایانە بزانێ دەت بوو.

ناتاراجان بەردەوام بوو: "سەردار ئەمەی لا ئاشکرا بووە و تەنیا دەیەوێ ئەوە بزانێ کێ ئەو هەموو زانیارییەی بەتۆ داوە. ئەو تووڕەیە لەوەی ئێمە ئەو هەواڵەمان بەبێ وەرگرتنی مۆڵەتی فەرمی بڵاو کردووەتەوە. شەو کە تەلەفۆنی بۆ ساداناند دەکرد هەتا قسەکانی تەواو کرد خەریک بوو تەلەفۆنەکە گڕ بسەنێ". لەگەڵ ئەمەشدا دەت و ناتاراجان هیچیان بەسەردا نەهات. دەت لە یۆبیلی زێڕینی کارکردنی لە فری پرێس جۆرنالدا نووسیی "دوای چەندین ساڵ، کاتێ من لە کاری ڕۆژنامەوانیدا نەمابووم و ساداناندیش نەمابوو، ناتاراجان ئاکامەکانی بابەتەکەمی پێم ڕاگەیاند. سەردار ساداناندی کوشت، هەموو هۆکارەکانی گەیاندنی لە ئاژانسی فری پرێس بڕی. ئەم هەواڵە دڵهەژێنە زۆر درەنگ گەیشتە ناتاراجانیش. ناتاراجان دەڵێ دوای چەندین ساڵ بەڕێکەوت ساداناند باسی ئەمەی بۆی کردووە و گوتوویەتی فری پرێس جۆرنال بەردەوام دەبێ تەنانەت دوای ئەویش، بەڵام چیی تر فری پرێسی هیندستان دروست نابێتەوە. ئەو ئەمەی گوت و گلەییی لە کەس نەکرد. ئەمە ئەو پیاوە بوو، ئەوە بوو ساداناند".

## یونایتد پرێسی هیندستان

یونایتد پرێسی هیندستان ساڵی ١٩٣٣ لە کالکوتتاوە دەستی پێ کرد لە لایەن ب سین گوپتا کە لە فری پرێس دەستی لە کار کێشابووەوە. سین گوپتا بەڕێوەبەری کارگێڕی بوو و دکتۆر ب رۆی بەڕێوەبەری دەستەی کارگێڕی بوو. ئەم ئاژانسی دەنگوباسە لە سەرەتاوە تووشی گرفتگەلێکی دارایی و هی تریش بوو. کێبەرکێکە لەگەڵ ئەسۆشیێتد پرێس و ئەو گواستنەوە خێرایەی ئەو بوو بەهۆی تێلیپرینتەرەوە. کە دکتۆر راجێندرا پراساد خزمەتگوزاریی تێلیپرینتەری یونایتد پرێسی لە ساڵی ١٩٤٨ کردەوە، ئەو کاتە ئاژانسەکە هۆکارێکی نوێی بۆ ژیان دەست کەوت. لە کۆتاییدا ئەم ئاژانسە لە ساڵی ١٩٥٨ داخرا، چونکە ڕۆژنامەکان ئارەزوویان نەدەکرد ژیانی بەردەوام بێ. سی راغافان ساڵی ١٩٧٧ لە بارەی ڕووخانی ئاژانسەکەوە نووسیی "ئەو کاتە، من بەنوێنەرایەتیی فیدراسیۆنی هیندستانی ڕۆژنامەوانانی کارا، چەند جارێک چاوم بەوەزیری ناوخۆ کەوت، کۆچکردوو گۆڤیند باللاب پانت، وەک هەوڵێک بۆ ڕێگە گرتن لە داخستنی ئاژانسەکە. پاندیت پانت قایل بوو بەوەی ڕای گەیەنێ وەرگرتنەوەی قەرزەکانی وەزارەتی پۆست و تێلێگراف لەسەر UPI دوا دەخرێ _ ئەو قەرزە پارەیەکی تەواو زۆر بوو- بەڵام بەمەرجێک بەڵێنی ئەوەی پێ بدرێ کە خاوەنەکان و ڕۆژنامەکان قەرزەکانی تر دەدەنەوە، لەوانەش پارەی سندووقی پاراستنی کارمەندان، ئەوەشی بۆ مسۆگەر بکرێ کە ئاژانسەکە بەشێوەیەکی ئابوورییانە بەڕێوە دەبرێ. ڕۆژنامەکان نەیاندەویست ئەمە بکەن و خاوەنەکانی ئاژانسەکەش ئەمەیان بەتەنیا پێ نەدەکرا. بۆیە یونایتد پرێسی هیندستان UPI ڕووخا".

## پرێس ترەستی هیندستان PTI

یەکێ لە دەرهاویشتەکانی هەڵکشان بەرەو سەربەخۆیی، لەدایکبوونی بیرۆکەی هەبوونی ئاژانسێکی دەنگوباسی نیشتمانی بوو کە هی هیندستان خۆی بێ و بابەتییانە زانیاری لەسەر نەتەوەیەکی سەرهەڵداو و ڕزگاربوو لە کۆیلایەتی بۆ بێگانە بڵاو بکاتەوە. "لەدایکبوونی بیرۆکەی ئاژانسێکی نیشتمانیی دەنگوباس

یەکەمین ئاکامی ڕاستەوخۆی گیانی سەربەخۆیی بوو کە لە ڕۆژانی بزووتنەوەی هیندستانی ئازادەوە وڵاتەکەی داگرتبوو. ویستی هەژاندنی دەست بەسەراگرتنی بواری هەواڵ لە لایەن ئیمپریالیزمەوە کرۆکی ئەم بیرۆکە نوێیە بوو"، ئەمە قسەی رامنات گۆینکای کۆنە بەڕێوەبەری PTI بوو.

دوای دوو ساڵ لە ڕاوێژ و گفتوگۆی نێوان گەورە ڕۆژنامەوانان و خاوەن ڕۆژنامە و سەرکردە نیشتمانپەروەرەکانی وەک پاندیت نەهرۆ و سەردار پاتێل، یەکەمین ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسی هیندستان، پرێس ترەستی هیندستان، لە مادراس لە ٢٧ی ئابی ١٩٤٧دا دامەزرا. ئەمە لەو دوو هەفتەیەدا بوو کە جەواهەر لال نەهرۆ، لە هۆڵی مێژوویی سەنتەری پەرلەمان لە شەوی ١٤-١٥ی ئابدا، بە"ژوان لەگەڵ چارەنووسدا" وەسفی کرد.

ساڵی ١٩٤٨ ڕۆژنامەکانی هیندستان پرێس ترەستی هیندستانیان لەسەر بناخەی کۆمپانیای هاوبەش دامەزراند. ئەم ئاژانسە بەسەر ڕێککەوتنێکی سێ ساڵە لەگەڵ ڕۆیتەرزدا هات و بەگوێرەی ئەو ڕێککەوتنە دەستی بەسەر ئەسۆشیێتد پرێسدا گرت و وەک هاوبەش چووە پاڵ ڕۆیتەرز لە بواری کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی هەواڵ لە هەموو جیهاندا. دوای تەواوبوونی چوار ساڵ ڕێککەوتنەکە کۆتاییی پێ هێنرا و پرێس ترەستی هیندستان دەستی کرد بەکڕینی هەموو خزمەتگوزارییەکانی ڕۆیتەرز و دابەشکردنیان لە هیندستاندا.

بیرۆکەی دەستبەسەرداگرتنی API لە لایەن ڕۆیتەرزەوە ساڵی ١٩٤٦ گفتوگۆی لەسەر کرابوو، لە کۆبوونەوەیەکی کۆمەڵەی ڕۆژنامەکانی هیندستان و ڕۆژهەڵات IENS لە لاهوور. لە نێو ئەو کەسانەی پشتگریی ئەم بیرۆکەیەیان کرد دێڤداس گاندی لە هیندستان تایمز و کاستوری سیرینیڤاسان لە هیندو و توشار کانتی گۆش لە ئامریت بازار پاتریکا. لەو سەروبەندەدا حکوومەتی حیزبی کرێکاران کە لە ئینگلتەرا لە دوای سەرکەوتن بەسەر پارێزکاراندا ساڵ ١٩٤٥ دەسەڵاتی گرتبووە دەست، بەڕۆیتەرزی گوتبوو بچێ بەدەنگ خواستەکانی ڕۆژنامەکانی هیندستانەوە بۆ گواستنەوەی بەرژەوەندییەکانی. ڕۆیتەرز پێی خۆش نەبوو دەستبەرداری باڵادەستیی خۆی بێ لە هیندستان، تەنانەت لەو کاتەشدا کە حکوومەتی بریتانیا

بڕیاری دابوو دەسەڵات بداتەوە دەستی هێندییەکان. لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕۆیتەرز قایل بوو بەوەی ئاژانسە ناوخۆییەکە API بداتە دەستی ئاژانسێکی دەنگوباسی نیشتمانی، بەڵام دەیویست کۆنترۆڵی هەواڵەکانی دەرەوە هەر بەدەستی خۆیەوە بمێنێ. بۆ ئەوەی دوای ئەمە ڕۆیتەرز بتوانێ کار بکاتە سەر کۆمەڵەی ڕۆژنامەکانی هیندستان و ڕۆژهەلات IENS بۆ ئەوەی هەندێ ڕێککەوتنی پاش سەربەخۆیی ئەنجام بدەن کە تا کۆتایی ڕێ لە قازانجی ڕۆیتەرزدا بێ.

لە کۆتاییدا بەتێکەڵبوونی سەردار ڤالاببای پاتێل، ئەندامی ناوخۆ و ڕاگەیاندنی حکوومەتی هیندستان، کێشەکە چارەسەر کرا. ئەو دەیگوت پێویستە هەموو بەرژەوەندییەکانی ڕۆیتەرز لە هیندستاندا بدرێنە ئاژانسە هیندستانییەکەی دەنگوباس، پرێس ترەستی هیندستان، ئەگەر وا نەکرێ ئەوا ئەو هێڵی تێلیپرینتەرانەی ڕۆیتەرز کە مۆڵەتی کارکردنیان لە تەممووزی ١٩٤٧دا تەواو دەبێ مۆڵەتی کارکردنەکەیان نوێ ناکرێتەوە. سەردار پاتێل داوای لە سەرۆکی IENS کرد ڕۆیتەرز ئاگەدار بکاتەوە کە پێویستە ڕێککەوتنێکی نوێ بۆ یەکسەر گواستنەوەی ئەو بەرژەوەندییانە بکرێ. ڕۆیتەرزیش بێ دوودڵی ئەو گواستنەوەیەی قبووڵ کرد و شاندێکی ڕۆژنامەوانیی هێندستانی داوەت کرد بچێتە ئینگلتەرا بۆ گفتوگۆ لەسەر ڕێککەوتنێکی نوێ، لەبەرئەوەی مۆڵەتی کارکردنی هێڵەکانی تێلیپرینتەری ڕۆیتەرز دەبوایە لە تەممووزی ١٩٤٧دا نوێ بکرێنەوە و بڕیارێکی حکوومەتی هیندستان هەبوو، دەیگوت جارێکی تر ئەو مۆڵەتە تەنیا بەئاژانسگەلی هیندستان دەدرێ. IENS لە ٢٧ی تەممووزی ١٩٤٨دا ڕای گەیاند کە بەڕێککەوتننامە نوێکە قایلە. ڕێککەوتننامەکە لە ٢١ی ئەیلوولدا ڕاگەیەنرا. لە ١٤ی کانوونی ١٩٤٩دا PTI پارەی پێویستی بۆ بوون بەهاوبەشی ڕۆیتەرز حەواڵە کرد و ئەو هاوبەشییە لە ١ی شوباتەوە کارا بوو. بەمە پرێس ترەستی هیندستان PTI کە لە ئابی ١٩٤٧ەوە وەک کۆمپانیایەک تۆمار کرابوو، لە ١ی شوباتی ١٩٤٩ کەوتە کار.

سەرەتا PTI وەک تاقیکردنەوەیەکی قازانج نەویست دەستی پێ کرد. بەپێی ئەو یاداشتنامە و بڕگەکانی پێڕۆی کۆمپانیاکە، خاوەنداریی پشک تەنیا بۆ ئەو ڕۆژنامانە بوو کە لە هیندستان بەشێوەیەکی ڕێکوپێک دەردەچن و ئابوونەش بۆ

وەدەستهێنانی خزمەتگوزارییەکانی کۆمپانیاکە دەدەن. خاوەن پشکەکان هیچ قازانجێک وەرناگرن و قازانجی کۆمپانیاکە تەنیا بۆ پێشخستنی ئەو چالاکییە پیشەییانە بەکار دێت کە ئامانجی بنەڕەتیی کۆمپانیاکەن. هەروەها پێڕۆکە دەڵێ "نابێ هیچ کاتێ کۆنترۆڵی کۆمپانیاکە بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی لایەنێکی خاوەن بەرژەوەندی، ئەو لایەنە گرووپ یا تایەفەیەک بێ". بەڕێوەبەرایەتیی کۆمپانیاکە لە لایەن بەڕێوەبەرێکی گشتی و دەستەیەکی کارگێڕیی ١٤ کەسییەوە بوو، ١٠ لەو کارگێڕانە لە لایەن ڕۆژنامەکانەوە دانرابوون و چوارەکەی تریش کەسایەتیی گشتی بوون. هەروەها ساڵانە سەرۆکێک بۆ کۆمپانیاکە هەڵدەبژێردرا.

بۆ بەڕێوەبردنی بەشەکەی هیندستان لە بارەگای سەرەکیی رۆیتەرز لە لەندەن، گ پارتاسارتی کە لە ساڵی ١٩٣٦ەوە نووسیاری هیندو بوو، لە لایەن PTIەوە هەڵبژێررا. ک گۆپالان کە یەکێک بوو لە کارگێڕە دیارەکان، هەر لە سەردەمی APIەوە، وەک یاریدەری ئەو داستنیشان کرا. ئەم دووە لە ٢٠ نیسانی ١٩٤٩ گەیشتنە لەندەن و لەوێ بۆیان دەرکەوت کە بەشەکەی هیندستان لە شەش کەس پێک هاتووە، پێنجیان هیچ لە بارودۆخی هیندستان نازانن تەنانەت شارەزای جوگرافیای ئەو وڵاتەش نین، شەشەمەکەشیان دوورە پێوەندییەکی بەهیندستانەوە هەبوو بەوەی بیست ساڵێک بەر لەوە وەک نووسیاری یاریدەر لە ستەیتسمان لە کالکوتتا کاری کردبوو. جگە لەوەش ئەم پیاوە زۆر لەمێژ بوو کاتی خانەنشینکردنی هاتبوو.

رۆیتەرز ڕێککەوتننامەکەی پێشێل کرد بەوەی نوێنەرانی خۆی ناردە ناوچەگەلێک کە لە ڕێککەوتننامەکەدا بۆ PTI دانرابوون بەبێ ئەوەی، وەک لە ڕێککەوتننامەکەدا هاتووە، پێشوەخت ڕاوێژی پێ بکات. جگە لەمەش رۆیتەرز کاری بۆ ئەوە دەکرد ڕێککەوتنێک لەگەڵ ئیسترن نیوس ترەستی پاکستان بکا. خاڵێکی تریش ئەوە بوو کە بەردەوام هەواڵنێرێکی بریتانیایی لە نیودێلهی دادەنا. هەروەها رۆیتەرز دەیویست گۆڕانکاری لە مەرجەکانی ڕێککەوتننامەکەدا بکا: لە بڕگەی سێیەمی "دووبارەکردنەوەی پرنسیپەکان" کە چوارچێوەیەک بۆ هاوپشکییەکە دادەڕێژێ، هاتووە "گشت لە بەش مەزنترە و هەر ماف یاخۆ ئیمتیازێکی بەشێک نابێ ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ کار بکاتە سەر گشتەوە".

له ١٣ی ئابی ١٩٥٢ دکـتـۆر ب ڤ کـێـسکار، وەزیری ڕاگـەیاندن و وەشـان لە حکوومـەتی هیندسـتـان، ئەمـەی بۆ ک سرینیڤـاسـانی نووسـیـار لە هیندو نووسی "حکوومـەت پێشبـینی دەکـا PTI زیاتر و زیاتر لەسـەر پێیـانی بووەسـتێ، هەر لەو ئاسـتـەدا نەمـێنێ کـە تەنیـا پاشکۆی ئاژانسگەلی تری جـیـهـانی بێ بگرە دەبێ هاوشانی ئەوان بێ، یان تەنیا لق و پارەدەر بێ لە هەموو یەکیەتییەکی نێودەوڵەتیدا. ئێمـە ئەگەر بزانین PTI بووەتە بەشێک لە ڕێککەوتنێک کە لەو ئاسـتە نزمـتر بێ ئێمـە چاوەڕوانین، یاخۆ بووەتە پاشکۆی هەر تۆڕێکی بێگانە یا نێودەوڵەتی، ئەوا ئەو کات بەوردی دووبارە چاو بەبابەتی بەردەوامیـمان لە هاوکاریکردنی PTIدا، کە تا ئێستا کردوومانە، دەخشێنینەوە".

نەهرۆی سـەرۆک وەزیرانیش ئەمـەی بۆ سرینیڤـاسان نـووسیـوە "من وەک سـەرۆک وەزیران پێم خـۆش نییە دەست لە ڕێککەوتننامـەی هاوبەشکیی نێوان PTI و ڕۆیتەرز وەردەم. لەبەرئەوەی ئەوە لـە بنەڕەتدا کـاری کـارگێڕانی PTIە. بەڵام بەهـۆی ئـەو مـانا زۆرانەی لە خـۆی دەگرێ، گومـانـی تێدا نییـە کە بایەخی زۆر بەم بـابەتە دەدەم. من خـۆشـحـاڵم بەبینینی ئاژانـسگەلـی دەنگوباسـی نیـشـتـمـانی لە هیندسـتـاندا و بەپێشکەوتنیـان و بۆیە پێم خـۆشـە لەو ڕوانگەیەوە تـاوتوێی هەر پێشنیـازێک بکرێ".
بەدیدی ئەو جیـاوازیی سـەرەکیی نێوان PTI و ڕۆیتـەرز لە سیـاسـەتەکانی دەرەوەی هەردوو وڵاتدا دەردەکـەوێ. لە ڕێککەوتننامـەکـەشـدا وا دیار بـوو کـە ڕۆیتـەرز پێی خـۆش نییـە PTI بۆچوونەکـانی هیندسـتـان لە بارەی کـاروباری نێودەوڵەتییـەوە بڵاو بکاتەوە، بەتایبـەتی لە وڵاتـانی ئاسیـادا، هـەروەهـا ویسـتی ڕۆیتـەرزی پێشـان دەدا بۆ زیاتر کۆنتـرۆڵکردنی PTI. ئەم پرسـە کە لەو کاتەدا سـەری هەڵدا، لە کاتی داڕشـتنی ڕێککەوتننامـە ئەسڵـییـەکەدا لەبەر چـاو نەگیـرابوو لەبـەرئەوەی لەو کـاتەدا هێـشـتـا سیـاسـەتی دەرەوەی هیندسـتـان پێ نـەگەیشـتبوو. سـەرۆک وەزیران ئەوەشی ڕوون کـردەوە کـە سـیـاسـەتەکـانی هیندسـتـان لە ڕۆژهەڵاتی نـاوەڕاست و باشـووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا، ناوچەی هیندی بەشی PTI بوو، جێی مەترسی بوون بۆ ڕۆیتەرز کە کـاری بۆ ئەوە دەکـرد چالاکییـەکانی PTI لەو ناوچانەدا کـەمـتر بکاتەوە. تەنانەت ئەوان یەک هـەواڵنێریان نـاردە هیندسـتان و لە لایەن کـەسێکی سـەر بەڕۆیتـەرزیش لە

پاکستانەوە پرۆپاگاندای لایەندار بڵاو دەکرانەوە. بۆیە نەهرۆ پێی وا بوو ئەگەر بێ و دەسەڵاتی PTI تەنیا کۆنترۆڵی ئەو هەواڵانە بکا کە لە هیندستانەوە دەردەچن ئەوە هیچ سوودێکی نییە "من زیاتر گرینگی بەو هەواڵانە دەدەم کە دەچن و دێن لە شوێنگەلی وەک قاهیرە و بەغدا و تاران و رانگوون و سینگاپۆر و جاکارتاوە". بۆیە ئەو شێوە دارشتنە نوێیەی رۆیتەرز پێشنیازی کردبوو لە ٢٠ی ئەیلوولی ١٩٥٢ لەلایەن دەستەی کارگێریی PTIەوە رەت کرایەوە، بەم شێوەیەش کۆتایی بەهاوپشکیی نێوان ئەو دوو ئاژانسە هات. "لە ساڵی ١٩٥٣ەوە کە PTI بووە ئاژانسێکی سەربەخۆ، خۆشحاڵیی ئێمە بەمە وەک خۆشحاڵیی جەواهەرلال بوو بەکۆتاییهاتنی ئەو ماوەیەی هیندستانی لە بەدەستهێنانی سەربەخۆیی دوور دەخستەوە و دامەزراندنی کۆماری خاوەن سەروەریی هیندستان، چونکە ئەو لەو ماوەیەدا بەناچاری دەبوو پێوەندییەکانی لەگەڵ خاوەن شکۆدا بەو وشە و زاراوانە برازێنێتەوە کە دڵسۆزیی ئەمیان بۆ خاوەن شکۆ نیشان دەدا".

ئەو تۆڕی تێلیپرینتەرە سی هەزار کیلۆمەترییەی لە APIەوە وەک میراتی بۆ PTI مایەوە، فرەوان کرایەوە و لە ساڵی ١٩٧٥دا بووە ٥٥ هەزار کیلۆمەتر. PTI سەرەتا بە ٣٠ نووسینگە دەستی پێ کرد و ئێستا حەفتا نووسینگەی لە زۆربەی شار و شارۆکەکاندا هەیە. ساڵی ١٩٧٠ ژمارەی تێلیپرینتەرەکانی کە نووسینگەکانیان بەیەکەوە دەبەستنەوە ١١٥٠ دانە بوو و ساڵی ١٩٧٢ بوون بە ١١٦٠ و، لە ١٩٧٤ بوون بە ١١٨٠ و لە ١٩٧٤-١٩٧٥ بوونە ١٢٠٠ لە ساڵی ١٩٧٥ ژمارەی ئەو کەسانەی کاریان تێدا دەکرد ١٢٥١ کەس بوون، ١٨١یان رۆژنامەوان بوون و ٢٦٨یان هاوکار بوون و ٨٠١یش کارەکانی تری نارۆژنامەوانییان دەکرد. ئەو زانیارییانەی لەبەر دەستمانن لە بارەی زیادبوونی داهاتی PTI ئەوە نیشان دەدەن کە لە ساڵی ١٩٧١دا داهاتەکەی ١٥٢ ملیۆن روپێ بووە و لە ١٩٧٥دا بووەتە ١٩٠ ملیۆن روپێ. ئەم زانیارییانەی باسمان کردن گەشەکردنی ئاژانسەکە نیشان دەدەن، بەڵام ئەم جۆرە گەشەکردنە بەم شێوەیە بەردەوام نەبوو.

ئاستی چالاکییەکانی PTI لە دەرەوەی وڵاتدا نەدەگەیشتنە ئاستی داپۆشینەکانی لە ناوەوەی وڵاتدا و، هۆی سەرەکیی ئەمەش نەبوونی پارەی پێویست بوو. ژمارەی

هەواڵنێرانی دەرەوەش لە کەمبوونەوەی بەردەوامدا بوو، لە چەند قۆناخێکی جیاوازدا لە نێوان ١٢ و ٩ بوو و، لە کۆتاییدا و بەهاتنی ساڵی ١٩٧٥ بوونە تەنیا پێنج هەواڵنێر لە نەتەوە یەکگرتووەکان و مۆسکۆ و کاتماندو و کۆلۆمبۆ و لەندەن. ئەگەر بگەڕێینەوە زووتر دەبینین هەواڵنێرانی ڕاوکەری هەواڵ نەک تەنیا لە شوێنە دوورەکانی وەک قاهیرە و بەلگراد و کوالا لامپور و تۆکیۆدا هەبوون بگرە لە شوێنانی نزیکی وەک دەککا و کاراچی و ڕاواڵپندیش هەبوون.

ساڵی ١٩٥٩، هاوپشکیی قۆرخکراوی PTI لەگەڵ ڕۆیتەرزدا بۆ کڕینی هەواڵەکانی ڕۆیتەرز بەکۆتا گەیشت. دوای ئەمە PTI دەرگەکانی خۆی بەڕووی گۆڕەپانی ڕووداوگەلی جیهاندا لە ڕێی چەندین ڕێککەوتن لەگەڵ ١٤ لە ئاژانسە بێگانەکانەوە کردەوە، لەوانە ڕۆیتەرز (بریتانیا)، AFP (فرانسە)، UPI (ئەمەریکا)، تانیوگ (یۆگۆسلاڤیا)، ئانتارا (ئیندۆنیسیا)، پۆلسکا ئەجێنسیا پراشۆڤا (پۆڵاند)، ئەلگماینەر دۆیچەر ناخریشتندێنشت (ئەڵمانیای دیموکرات)، BSS (بەنگلادیش)، نۆڤۆستی (یەکیەتی سۆڤێت)، بەرناما (مالیزیا)، پرینسا لاتینا (کووبا) و، ئاگرپرێس (ڕۆمانیا).

## یونایتد نیوسی هیندستان UNI

یونایتد پرێسی هیندستان UPI دوای ٢٥ ساڵ تەمەن، لە ١٩٥٨دا ڕووخا و، دەبوایە ئەو بۆشاییە پڕ بکرێتەوە. ڕاپۆرتی کۆمیتەی ڕۆژنامەوانی (بۆ ساڵانی ١٩٥٢ تا ١٩٥٤) باسی ئەوەی کرد کە "پێویستی بەلایەنی کەمەوە دوو ئاژانسی دەنگوباس هەبن، هەر یەکێکیان کێبەرکی لەگەڵ ئەوەی تردا بکا و وەک ڕاستکەرەوەیەک بۆ ئەوەی تر کار بکات". ڕۆژنامەکانیش هەمان شتیان بەلاەو ڕاست بوو. یونایتد نیوسی هیندستان UNI لە لایەن هەشت ڕۆژنامەوە سەرپەرشتی دەکرا: هیندو، تایمز ئەڤ ئینديا، ستەیتسمان، ئامریت بازار پاتریکا، هیندوستان تایمز، هیندوستان ستاندارد، دێککان هیراڵد و، ئاریاڤارتا. لە ١٩ی کانوونی یەکەمی ١٩٥٩ وەک کۆمپانیایەک تۆمار کرا.

لە ڕۆژی یەکەمی کارکردنیدا، ٢١ی ئاداری ١٩٦١، UNI تەنیا دوو هەواڵی نارد لە

کابینەکەی خۆیەوە لە باڵەخانەی IENSدا. هەواڵەکان یەکێکیان لە دوکتۆر ب ڤ کەسکار، وەزیری ڕاگەیاندن و وەشان بوو و ئەوەی تریان لە بەڕێز ئەلفرێد چارلتن، نووسیاری پێشووی ستەیتسمانەوە بوو.

ماوەیەک ئاژانسەکە ناچار بوو ئامێرە کۆنەکانی تێلیپرینتەری ژەنگ گرتوو بەهۆی کارنەکردنەوە، کە لە UPIوە بۆی مابوونەوە بەکار بهێنێ. بەم سەرەتا ئاساییە، UNI گەشەی کرد و لە ماوەی یەک دەیەدا بووە یەکێک لە ئاژانسە گرینگەکانی گۆڕپانی ململانێ. بەشداربووانی UNI لە ساڵی ١٩٦١دا تەنیا ١٣ بەشداربوو بوون و، لە ١٩٦٤دا بوون بە ٥٠ و، لە ١٩٦٧دا ١٠٩ و، لە ١٩٧١دا ,٢٢٣ لە ساڵی ١٩٧١دا UNI خاوەنی ٢٤٩ تێلیپرینتەر و ٤٣ بنکە بوو و، بەهاتنی ساڵی ١٩٧٥ش ٥٣ نووسینگەکەی UNI لە سەرانسەری وڵاتدا لە ڕێی ٤٠٨ تێلیپرینتەرەوە بەیەکەوە بەسترابوونەوە. لە ماوەی دە ساڵی تەمەنیدا داهاتی UNI گەیشتە زیاتر لە ٥٤٣ ملیۆن ڕوپێ و، لە ساڵی ١٩٧٤ داهاتەکەی زیاتر لە ٦٧٧ ملیۆن ڕوپێ بوو و، لە ١٩٧٥دا گەیشتە زیاتر لە ٨٧١ ملیۆن ڕوپێ. کە دەستی بەکار کرد UNI تەنیا نووسینگەیەکی پێنج کەسی بوو، بەڵام لە ساڵی ١٩٧٥دا ژمارەی کارمەندانی ٦٩٧ کارمەند بوو کە ١٣٩ ڕۆژنامەوانیان تێدابوو لە پاڵ ٣٩٢ ناڕۆژنامەوان و ١٦٦ هاوکار. هەنگاروەکانی گەشەی UNI زۆر خێرا بوون، بەڵام بەگشتی و بەبەراورد لەگەڵ پێویستیی وڵاتدا هێشتا بەپێی پێویست نەبوو.

UNIچەند خزمەتگوزارییەکی تایبەتمەندی دەست پێ کرد. لە ١٩٦٨دا خزمەتگوزارییەکی هەفتانەی پێشکێش کرد کە برێتی بوو لە باکگراوندێکی تێروتەسەل و بەڵگەدار بۆ گرینگترین بابەتەکانی هەفتە. لە ١٩٧٠دا دەست کرا بەبڵاوکردنەوەی هەواڵە کشتوکاڵییەکان و خزمەتگوزارییە تایبەتەکانی UNI کە هەوڵێکی پێشەنگ بوو لە بواری ڕۆژنامەوانیی کشتوکاڵیدا. خزمەتگوزاریی دراو و بازرگانیش ڕاپۆرتی باشی لەسەر بازاڕەکانی هیندستان و بازاڕە بێگانەکان پێشکێش دەکرد. دوایین خزمەتگوزاریش لە زنجیرە خزمەتگوزارییەکانی پۆستەی ئاسمانیی هەواڵەکانی UNI بوو لە ١٩٧١دا کە لە پێناو هاتنی لێشاوێکی بەردەوام و نەگۆڕی زانیاریی پێشکەوتوو و واقیعی بوو بۆ وەرزنامەکان. هەروەها UNI یەکەمین

ئاژانس بوو کە بەختی خۆی لە بواری داپۆشینی زانستیدا تاقی بکاتەوە و بۆ ئەم مەبەستەش هەواڵنێرێکی زانستیی هەبوو.

بۆ هەواڵەکانی جیهانیش UNI ڕێککەوتنی لەگەڵ ئەسۆشیێتد پرێس (ئەمەریکا) و دۆیچە پرێس ئاگێنتووە (ئەڵمانیای ڕۆژئاوا) و ئاگێنسیا ناسیۆنالێ ستامپا ئەسۆسیاتا (ئیتاڵیا) و ئاگرپرێس (ڕۆمانیا) و سیتیکا (چیکۆسلۆڤاکیا) و ژیژی (ژاپۆن) و ئیسترن نیوس ئەجنسی (بەنگلادیش و راشتریا سامباد سامیتی (نیپال) و تانیونگ (یۆگۆسلاڤیا)دا هەبوو. UNI چوار هاوکاری هەبوون لە هۆنگ کۆنگ و سینگاپۆر و کابول و کۆلۆمبۆ، هەروەها لە داککا و کاتماندو خەڵکی سەر بەخۆی هەبوو. بۆ بەهێزکردنی هەواڵەکانی دەرەوەی، یەکەیەکی گوێ شلکردنی رادیۆی هەبوو بۆ وەرگرتنی هەواڵەکان لە تۆڕە رادیۆییە سەرەکییەکانی جیهانەوە.

### هیندوستان ساماچار

س س ئاپتی یەکەمین ئاژانسی فرەزمانی هیندستانی، هیندوستان ساماچار، لە بۆمبەیدا وەک کۆمپانیایەکی سنوورداری کەرتی تایبەت لە ١٩٤٨دا دامەزراند. ئامانجی ڕاگەیەنراوی ئەم ئاژانسە ڕۆشنبیرکردنی جەماوەر بوو بۆ ئەوەی ڕۆڵی خۆیان لە پێشکەوتنی نەتەوەییدا بگێڕن و خەبات بۆ یەکیەتی نەتەوەیی بکەن، ئەویش بەچالاککردنی هەموو زمانەکانی هیندستان. ئەم هەوڵە سەرەتاییە تەنیا لە سنووری بڵاوکردنەوەی هەواڵ لە ڕۆژنامە ناوخۆییەکاندا بوو و لە ڕێی تێلێگرامی دیڤاناگارییەوە.

بەهاتنی تێلیپرینتەرەکانی دیڤاناگاری بارەکە کەمێک باشتر بوو (خزمەتگوزاریی تێلیپرینتەر لە ساڵی ١٩٥٤دا لە لایەن پورشۆتام داس تاندۆن، کرایەوە)، بەڵام گرانیی نرخی گواستنەوەی هەواڵ وای لە بەرێز ئاپتی کرد ئاژانسەکە بخاتە ژێر دەستی کۆمەڵەیەکی هاوکاریی کرێکارانەوە. ساڵی ١٩٥٧، بووە کۆمەڵەیەک بەناوی کۆمەڵەی هاوکاریی هیندوستان ساماچار، بارەگای سەرەکیشی لە نیو دێلهی بوو. ئەم ئاژانسە لەبەرئەوەی کۆمەڵەیەکی هاوکاریی کرێکاران بوو توانیی خۆی لە کۆنترۆڵی حکوومەت و موڵکداریی ڕۆژنامەکان ڕزگار بکا.

ساڵی ١٩٧٥ بازنەیەکی تێلیپرینتەری هەبوو کە ٢١ نووسینگەکانی ئاژانسەکەی بەیەکەوە دەبەستەوە. هەروەها نووسینگەشی لە نیپال و سیککیم و بۆتانیشدا هەبوو. لە ڕووی داراییەوە لە بهاراتی ساماچار دەوڵەمەنتر بوو. داهاتی ئاژانسەکە لە ساڵی ١٩٧١دا لە ٧٩ ملیۆن ڕوپێ زیاتر بوو و لە ١٩٧٥دا بووە زیاتر لە ١٠٧ ملیۆن ڕوپێ. ژمارەی کارمەندانی ١٦٢ کارمەند بوون، ٧٤یان ڕۆژنامەوان و ٦٨ ناڕۆژنامەوان و ٢٠ هاوکار.

ئەم ئاژانسە هەواڵی بەزیاتر لە ١٣٥ بەشداربوو دەگەیاند و بەدە زمان: هیندی، گوجاراتی، ماراتی، پونجابی، ئوردو، بەنگالی، ئۆریا، ئاسسامەسە، تێلێگو و مالایالام. خزمەتگوزاریی تێلیپرینتەر تەنیا بەزمانەکانی هیندی و ماراتی بوون. ئەو کۆپییانەی لە هەواڵنێرانەوە دەنێردرانە بارەگای سەرەکی، دوای نووسینەوەیان ئاراستەی بنکەکانی ئاژانسەکە لە ناوچەکاندا دەکرا و لە هەر بنکەیەکدا وەردەگێڕدرانە سەر زمانی ئەو ناوچەیە و دەگەیەنرانە بەشدارەکان.

ئاژانسەکە چالاکیی تریشی هەبوو بۆ بەدەستهێنانی سەرچاوەی تری داهات و دۆزینەوەی بواری تر بۆ دروستکردنی ریپۆرتاج، بۆ نموونە کتێبێکی ساڵانەی بەناوی ڤارشیکی بۆ ئەم مەبەستە دەردەکرد.

خزمەتگوزارییەکی مانگانەشی هەبوو بەناوی یوگڤارتا، ئەم مانگنامەیە نزیکەی ١٥ بابەتی جۆراوجۆری هەواڵی ناوخۆیی گرینگی لەخۆ دەگرت.

### ساماچار بهارتی

ئاژانسی زمانی دووەم، ساماچار بهارتی، لە ١٩٦٢دا وەک کۆمپانیایەک تۆمار کرا و لە ٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٦ کەوتە کار و لە ١ی کانوونی دووەمی ١٩٦٧دا دەستی کرد بەبڵاوکردنەوەی بازرگانانەی هەواڵ. ساڵی ١٩٧٠، ئەم ئاژانسە بەشێوەیەکی نیمچە تەواو گوێزرایەوە و بووە کۆمپانیایەکی نیوحکوومەتی لەگەڵ حکوومەتەکانی هەرێمەکانی بیهار و گوجارات و ڕاجاستان و کارناتاکا کە زیاتر لە نیوەی پشکەکانی کۆمپانیاکەیان هەبوو. یەکەمین سەرۆکی ئەم کۆمپانیایە پارێزگاری بۆمبەی، سری پراکاسا، بوو. هەروەها جایاپراکاش نارایەن، چەند

ساڵێک سەرۆکایەتیی کرد. لەگەڵ ئەوەشدا سەرمایەی ساماچار بھارتی بەپێی پشکەکان گەلێ زۆر بوو، بەڵام ئەم ئاژانسە لە ڕووی داراییەوە بەلاوازی مایەوە. تەنانەت وای لێ ھات لە ساڵی ١٩٧٦دا ١٦ ملیۆن ڕوپێ قەرزاری مووچەی کارمەندان بوو، جگە لە نزیکەی ٩٦ ملیۆن ڕوپێ قەرزی دانەپۆشراو. لە بەرامبەر ئەمەشدا، داھاتەکەی لە ساڵی ١٩٧٥ تەنیا ٥٥ ملیۆن ڕوپێ بوو. لە ساڵانی ١٩٧١ تا ١٩٧٥ ژمارەی تێلیپرینتەرەکانی وەک خۆی، واتە ٤٥ دانە، مایەوە کە ١٣ نووسینگەی ئاژانسەکەیان بەیەکەوە دەبەستەوە. ھیچ بەھێزبوونێکی دیاریش بەستافەکەیەوە دیاری نەدا. ساڵی ١٩٧٥، ژمارەی کارمەندەکانی ١٣٨ کەس بوون، لەوانە ٤٠ ڕۆژنامەوان و ٤٨ ناڕۆژنامەوان و ٥٠کەی تریش ھاوکار بوون. ساڵی ١٩٧١ ژمارەی کارمەندان ١٤١ بوو، ٤١یان ڕۆژنامەوان و ٥٠ ناڕۆژنامەوان و ٥٠ ھاوکار.

سەرەڕای ھەموو ئەمانە، لە پاڵ کێماسیی داراییدا، ئاژانسەکە خزمەتگوزاریی بەنرخی پێشکێش کرد، بەوەی ھەواڵی بەڕۆژنامەکانی زمانە جیاجیاکان دەدا، زۆربەی ئەو ڕۆژنامانەش ڕۆژنامەی بچووک و مامناوەندی بوون، بەزمانەکانی ھیندی و ماراتی و گوجاراتی و کانادا و ئوردو و پونجابی. لە نێو بەشداربووەکاندا ٥٠ ڕۆژنامە ھەبوون لە پاڵ ئاژانسەکانی زانیاریی AIR و حکوومەتیش. لە ساڵی ١٩٧٣وە دەستی بەدەرکردنی بەلاڤۆکێکی ساڵانەی زانیاری بەزمانی ھیندی بەناوی دیش ئاور دونیا. ھەروەھا خزمەتگوزارییەکی تایبەتی ھەبوو بەناوی بھاراتی. ئاژانسەکە لە زۆر کاتی جیاجیادا سیمینار و وۆرکشۆپێ ڕێک دەخست بۆ پێشکێشکردنی مەشقی پیشەیی ڕۆژنامەوانانی زمان و ھاوکارانیان.

## ساماچار

ھەر چوار ئاژانسی PTI و UNI و ھیندوستان ساماچار و ساماچار بھاراتی ناسنامە جیاوازەکانی خۆیان تێکەڵ بەیەک کرد و لە شوباتی ١٩٧٦دا بوون بە"ساماچار".

بڕیاری "داڕشتنەوەی" ئەم چوار ئاژانسی تێلیپرینتەرە لەلایەن سەرۆک وەزیران

ئەندیرا گاندییەوە بوو لە کۆبوونەوەیەکدا لە نووسینگەی خۆی لە ٢٦ی تەمووزی ١٩٧٥ پێش ئەوەش وەزیری ڕاگەیاندن و وەشان، ڤ ک شوکلا، چەند جارێک لەگەڵ سەرۆک و نوێنەرانی چوار ئاژانسەکە کۆ بووبووەوە و پێشنیازی خۆی بۆ تێکەڵکردنی ئاژانسەکان لە یەک ئاژانسدا تاوتوێ کردبوو.

لە کانوونی یەکەمی ١٩٧٥دا حکوومەت خەریکی تاوتوێکردنی پێشنیازێک بوو بۆ دامەزراندنی دەزگایەکی هاوپشک، بەپێی یاسای پەرلەمان، کە ئەو چوار ئاژانسە لە خۆی بگرێ. بڕیار بوو ئەنجوومەنی حوکم لەلایەن سەرۆکی وڵاتەوە دەستنیشان بکرێ. لەبەرئەوەی باری دارایی هەر چوار ئاژانسەکە لەوپەڕی خراپیدا بوو بۆیە هیچ یەکێکیان داوای قەرەبووکردنەوەی نەکرد و تەنیا بەشتێکی کەم قایل بوون. پێشنیازی تێکەڵکردنی ئاژانسەکان بەپێی یاسای پەرلەمان لە لایەن حکوومەتەوە ڕەت کرایەوە و لە جیاتی ئەمە حکوومەت گفتوگۆی لەسەر "شێوازی تر" کرد بۆ تێکەڵکردنی ئاژانسەکان. بۆیە لە کۆتاییدا بڕیار درا کۆمەڵەیەکی تۆمارکراو دروست بکرێ.

لەو کاتەی هەوڵەکان بەردەوام بوون بۆ "قایلکردنی" سەرانی ئاژانسەکان بەتێکەڵکردنەکە، چەندین هەنگاوی تر لە لایەن حکوومەتەوە ئەنجام دران. بۆ نموونە رادیۆی هەموو هیندستان، کە دوایی بووە فەرمانگەیەکی حکوومەت، لە ٢ی کانوونی دووەمی ١٩٧٦دا ئاگەداریی ئاراستەی PTI و UNI کرد و پێی ڕاگەیاندن کە بەشدارییەکەی لای ئەوان ڕادەگرێ و لە ١ی شوباتەوە کار بەمە دەکا. ڕێککەوتنە فەرمییەکان لە ساڵی ١٩٧٢وەوە کۆتاییان پێ هاتبوو، بۆیە ئەو جۆرە ئاگەدارکردنەوانە تووشی هیچ کێشەیەکی یاساییان نەدەکرد. خزمەتگوزاریی تێلیپرینتەر کە لەلایەن چەند فەرمانگەیەکی حکوومەت و شوێنی حەوانەوەی وەزیرانەوە دەستیان بەسەردا گیرا و کۆتاییان پێ هات. کاردانەوەی ئاژانسەکان بەرامبەر بەم کردەوانە جیاواز بوون لە یەک و پێوەست بوون بەبارودۆخی تایبەتی هەر یەکێکیانەوە.

یەکیەتیەکانی ئەو کەسانەی کاریان لەو ئاژانسانەدا دەکرد، بڕیاریان دا بیرۆکەی ئاژانسێکی تاقانەی نەتەوەیی دەنگوباس قبووڵ بکەن. لەبەرئەوەی کارمەندان پێیان

وا بوو کارکردن له دەزگایەکی گەورەتری تایبەت بەهەموو هیندستان بێگومان بەهیچ شێوەیەک دژ بەبەرژەوەندیی ئەوان نابێ. بۆیە بەشێک لە بۆچوونەکان دەستیان بەوەوە دەگرت کە پێویستە ولات یەک ئاژانسی سەرەکیی دەنگوباسی هەبێ، بەڵگەی لەم جۆرەش لە لایەن زۆر لە گەورە ڕۆژنامەوانانەوە خرایە بەر چاوانمان، بەوانەشەوە کە وەک دەرهاویشتەی دروستکردنی ساماچار، لە سایەی باری نائاساییدا دووچاری کێشە هاتن.

له ٢١ی کانوونی دووەمی ١٩٧٦دا، ڤ ک شوکلا وتارێکی دا لە لۆک سابها (خانەی گەل - پەرلەمان) ئەوەی ڕاگەیاند کە حکوومەت پێشوازیی لەو پێشنیازانە کردووە کە ئاژانسەکانی دەنگوباس بۆ تێکەڵبوونیان خستبوویانە ڕوو. بەپێچەوانەی ئەو پێشنیازەشەوە کە داوای دامەزراندنی کۆمپانیایەکی یاسایی حکوومەت خاوەنی بێ و لە کانوونی یەکەمی ١٩٧٥دا بڕیاری لەسەر درا، کۆمەڵەیەک بەپێی یاسای تۆمارکردنی کۆمەڵەکانی ساڵی ١٨٦٠، تۆمار کرا وەک بەدەنگەوەهاتنی داواکارییەک لە ٢٤ی کانوونی دووەمی ١٩٧٦ پێشکێش کرا و حەفت کەس ئیمزایان کردبوو. داواکارەکان بریتی بوون لە: گ کاستوری و پ ک گوپتا و دوکتۆر ڕام س تارنیجا و عابید عەلی خان و دوکتۆر ل م سینگڤی و ن راجان و ب ک جوشی.

هێڵی متمانەی ساماچار لە ١ی شوباتی ١٩٧٦ەوە دەستی بەدەرکەوتن کرد دوای ئەوەی چوار ئاژانسەکە لە ٢٩ی کانوونی دووەمدا ڕێککەوتننامەیەکیان ئیمزا کرد. بەمەش ئاژانسەکان هێزی یاساییان دا بەکۆمیتەی بەڕێوەبردنی ساماچار بۆ ئەوەی هەموو کارە بازرگانییەکان بەناوی ئەوانەوە بەڕێوە بەرێ و کارگێڕیی هەر چوار ئاژانسەکەش ئەمەیان پەسەند کرد. لەگەڵ ئەوەی بڕیار وا بوو لە ١ی نیسانی ١٩٧٦ەوە دەستبەکار بێ، کۆمیتەی بەڕێوەبردنی ساماچار دەستی بەکار کرد و ئەو بازرگانییانەی بەڕێوە دەبرد کە هی چوار ئاژانسەکە بوون.

کۆمەڵەی ئاژانسەکانی ولاتانی بێلایەن NANAP لە ساڵی ١٩٧٦ دروست کرا. ساماچار هاوپشکە هیندییەکە بوو لە ڕێککەوتننامەی دامەزراندنی ئەو کۆمەڵەیەدا. پێش هاتنەکایەی بیرۆکەی دروستکردنی کۆمەڵەی ئاژانسەکانی ولاتانی بێلایەن، ساماچار بۆ بەدەستهێنانی هەواڵەکانی نێودەوڵەتی پشتی بەو هەوالانە دەبەست کە

له ئاژانسه‌کانی رۆیته‌رز (بریتانیا) و AP (ئه‌مه‌ریکا) و AFP (فرانسه) وه‌ری ده‌گرتن. جگه له‌مانه‌ش رێککه‌وتنی دوولایه‌نه‌ی له‌گه‌ڵ ئه‌م ئاژانسانه هه‌بوو: تاس (یه‌کیه‌تی سۆڤیێت) و PAP (پۆڵه‌ندا) و ADN (ئه‌ڵمانیا رۆژهه‌ڵات) و CETEKA (چیکۆسلۆڤاکیا) و کیۆدۆ (ژاپۆن) و ئاگرپرێس (رۆمانیا) و ANSA (ئیتاڵیا) و پرینسا لاتینا (کووبا) و ئانتارا (ئیندۆنیسیا) و VNA (ڤێتنام) و تانیوگ (یۆگۆسلاڤیا) و BSS (به‌نگلادیش)، پێنجه‌که‌ی دواییش ئاژانسی نه‌ته‌وه‌یی ولاتگه‌لێکی بێلایه‌ن بوون.

دوای کۆنفرانسی نیو دێلهی له ته‌مووزی ١٩٧٦ و قبوولکردنی پرۆژه‌ی کۆمه‌ڵه‌ی ئاژانسه‌کانی ده‌نگوباس، ساماچار ده‌ستی به‌کاری خۆی کرد بۆ گۆڕینه‌وه‌ی هه‌واڵ له‌گه‌ڵ نۆ ئاژانسی ده‌نگوباسی ولاتانی بێلایه‌ن: QNA (قه‌ته‌ر)، INA (عێراق)، SUNA (سوودان)، ئالپرێس (جه‌زایر)، ماپرێس (مه‌راکش)، KNA (کینیا)، ENA (ئه‌تیوپیا)، ZANA (زامبیا) و به‌رناما (مالیزیا). له ماوه‌ی ئه‌و ساڵه‌دا (١٩٧٦-١٩٧٧) کار کرا بۆ هاوکاریکردن له‌گه‌ڵ حه‌فت ئاژانسی تری ولاتانی بێلایه‌ن: MENA (میسر)، ARNA (لیبیا)، GNA (گانا)، شیهاتا (تانزانیا)، نۆتیمیکس (مه‌کسیک)، RSS (نیپال) و SLBC (سری لانکا).

ساماچار دووباره باڵی هیندیی رێکخسته‌وه و خه‌ڵکی زیاتری بۆ ئه‌م مه‌به‌سته دامه‌زراند. ئه‌م باڵه ده‌ستی به‌پێشکێشکردنی خزمه‌تگوزاریی ته‌واوی به‌به‌شداربووان کرد و زۆر له رۆژنامه هیندییه‌کان که پێشتر له خزمه‌تگوزاریی ئینگلیزیدا به‌شدار بوون به‌شداریی خۆیان بۆ به‌شی هیندی گواسته‌وه. هه‌روه‌ها ده‌ست کرا به‌خزمه‌تگوزارییه‌ک به‌زمانی ماراتی.

ساماچار له هه‌ڵبژاردنه‌کانی ساڵی ١٩٧٧دا بووه پرسێکی سه‌ره‌کی و دوای ئه‌وه‌ی ئه‌ندیرا گاندی له‌و هه‌ڵبژاردنانه‌دا دۆڕاندی، دوارۆژی ئه‌م دامه‌زراوه‌یه به‌ته‌واوی دیاری کرا.

## کۆمیتەی کولدیپ نایار

حکوومـەتی هیندسـتـان کـۆمیـتـەیەکی دروست کـرد بۆ پێـداچوونەوە بەپێکهـاتەی سـامـاچاردا وەک ئاژانسـێکی دەنگوباس و پێـشنیـازکـردنی ڕێکخـسـتنەوەی ئاژانسـەکـە. ئەم کـۆمـیـتـەیە بەبڕیاری ژمـارە ٧٧١٤٣٠ ڕۆژنامـەوانیی وەزارەتی ڕاگەیاندن و وەشـان لە ١٩ی نیـسـاندا دروست کـرا. کـولدیپ نایار بوو بەسـەرۆکی کۆمیتەکە. ئەندامانی کۆمیتەش بریتی بوون لە: د ر مانکیکار و ک ر ئیرانی و ئا ک سـەرکـار و ک ر مالکانی و ڕاهول بارپوتـە و ئیرەت عـەلی سـدیقی و ک چاتهـوننی مـاسـتـەر و نیکیل چاکـراڤـارتی و س گ مـوناگـیکار و ر ڕاجـاگـۆپالان و ل دایال. کۆمیتەکە لە ئابی ١٩٧٧دا ڕاپۆرتی خۆی پێشکێش کرد.

کۆمیتەکە پێی باش بوو سـاماچار بکرێ بەدوو ئاژانس، یەکێکیـان خزمـەتگوزاری بەزمـانی ئینگلیـزی پێـشکێش بکا و ئەوەی تر بەزمـانگەلی هـیندی و هـەردووکـیـان بەیەکـەوە ئاژانسێکی نێودەوڵەتی ڕێک بخـەن. "ئێـمـە پێـشنیـاز دەکـەین سـامـاچار بتـوێنرێتـەوە و لە جـێـی ئەودا دوو ئاژانسی دەنگوباس دروست بکرێن: ڤـارتا و سـاندیش. ئەو دووەش لە لای خـۆیانـەوە بەهاوبەشی دەزگـایەک پێک بهـێـنن بۆ خـزمـەتگوزاریی نێودەوڵەتی کە دەکـری ناوی بنرێ نیوس ئیندیا. ئەم ڕێکخـستن نوێیـە، بەپێی پێشنیـازەکـانمان دەبێ لە لایەن پەرلەمـانەوە ئەنجام بـدرێ و لە ڕێ مۆڵەتنامەیەکەوە کە دوای دە ساڵ بخرێتە بەر پێداچوونەوە".

کۆمیـتـەکە گـوتـی دروسـتکردنی ئاژانسـەکەی دەنگوباسی بـەمۆڵەتێکی یاسـاییی پەرلەمان و کە سێ مـەرجی هـەبوو: یەکەم، پێویستە بنەماکانی بەرزیی جۆر بپارێزێ کە بریتین لە بابەتیـبوون و تێروتـەسـەلی و سـەربـەخـۆیی. دووەم، پێویسـتـە بنیـاتی ئاژانسەکان بپارێزێ. سـێیەم، پێویستە پارێزگاریی یـاسایی بۆ پرۆسـەی گۆڕینی ئەو ئاژانسـانەی هـەن بۆ پێکهـاتە نوێکە فـرەوان بکرێتـەوە. "ئێـمـە پێـشنیـاز دەکـەین بڕگـەکـانی یاسـاکـەی پـەرلەمـان بەو شـێـوەیە داڕێژرێن کە وا بـکەن کـۆکـردنەوە و بڵاوکـردنـەوەی هـەواڵ ئازاد بێ و نەکـەوێتـە ژێر کـاریگەریی هـیچ چاودێری یاخـۆ پاڵەپەسـتـۆ یاخـۆ دەسـەڵاتی حکوومـەت یان هـەر سـەرچـاوەیەکی ترەوە، هـەروەها پێویستە داپۆشینی هەواڵ گشتگر و بابەتییانە و سەربەخۆیانە بێ".

له ئاكامدا كۆميتەكە پێكهاتەی بنەڕەتیی ساماچاری پاراست و ناوگەلی جیاجیای له خزمەتگوزارییە ئینگلیزی و هیندی و نێودەوڵەتییەکانی نا، بەمەش هەر یەکێک لەوانی کرد بەقەوارەیەکی جیا لەوانی تر.

تێبینییەکی جیا لەم بیرکردنەوەیە له لایەن ک ر ئیرانی و ئا ک سەرکار ئەوەی پێشنیاز کرد کە "دەبێ ساماچار بکرێ بەدوو کوتەوە، هەر یەکێکیان ئاژانسێک بێ و لەگەڵ ئەوەی تردا له ململانەدا بێ و زمانی سەرەکیی هەردووکیان ئینگلیزی بێ لەبەر یەک هۆی سادە ئەویش ئەوەیە کە ئینگلیزی ئەو زمانەیە دەبێ خزمەتگوزارییەکان بەکاری بهێنن. ئەمەش بەتەواوی بەو بەڵگەیە پشتگیری دەکرێ کە خراوەتە بەر دەستانمان. هەردوو ئاژانسی PTI و UNI ناوبانگی زۆر باشیان بەدەست هێنا، له ناوەوەی وڵات و له دەرەوەشدا، پێش ئەوەی دەستیان بەسەردا بگیرێ و هیچ ڕێگرێک نییە کە ئەو دوو ئاژانسەی جێی ساماچار دەگرنەوە هەمان ئەو دوو ناوەیان هەبن. هەروەها پێویستە هەردوو ئاژانسەکە ئازاد بن لەوەی خزمەتگوزاری بەزمانی هیندی و زمانگەلی هەرێمەکان بکەنەوە و خۆیان چی بەباش دەزانن ئەوە بکەن. ئەگەر کێبەرکێ له خزمەتگوزاریی ئینگلیزی زمان گرینگ بێ ئەوە له خزمەتگوزارییەکانی تریش هەمان گرینگیی هەیە. من بەتوندی دژی ئەوەم ڤارتا بەتەنیا خزمەتگوزارییەکانی هیندی و زمانەکانی هەرێمەکان قۆرخ بکا، چونکە ئەم کارە تەنانەت له قازانجی ئەو ڕۆژنامانەشدا نییە کە بەو زمانانە دەردەچن. هەردوو ئاژانسەکە دەبێ ئازاد بن چ خزمەتگوزارییەک لەوبەری ئاوەکانەوە وەردەگرن. من بەتەواوی دژی ئەوەم داپۆشینی هەواڵەکانی نێودەوڵەتی له لایەن نیوس ئیندیاوە بەتەنیا قۆرخ بکرێ. بێگومان دەکرێ هەردوو ئاژانسەکە هاوبەشکییەکی سنووردار له نێوان خۆیاندا ڕێک بخەن، بەڵام دەبێ بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە ئازاد بن". ئەم دوو بەڕێزە ئاماژەیان بۆ ئەوە کرد کە ئاژانسێکی هیندی زمان "بۆ ئەمڕۆ نەگونجاوە و له داهاتووی نزیکیشدا بواری ژیانی نابێ". لەگەڵ ئەمەشدا ڕاپۆرتەکە هەموو ئەو بەڵگانەی پشتگوێ خست کە ڕۆژنامەکانی گەورە و بچووک، ئەوانەی بەزمانەکانی هیندستان دەردەچن، پێشکێشیان کردبوو و دەیانگوت ئەوان پێیان باشە خزمەتگوزارییەکە بەئینگلیزی بێ نەک بەزمانەکانی هیندستان و له هیندییەوە وەرگێڕدرابن.

فیدراسیۆنی رۆژنامەوانانی کارای هیندستان IFWJ نامیلکەیەکی بەناونیشانی "سەربڕینی ساماچار" بڵاو کردەوە، تێیدا کۆمەڵێ بۆچوونی لە بارەی ئەو راپۆرتە و پرسی ئاژانسەکانی دەنگوباس لە هیندستان کۆ کردبووەوە. "هەموو ئەو خەڵکە راستگۆیانەی ئاژانسی دەنگوباسیان لە هیندستاندا بەڕێوە بردووە دان بەوەدا دەنێن کە هیچ کێبەرکێیەکی راستەقینە لە نێوان PTI و UNIدا نەبووە. لە ڕاستیدا دەبێ کێبەرکێ لە نێوان ڕۆژنامەکاندا هەبێ و بەڕاستی هەیە. پێش پەیدابوونی ساماچار PTI و UNI بەهەردووکیانەوە ٣٨٣ بەشداریان هەبوو لە نێو ڕۆژنامەکاندا. لەم ژمارەیە تەنیا ٨١ ڕۆژنامە بەشداری هەردوو ئاژانسەکە بوون. بەکورتی زیاتر لە ٣٠٠ ڕۆژنامە هەبوون کە کێبەرکێی نێوان ئەو دوو ئاژانسە سەرنجیانی ڕانەکێشاوە لەو کاتەدا کە خزمەتگوزارییەکانی هەردووکیان لە بازاڕدا هەبوون. سەیریش ئەوەیە، پاڵەوانی ئازادی و باوکی ڕۆحیی کێبەرکێمان، کورشاو ئیرانی خاوەنی یەکێ لە دیارترین ڕۆژنامەکان و لە یەکەمین کەسەکان بوو کە بەشداریی ڕۆژنامەکەی لە UNI بڕی هەرچەندە ڕۆژنامەکەی یەکێک بوو لەو هەشت ڕۆژنامەیەی خاوەنی ئەو ئاژانسە بوون". جگە لەمەش، بەڵاڤۆکەکە راپۆرتێکی تێدابوو لەسەر سیمینارێکی چوار ساتی سەبارەت ساماچار، لە ١٣ی تشرینی یەکەمدا، بەسەرۆکایەتیی ک ڕاگاڤان سەرنووسیاری پێشووی PTI. ناوەڕۆکی سیمینارەکە بریتی بوو لەوەی "ساماچار بمێنێ و گۆڕانکارییەکی گونجاو لە پێکهاتەیدا بکرێ و بەشێکی هێندی کە بەفەرمی سەربەخۆ بێ لە قازانجی نەتەوەکەدا دەبێ، ئەگەر ئەوە لەبەر چاو بگرین چەند پێویستە ئاژانسێکی دەنگوباسی بەهێز و دەوڵەمەند لە ڕووی ئابوورییەوە هەبێ، چونکە ئەم جۆرە ئاژانسە دەتوانێ بەدەنگی داوای هەمیشە لە زیادبوونی ڕۆژنامە و خوێنەرانی هەموو چینەکانی کۆمەڵگەیەکی گەشەکردووەوە بێ". نامیلکەکەی IFWJ بابەتێکی ک ڕاگاڤانی دووبارە بڵاو کردەوە، پێشتر لە ناشناڵ هیراڵد بڵاو کرابووەوە، کە تیایدا گوتوویەتی دامەزراندنی UNI " نە بۆ کێبەرکێ بوو و نە لەبەرئەوەش بوو کە PTI دەستی دابووە تەمبەڵی. بگرە تەنیا هەوڵێک بوو بۆ ڕێگرتن لەوەی حکوومەت و پەرلەمان پێشنیازەکەی لیژنەی ڕۆژنامەوانی بەسەر PTIدا جێبەجێ بکەن و ئاژانسێکی تریان لە گیرفاندا هەبێ بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی

مەترسیی مانگرتنی کارمەندەکان". لێژنەی ڕۆژنامەوانی (١٩٥٤) پێشنیازی کردبوو بەڕێوەبەرایەتیی PTI بگوێزێتەوە بۆ کۆمپانیایەکی هاوبەشی گشتی کە بەیاسایەکی پەرلەمان دامەزرێ. لەگەڵ بەسەرچوونی کاتدا، لێژنەی ڕۆژنامەوانی لە ١٩٥٤دا ڕای گەیاند کە واپشکی سەرمایەی PTI خەریکە تەواو دەبێ و هۆی سەرەکیی ئەمەش ئەوە بوو ڕۆژنامە بەشدارەکان، کە زۆربەیان خاوەنی پشک بوون ئەوەندە ئابوونەی بەشدارییان نەدەدا بەشی خەرجیی خزمەتگوزارییەکانی هەواڵ بکا.

لە لۆک سابهادا گفتوگۆ لەسەر بابەتەکە کرا، ک م ستیفن و ڤایالار ڕاڤی و سوگاتا ڕۆی (هەموویان سەر بەحیزبی کۆنگرسن) لەگەڵ پ گ ماڤالانکار (سەربەخۆ) و پارڤاتی کریشنان (CPI) سەرنجی حکوومەت بەلای ئەو ڕاستییەدا بەکێش کرد کە ئەو چوار ئاژانسە پێش تێکەڵکردنیان زۆر لاواز بوون. لە کاتێکدا ستیفن پێشنیازی باجێکی کرد لەسەر بڵاوکردنەوە، ماڤالانکەر ئەوەی گوت هەندێ ڕۆژنامە کە لەو ٣٥ پەیزەی نرخی هەر دانەیەک لە ڕۆژنامەکانیان دەورووبەری دە پەیزەیان بەفرۆشیار دەدا و کەمتر لە یەک پەیزە بەئاژانسی دەنگوباس، بۆیە پێشنیازی کرد نرخی ڕۆژنامەکان پەیزەیەک یان دووان زیاد بکرێ و خوێنەران ئاگەدار بکەنەوە ئەم زیادکردنە بەشێکە لە "هەڵمەتی پشتگریی ئازادیی ڕۆژنامەوانی". ماڤالانکەر دڵنیا بوو کە دەبێ ڕۆژنامەوانی نرخی ئازادیی خۆی بدا و پەسنی سیاسەتی ئەسۆشیێتد پریسی کرد، ئەو ئاژانسەی ڕۆژنامەکانی ئەمەریکا بەهاوپشکی خاوەنین و بەڕێوەی دەبەن و "تا ئەمڕۆش خزمەتگوزارییەکانی خۆی نافرۆشێ".

ڕاپۆرتەکە لە لایەن کۆمیتەیەکی لاوەکیی حکوومەتەوە تاوتوێ کرا و ئەم کۆمیتەیە وای بەباش زانی دۆخەکە وەک پێش دروستکردنی ساماچاری لێ بکرێتەوە. لە ١٤ی تشرینی دووەمی ١٩٧٧، ل ک ئادڤانی، وەزیری ڕاگەیاندن و وەشان لە وتارێک لەبەردەم هەردوو ئەنجوومەنی پەرلەماندا ئەم بڕیارەی حکوومەتی ڕاگەیاند: "حکوومەتی پێشوو نەک تەنیا هاوکار بوو لە دروستکردنی ساماچار، بگرە ڕێشاندەری کۆمیتەی بەڕێوەبەری ساماچاریش بوو لە بڕیارە سیاسییەکانیدا. بەمەش ساماچار بەرهەم و هێمایەکی باری نائاسایی بوو و بێگومان

دەرهاوێشتەیەکی خراپی باری نائاسایی بوو. بۆیە حکوومەت گەیشتە ئەم بڕیارە، لەگەڵ ئەوەی کە پێویستە ڕۆڵی حکوومەت لەم پرسەدا تەواو سنووردار بێ بەڕاستکردنەوەی ئەم دەرهاوێشتە چەوتە. ئەو ئاژانسانەی دەنگوباس کە لە ژێر باری نائاساییدا دژ بەویست خۆیان ناچار کران تێکەڵ بەیەک بن، پێویستە ڕێیان پێ بدرێ بەسەربەخۆیی وەک جاری جارانیان کار بکەنەوە. بۆیە دەرگە بەڕوویاندا والایە ئەگەر بیانەوێ بەهاوبەشی کار بکەن یان بەیەکەوە بن بۆ مسۆگەرکردنی توانای زیاتر بۆ ئەوەی وەک چاوەڕوان دەکرێ ڕۆڵی کاریگەرتر ببینن لە بواری ڕۆژنامەوانیدا. حکوومەتیش پێی وایە دوای ئەوەی کەشێکی ئازادی هێنایە کایەوە، پێویستە خۆی لە گۆڕەپانەکە دەرچێ و ئەرکی پێشخستن و فرەوانکردنی ئاژانسەکانی دەنگوباس بۆ ڕۆژنامەوانی و ئاژانسەکان خۆیان بەجێ بهێڵێ". ت ر ڕاماسوامی سەرۆکی IFWJ گوتی حکوومەت بەم بڕیارەی نەک تەنیا بۆچوونی زۆرینەی کارمەندانی ئاژانسەکانی دەنگوباسی پشتگوێ خست، بگرە هی پسپۆڕانی بەتواناشی بەهەند وەرنەگرت. "بەناوی کێبەرکێوە شتی دووبارە دروست دەکرێن وەک ئەوانەی جاران هەبوون و بەمەش ئەو داهاتە کەمەی هەیە بەبا دەدرێ. سەبارەت داپۆشینی هەواڵی دەرەوەش گێڕانەوەی هەمان دۆخی جاران ئەوەندەی تر هیندستان ناچار دەکا پشت بەئاژانسەکانی نێودەوڵەتی ببەستێ".

دۆخی جاران گەڕایەوە و لە ١٤ی نیسانی ١٩٧٨ەوە چوار ئاژانس کەوتنە کار و چالاکی وەک سەردەمی پێش ساماچار. لە کاتی لەتبوونی ساماچاردا حکوومەت هاوکاریی داراییی پێشکێش کردن و ئەو هاوکارییە لە کەمبوونەوەی بەردەوام بوو بۆ ماوەی شەش ساڵ، جگە لەمەش بەخشینی پارە بۆ زیندووکردنەوەی ئاژانسەکان و قەرزی پێشخستنیشیان پێ درا بۆ ئەوەی جارێکی تر دەست بەچالاکیی خۆیان بکەنەوە. بەشی هیندستان لە کۆمەڵەی ئاژانسەکانی دەنگوباسی وڵاتانی بێلایەن لە لایەن PTIەوە هەڵدەسووڕا. لە ماوەی دە ساڵدا هیندستان ساماچار و ساماچار بهارتی دووبارە دووچاری گرفتی دارایی هاتنەوە.

## کۆمیتەی گۆونکا

لە ٢٥ و ٢٦ی حـــوزەیرانـی ١٩٨٥دا وەزیری دەوڵەت بۆ ڕاگــەیاندن و وەشـــان کۆبوونەوەیەکی ساز کرد بۆ گەورە نووسیار و خاوەنەکانی ڕۆژنامەکانی زمانەکان، مەبەستی کـۆبوونەوەکـە گـەیشتن بوو بەیەکـدەنگیـیـەک سـەبارەت دامــەزراندنی ئاژانسـێکی دەنگوباسی زمـانگەلی هیندسـتـان هـەواڵەکـانی خـۆی بەزمـانەکـانی هیندسـتان بڵاو بکاتەوە. لە سـەرەتای کۆبوونەوەکەدا، وەزیر ئەوەی ڕوون کـردەوە کە حکوومـەت هـیچ پێـشنیـازێکی وای نیـیـە بۆ دامـەزراندنی ئاژانسـێک و حکوومـەت ئارەزووی ئەوەش ناکات لە بەڕێوەبردن و بەکارخستنی هیچ ئاژانسێکدا بەشداریی هەبێ.

بۆچوونەکـان لە کـۆبوونەوەکـەدا کـۆک بوون لەســەر پێـویسـتـیی دامـەزرانـدنی ئاژانسێکی دەنگوباس بەزمانـەکانی هـیندسـتان بۆ بەدەنگەوەهاتنی پێویسـتیی ئەو ڕۆژنامانەی بەهیندی و زمـانەکانی تری هیندسـتـان دەردەچن. هـەروەها بەشداربووان ئەوەشیان ئاشکرا کـرد کە ناکرێ هیندسـتان سـاماچار و سـاماچار بهارتی زیندوو بکرێنەوە.

کـۆبوونەوەکە یەکـدەنگیـیـەکی بەخـۆوە بینـی لەوەی کـە خـاوەن و نووسـیـارانی ڕۆژنامەکان خۆیان دەبێ ئەو جـۆرە ئاژانسـی دەنگوباسـە بەڕێوە ببـەن. بۆیە خاوەن و نووسـیـاران ڕێک کـەوتن لەسـەر هـەوڵدان بۆ زانینی ئەگـەرەکـانی داهێنانی سـەرچاوە بۆ دامـەزراندنی ئاژانسـێکی دەنگوباس بـەزمـانگـەلی هیندسـتـان بەڵام بەمـەرجـێک توانـای ژیان و بـەردەوامــیی هـەبێ. هـەروەهـا لە کـۆبوونـەوەکـەدا ڕێککـەوتن هـەبوو لەســەر ئەوەی ئەگـەر توانای ئـەوە نەبوو سـەرچاوەی پێـویست بۆ دروسـتکردنی ئەو ئاژانسە پەیدا بکرێ، جێگرەوەی ئەم بیرۆکەیە ئەوە بێ ئاژانسە ئینگلیزی زمانەکانی ئێستا خزمەتگوزاریی نوێ داهێنن بەزمانەکانی هیندستان.

بۆیە لـە ئاکـامـدا کـۆمـیـتـەیەک لە کـەسـایەتـیـیە دیارەکـانی بواری ڕۆژنامـەوانی، بەســەرۆکـایەتـیی ڕامــانـات گـۆونکا، دەســتـنیـشـــان کـرا بۆ کـۆڵینەوە لە لایەنە جـۆراوجـۆرەکـانی ئـەم بابەتە. ئەندامـانی کـۆمـیـتـەکە ئەمـانە بوون: ڕامـانات گۆونکا (کــۆکــەرەوە)، ک نـاریندرا، ڕامــیش چاندرا، نـاریندرا مــۆهان، پ مــۆهاپاترا،

سۆماسونداراام و س م ئاگاروال.

کۆمیتەکە بۆی دەرکەوت دامەزراندنی ئاژانسێکی تێروتەسەل بەتێکنۆلۆجیای تەواوەوە لایەنی کەم سێ ملیۆن ڕوپیی گەرەکە بۆ دامەزراندنی و بۆ ئەوەی بەردەوامیشی هەبێ سالانە پێویستی بەیەک ملیۆن ڕوپی دەبێ. ڕۆژنامەکانی هیندی زمان بەهیچ شێوەیەک لەو ئاستەدا نەبوون بتوانن نیوەی ئەو سەرمایەیە دابین بکەن. جگە لەمەش، ئەو یەک ملیۆن ڕوپییەی سالانە بۆ خەرجیی ئاژانسەکە پێویستە بەهیچ شێوەیەک ناتوانرێ لە ئابوونەدەرانی هیندستانی زمان کۆ بکرێتەوە.

لە لایەکی ترەوە، ئەگەر خزمەتگوزاری بەزمانەکانی هیندستان بخرێتە نێو پێکهاتەی بنەڕەتیی یەکێک لە ئاژانسەکانی دەنگوباس، ئەوە تێچووی سالانەی ئەم خزمەتگوزارییە تەنیا نیو ملیۆن ڕوپی دەبێ، ئەمەش تێچوویەکی زۆر کەمترە و ئەم تێچووە دەکرێ لە لایەن ڕۆژنامەکان و ئابوونەدەرانی تری وەک AIR و دووردارشانەوە پڕ بکرێتەوە. لەپاڵ ئەمەشدا ئەگەر هێشتاش بودجەکە کورتی هێنا ئەوە ئەوەندە کەم دەبێ کە ئاژانسەکە بتوانێ خۆی پڕی بکاتەوە.

پێشنیازەکانی کۆمیتەی گۆونکا بوونە هۆی مرداربوونەوەی هەردوو ئاژانسە هیندی زمانەکان، هیندوستان ساماچار و ساماچار بهارتی. گۆونکا ئەو کاتە سەرۆکی PTI بوو. UNIیش خزمەتگوزارییەکی بەزمانی هیندی هەبوو لە ئایاری ١٩٨٢وەوە و ناوی UNI ڤارتا بوو. PTIش خزمەتگوزاریی خۆی بەزمانی هیندی لە نیسانی ١٩٨٦ دەست پێ کرد بەناوی باشا.

## PTI 2005

لە سەرەتای ٢٠٠٥دا ئابوونەدەرانی PTI لەناو هیندستاندا ٤٥٠ ڕۆژنامە بوو و ژمارەیەکی بەرچاویش لە دەرەوە هەبوون، سەرباری ئەمەش هەموو رادیۆ و تەلەفزیۆنە سەرەکییەکانی ناو هیندستان و ژمارەیەک لەوانەی دەرەوەش، کە BBC لەندەن یەکێکیانە، بەشداری خزمەتگوزارییەکانی PTIن.

ژمارەی کارمەندانیان ١٣٠٠ کارمەندە، ٤٠٠یان ڕۆژنامەوانن، PTI هەشتا نووسینگەی لە سەرتاسەری هیندستاندا هەیە جگە لە هەواڵنێر لە گشت شارە

گەورەکانی جیهان، وەک بانکۆک، بەکین، داکا، جیرۆزالم، جۆهانسبۆرگ، ئیسلاماباد، کاتماندو، کوالا لامپور، لەندەن، مۆسکۆ، نیویۆرک، واشنتۆنی پایتەخت و سیدنی. ئەمە سەرباری نزیکەی ٤٠٠ هاوکار کە بەشداری لە دروستکردنی فایلی هەواڵەکاندا دەکەن.

ڕێککەوتنی لەگەڵ ئەسۆشیێتد پرێس و ئاژانسی فرانس پرێسیشدا هەیە بۆ بڵاوکردنەوەی هەواڵەکانیان لە ناو هیندستاندا، هەروەها ڕێککەوتنی لەگەڵ ئەسۆشیێتد پرێسدا هەیە بۆ سوود وەرگرتن لە خزمەتگوزاریی فۆتۆگراف و زانیاریی نێودەوڵەتیی بازرگانی. لە ڕێی چەند ڕێککەوتنێکی دوولایەن و فرەلایەنەوە، PTI هەواڵ لەگەڵ چەندین ئاژانسی جیهاندا ئاڵوگۆڕ دەکا، لەوانە کۆمەڵەی ئاژانسەکانی دەنگوباسی وڵاتانی بێلایەن و ڕێکخراوی ئاژانسەکانی دەنگوباسی ئاسیا-پاسیفیک. خزمەتگوزارییەکانی PTI ئەمانەن:

## خزمەتگوزاریی دەنگوباسی ئینگلیزی

بەدوو جۆر ئەم خزمەتگوزارییە دەست دەکەوێ، خزمەتگوزاریی "ناوک" پێشهاتە سەرەکییەکان لە بوارە جیاجیاکاندا بەشێوەیەکی کورتکراوە دادەپۆشێ. خزمەتگوزارییەکەی تریش گشتگرترە و ڕێ بۆ ڕۆژنامەکان خۆش دەکا ئەوەی مەبەستیانە هەڵی بژێرن لەو بوارەی کە خۆیان دەیانەوێ وەک بوارەکانی: نیشتمانی، ناوچەیی، ئابووری، بازرگانی، نێودەوڵەتی و وەرزش. خزمەتگوزاریی ناوک ڕۆژانە ٤٠ هەزار وشە بەرهەم دێنێ و خزمەتگوزاریی گشتگریش سەد هەزار وشە.

## باشا

باشا خزمەتگوزاریی هیندی زمانی دەنگوباسی PTIە. بەو تۆڕە تایبەتەی خۆی لە هەرێمە هیندی زمانەکان و ئەوەی لە فایلەکانی PTIەوە وەری دەگرێ، باشا ڕۆژانە نزیکەی چل هەزار وشە بەرهەم دێنێ.

## شاشەی پشکەکان

ئەم خزمەتگوزارییە لە ڕێی شاشەوە پێشکێش دەکرێ و زانیارییەکانی بازاڕەکانی کڕین و فرۆشتنی پشک لە بازاڕە سەرەکییەکانی وڵاتەوە دەگوێزێتەوە.

### شاشەی هەواڵەکان

هەواڵەکان بەکورتی لەسەر شاشەدا پێشان دەدا. ئەم خزمەتگوزارییە ڕووداوە سەرەکییەکانی نیشتمان و جیهان دادەپۆشێ.

### زانیاریی هیندستان

پێڕستێکی هەفتانەیە، کورتەیەک لەوەی لە هیندستاندا ڕوو دەدەن پێشکێش دەکا. لە لیستێکی ئەلفابێتیدا کە بەکارهێنانی لە لایەن وەرگرەوە زۆر ئاسانە.

### خزمەتگوزاریی ئابووری

کۆوارێکی نیومانگییە، ڕاپۆرتی شیکاری لەبارەی دۆخی ئابووریی هیندستان و بۆچوونەکان لە جیهانی کۆمپانیاکاندا پێشکێش دەکا.

### کۆواری PTI

بەڵاڤۆکێکی هەفتانەیە، ١١ بابەتی تایبەت لەخۆ دەگرێ لەمەڕ بابەتگەلی گرینگی بوارەکانی جیاجیا هەر لە هونەر و بازرگانییەوە بگرە تا دەکاتە زانست. ئەم هەفتانەیە لە ڕێی خزمەتگوزاریی تێل و پۆستەش دەست دەکەوێ.

### خزمەتگوزاریی زانستی

کۆوارێکی نیومانگییە، تایبەتە بەراپۆرت لەسەر پێشهاتەکانی بوارگەلی زانست و تێکنۆلۆجیا، تایبەتمەندییەکیش بەهیندستان دەدا.

### گرافیکی PTI

بەڵاڤۆکێکی هەفتانەیە لە ڕێی پۆستەوە دابەش دەکرێ، ١٤ گرافیک لەخۆ دەگرێ. ئەم گرافیکانە پێشهاتە مەزنەکان دادەپۆشن. بەتایبەتی پێشهاتگەلی وەک بودجە. گرافیکەکان لە ڕێی سەتەلایتیشەوە بڵاو دەکرێنەوە.

### شێوازی PTI

بەڵاڤۆکێکە چوار هەفتە جارێکە لەسەر ڕووداوگەلی دیاری نیشتمانی و نێودەوڵەتی و گشتی.

### تەلەفزیۆنی PTI

داپۆشین لە شوێنی ڕووداوەوە پێشکێش دەکا و دۆکیۆمێنتاری هاوبەش لەسەر بنەماگەلی دیاریکراو بەرهەم دێنێ.

### فۆتۆگراف

بەدوو جۆر لەبەردەستدایە بۆ ئەوەی لەگەڵ پێداویستیی ڕۆژنامە بچووک و گەورەکاندا بگونجێ. PTI فۆتۆ وێنەی نیشتمانی و بیانی و وەرزش پێشکێش دەکا لە ڕێی سەتەلایت و بەدەستیش دەیگەیەنێ. هەروەها خزمەتگوزاریی پڕ ڕەنگی ئەسۆشیێتد پریسی ئەمەریکا لە ڕێی PTIەوە دەست دەکەوێ.

### ئاسیا پەڵس

بانکێکی زانیاریی ئینتەرنێتە پێوەستە بەپێشهاتەکانی ئابووری و هەلی کار لە وڵاتانی ئاسیا. ئاسیا پەڵس ئینتەرنەیشنال کە لە لایەن PTI و چوار دەزگای میدیا ئاسیاییی ترەوە دامەزراوە وەک کۆمپانیایەک لە سینگاپۆر تۆمار کراوە.

## UNI 2005

لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٥دا، UNI ڕای گەیاند کە خزمەتی زیاتر لە هەزار ئابوونەدەر لە زیاتر لە سەد شوێنی جیاجیای هیندستان و جیهان دەکات. لە نێویاندا ڕۆژنامە و تۆڕی رادیۆ و تەلەفزیۆن و وێبسایت و نووسینگەی حکوومەت و هی کەرتی تایبەت و کۆمپانیاکانی کەرتی گشتی هەیە. درێژیی تۆڕی گەیاندنەکەی دەگاتە ٩٠ هەزار کیلۆمەتر لە هیندستان و وڵاتانی کەنداودا. زیاتر لە ٣٢٥ کارمەندی ڕۆژنامەوانی لە سەرتاسەری وڵاتدا هەیە، لەگەڵ زیاتر لە ٢٥٠ هاوکار، ڕووداوەکانی هەواڵ لە دوورترین کونجەکانی وڵات دادەپۆشن. UNI دەڵێ هەواڵنێری لە شارە گەورەکانی جیهاندا هەیە وەک واشنتۆنی پایەتەخت و لەندەن و دوبەی و کۆلۆمبۆ و کاتماندو و ئیسلاماباد و داکا و سینگاپۆر و سیدنی و ڤانکۆڤەر کە هەموو ئەو هەواڵانەی جێی بایەخی خوێنەری هیندین دەگەیەننە ئابوونەدەرەکانیان.

هەروەها UNI ڕێککەوتنی هاوکاریی لەگەڵ ژمارەیەک ئاژانسی بیانیی

دەنگوباسدا هەیە، لەوانە رۆیتەرز و DPA کە ئەم هەواڵەکانیان بەنێو دامەزراوە میدیاییەکانی هیندستاندا بڵاو دەکاتەوە. ڕێککەوتنی گۆڕینەوەی هەواڵیشی لەگەڵ چینهوای چین و UNBی بەنگلادیش و گۆڵف نیوسی بەحرەین و WAMی ئیمارات و KUNAی کوێت و ONAی عومان و QNAی قەتەردا هەیە. جگە لەمەش UNI لە ساڵی ۱۹۸۰وە ئۆپەراسیۆنەکانی خۆی لە کەنداودا دەست پێ کردووە.

UNI خزمەتگوزارییەکانی خۆی فرە جۆر کردووە بۆ ئەوەی بتوانێ بەدەنگی ویستی جۆراوجۆری کڕیارەکانیەوە بێ. وەک پێشتر باسمان کرد خزمەتگوزارییەکی تێروتەسەلی بەزمانی هیندی هەیە بەناوی UNI ڤارتا کە بەزمانی هیندییە و لە ئایاری ۱۹۸۲وەوە دەستی پێ کردووە. ئەم خزمەتگوزارییە ئێستا نزیکەی ۳۰۰ ئابوونەدەری هەیە لە ڕۆژنامە و ناڕۆژنامە لە چەندین هەرێمی هیندستاندا. جگە لە هەواڵ و ڕووداو UNI ڤارتا بابەتی لە بوارە جیاجیاکانی هونەر و کولتوور و زانست و کشتوکاڵ و ئابووری و بۆماوە و دراوسێکانی هیندستانیش هەیە.

دوای دە ساڵ لەم خزمەتگوزارییە، لە ۱۹۹۲دا و بۆ یەکەمین جار لە هەموو جیهاندا خزمەگوزارییەکی تێلیپرینتەر بەزمانی ئوردو دەستی پێ کرد. سەرەتا تەنیا شەش ئابوونەدەری هەبوو و ئێستا ژمارەی ئابوونەدەران گەیشتووەتە ٥٠ لە شوێنە جیاجیاکانی هیندستانەوە. ئەم خزمەتگوزارییە هەموو پێشهاتە گرینگەکانی هەواڵ دەگوێزێتەوە و بایەخێکی تایبەتیش بەهەواڵەکانی جیهانی موسڵمان، بەتایبەتی وڵاتانی ڕۆژئاوای ئاسیا، دەدا. هەواڵی لە بارەی هەموو ڕووداوگەلی گەورەی کولتوور و ئەدەبی ئوردووەوە هەیە.

خزمەتگوزاریی دارایی UNIFIN لە کانوونی دووەمی ۱۹۷۹وە دەستی پێ کرد، کە خزمەتگوزارییەکی گشتگرە، داپۆشینی جیهانیی بازاڕەکانی دراو و کاڵا پێشکێش دەکا هەر لە وۆڵ ستریت و ناسداکەوە تا دەگاتە بازاڕەکانی ئەوروپا و ئاسیا. ڕاپۆرتی لە کاتی خۆی لەسەر بازرگانی لە بازاڕی ئاڵوگۆڕی بۆمبەی و بازاڕەکانی تری هاوشێوە لە هەموو وڵاتدا هەیە. سەبارەت بازاڕەکانی جیهانیش پشت بەو ڕێککەوتنانە دەبەستێ کە لەگەڵ رۆیتەرز و بریدج نیوس هەیەتی. هەروەها UNIFIN ڕاپۆرت بەرهەم دێنێ لەبارەی ئابووریی هیندستان و زۆر بڕگە و جومگەی

پیشەسازی و دارایی وەک بانکەکان و دڵنیایی و نەوت و گاز و وزە و ئۆتۆمۆبیل و گەیاندن و تێکنۆلۆجیای زانیاری و کاڵای تر. ئەمە و داپۆشینی دیاریکراوی هەیە بۆ هەموو ڕێکخراوە پیشەسازی و بازرگانییە سەرەکییەکان. بەڵافۆکەکەی UNIFIN بابەتی سیاسیی گرینگی تێدایە کە کاریگەرییان لەسەر جیهانی داراییدا هەیە، لە پاڵ داپۆشینی بازاڕەکانی دانەوێڵە و شەکر و ڕۆن و بازاڕەکانی تری هیندستان.

لە ساڵی ۱۹۸۷ خزمەتگوزاریی فۆتۆی نیشتمانی لە لایەن UNIەوە دەستی پێ کرا و پلانی ئەوە دارێژراوە ئەم خزمەتگوزارییە بگوێزرێتەوە سەردەمی دیجیتاڵ و داپۆشینەکە فرەوان بکرێ تا شوێن و بوارگەلی تریش بگرێتەوە. بەهۆی ڕێکەوتنی هاوکاری لەگەڵ فرانس پرێسیشدا وێنەی هەواڵەکانی جیهان دەگەیەنێتە ئابوونەدەرەکانی خۆی.

خزمەتگوزاریی UNI دایرێکت ئەو خزمەتگوزارییەیە نوێترین چیرۆکی هەواڵەکانی هیندستان و هەموو جیهان ڕاستەوخۆ دەگەیەنێتە سەر شاشەی کۆمپیوتەری ئابوونەدەرەوە. ئابوونەدەر لە چەند شارێکی دیاریکراوی هیندستاندا ئیتر پێویستی بەوە نییە پشت بەتێلیپرینتەر ببەستێ و لە هەڵگرتنی کۆمەڵێ لوولەی کاغەز و شریت ڕزگاری دەبێ. ئابوونەدەر دەتوانێ دوایین هەواڵ بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەسەر شاشەی کۆمپیوتەرەکەی ببینێ، ئەم خزمەتگوزارییە لە هەر ڕۆژێکدا ۲٤ سات هەیە و لە هەر هەفتەیەکدا هەفت ڕۆژ هەیە. جگە لەمەش ئابوونەدەر دەتوانێ هەموو فایلەکانی ئەو ڕۆژە ببینێ چونکە هەموویان لە فایلی هاتوودا هەڵدەگیرێن و بەپێی کاتی گەیشتنیان ڕیزبەند کراون. هەروەها دەتوانن بچنە چەندین سەبەتەی جۆراوجۆر وەک بیانی و سیاسی و پشکەکان و پەرلەمان و هەرێمی و وەرزش و هەڵبژاردنەکان و هی تر. بەمەش دەتوانن جەخت بکەنە سەر ئەو بابەتانەی جێی بایەخیانە. لە ڕێی UNI دایرێکتەوە ئابوونەدەران دەتوانن بابەتەکانی ۳۰ ڕۆژی پێشتر ببینن. بۆ گەڕان بەدوای بابەتەکانیشدا دەکرێ لە ڕێی ناونیشانی بابەتەکە یان ڕۆژەکەی بدۆزرێتەوە.

UNI گرافیک لە ئاداری ۱۹۹۱دا کەوتە کار و ئێستا بەشێکی چەسپاوە لە ڕۆژنامەکانی هیندستاندا. گرافیکەکان بەهەردوو زمانی ئینگلیزی و هیندی

دەنێررێن. بۆ ئەوەی ئەو ڕۆژنامانەشی بەزمانگەلی تر دەردەچن سوودیان لێ وەرگرن هەندێ کۆپیی گرافیکەکان بەبێ نووسین دەنێررێن و نووسینەکەی بەجودا لەگەڵدا دەبێ و بەزمانی ئینگلیزییە و ڕۆژنامەکە دەتوانێ بەزمانەکەی خۆی بیاننووسێتەوە و بڵاوی بکاتەوە. خزمەتگوزاریی گرافیکی UNI لە هەڵبژاردنەکانی خانەی گەل لە ساڵی ۱۹۹۱ جێی خۆی کردەوە، کاتێ ڕۆژنامەکان نزیکەی ٤٠٠ گرافیکیان لە ماوەی ٤٥ ڕۆژدا پێ گەیشت. هەروەها چاکسازییە ئابوورییەکانیش برەویان بەم خزمەتگوزارییە دا. وەرزش و ڕووداوەکان و ژمارەیەکی بەردەوام لە زیادبوونی بابەت جێی خۆیان لە گرافیکدا کردووەتەوە لە پاڵ بانکێکی زانیاریی بەردەوام لە زیادبووندا.

لە تەممووزی ۱۹۸٦دا UNI دەستی بەخزمەتگوزاریی تەلەفزیۆنی خۆی کرد بەناوی UNI دارشان کە بابەتی هەواڵ و بەلاڤۆکی دەنگوباس و دۆکیۆمێنتاری پێشکێشی دووردارشان و دامەزراوەی تر دەکرد.

خزمەتگوزارییەکی تری تایبەتیی ئەم ئاژانسە بریتی بوو لە UNISCAN کە خزمەتگوزارییەکی هەواڵ بوو دەدرا بەئوتێلەکان و گەورە بەرپرسانی حکوومەت و کڕیاری هاوپشک.

یونایتد نیوسی هیندستان ژمارەیەک خزمەتگوزاریی لە ڕێی پۆستەوە هەیە، کۆنترینیان ئەو باکگراوندانەیە لە ۱۹٦۸ەوە بەئینگلیزی دەستیان پێ کرد و لە ۱۹۸۲وەوە بەهیندی هەیە و هەفتەی جارێک دەردەچێ. یەکێکی تر لە خزمەتگوزارییە پۆستەییەکان بەلاڤۆکی کشتوکاڵییە بەزمانی ئینگلیزی و لە تەمووزی ۱۹۷۰ دەستی پێ کردووە، بەلاڤۆکی ئابووریش لە ۱۹۷۹وە دەستی پێ کردووە و هی وزەش لە ئەیلوولی ۱۹۸۰وە.

## ئاسیان نیوس ئینتەرناشناڵ ANI

سەرۆکی نووسینگەی ڤیسنیوس لە هیندستان، ئاسیان نیوس ئینتەرناشناڵ ANIی وەک بازرگانییەکی سەربەخۆ دامەزراند لەو کاتەدا کە رۆیتەرز دەستی بەسەر ڤیسنیوسدا گرت. لەو کاتەدا ئەو بووە بەڕێوەبەری تەلەفزیۆنی رۆیتەرز لە هیندستاندا، سانجیف پراکاشی کوڕی بەرپرسیی ANIی گرتە ئەستۆ، ئەم ئاژانسەش هەواڵەکانی باشووری ئاسیای بەرۆیتەرز دەدا.

ئێستا ANI بووەتە یەکێ لە گەورە ئاژانسەکانی دەنگوباسی باشووری ئاسیا لە بوارە جیاجیاکانی مەڵتیمیدیادا و زیاتر لە ٥٠ نووسینگەی لە هیندستان و سەرانسەری جیهاندا هەیە. بەرهەمەکانی بریتین لە کۆمەڵە هەواڵی سادە دارێژراو و بەرنامەی تایبەت بۆ کەناڵەکانی تەلەفزیۆن و بەرنامەی دەنگی بۆ ئێزگەکانی رادیۆ، هەروەها بابەت و هەواڵی زیندوو بۆ تۆڕی ئینتەرنێت و هەواڵ بۆ تۆڕەکانی مۆبایل و خزمەتگوزاری لە ڕێی تەلەوە بۆ بەشی چاپ. ANI کۆمەڵێ ئاسانکاری پێشکێش بەکەناڵەکانی بێگانە و خۆماڵی دەکات بۆ گەیاندنی راپۆرتەکانیان بەجێی مەبەست، ئەو ئاسانکارییانە بریتین لە دابینکردنی کارمەندی شارەزا و نووسینەوەی بابەت و کاری پاش بەرهەمهێنان و خستنە بەردەستی ئەرشیفەکانی خۆی کە گشتگرترین کۆمەڵە هەواڵی ڤیدیۆیی باشووری ئاسیا لەخۆ دەگرێ و ئاسانکاریی ناردنی بەرهەمەکان بەلینک و پێشکێشکردنی جێگیرکەر و ڕێکخەر و بەرهەمهێن و هەواڵنێر ئەگەر پێویست بن.

ANIلە ڕێی رۆیتەرزەوە سێ هەواڵنامە لەسەر نیوچەپارزەوین (قارة)ی هیندی پێشکێش بەجیهان دەکا. نزیکەی ١٨ هەواڵی سەرەکیی ڕۆژی نیوچە پارزەوینەکە کورت دەکرێنەوە بۆ ئەوەی تەنیا سێ خولەک بخایەنن بەدەنگی سروشتیشەوە بۆ هەر تراکێک. دەقەکان و وەرگێڕانەکانیان بەیەکەوە پێشکێش دەکرێن.

خزمەتگوزارییەکی تەواوی تەلەفزیۆنی ANI لە نێو دێلهی دەخرێتە سەری و ئەمەش نزیکەی ٢٥ هەواڵی تر لەخۆ دەگرێ. هەموو ئەم بەرهەمەش بەکاسێن ڕۆژانە دوو یا سێ جار دەدرێتە کڕیار بەپێی ویستی خۆی.

هەواڵەکانی نیوچە پارزەوینی و تەلەفزیۆنی ANI لە لایەن زۆربەی زۆری وەشێنان

له ئاسیادا وەردەگیرێن لەوانەش BBCو CNN و NHK (تۆکیۆ) و CNA (سینگاپۆر) و، MBC (وەشاندنی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست) و دووردناشان و تەلەفزیۆنی پاکستان. کۆمەڵی بابەتی دیاریش بۆ بەرنامەکانی کۆتایی هەفتە هەڵدەگیرێن، ئەم خزمەتگوزارییەش لە لایەن چەندین کەناڵی تەلەفزیۆنیی ئیتنییەوە لە ئەمەریکا و بریتانیا دەکرێ. خزمەتگوزاریی دەنگوباسی مەڵتیمیدیایی بەرهەمی سازدراویان هەیە بۆ بڵاوکردنەوە لە تۆڕی ئینتەرنێت، بێگومان ئەم خزمەتگوزارییە هەموو بوارەکان دەگرێتەوە و لەگەڵ هەموو جۆرە ئارەزووەکانی کڕیاردا گونجاوە و بەزۆربەی سۆفتوێرەکان کار دەکا.

جگە لەمانەش ANI خزمەتگوزارییەکی SMS و MMSی داهێناوە و دەق و وێنەی بەجۆرێک بۆ ئامادە کردووە شیاوی بەکارهێنان بێ لە ئامێری مۆبایلدا، بەمەبەستی ئاگەداریی بەردەوامی بەکارهێنەرانی ئەم ئامێرە لە دەنگوباسەکان تەنانەت لەو کاتانەشدا کە بەڕێوەن.

ANI ژمارەیەک بەرنامەی حەفتانەی ئامادەی هەیە، لە بارەی چەندین بابەتی جۆراوجۆر بۆ ئەو وەرگرانەی گرینگی بەڕووداو و شتی تایبەت بەباشووری ئاسیا دەدەن. هەندێ لەو بەرنامانە تایبەتن بەبابەتی وەک بازرگانی و پیشەسازییەوە، هەندێکی تریان دیمانەن لەگەڵ شاندەکانی میوان و هی تر هەیە بەرنامەی خۆشی ئامێزن و هونەرین. ئەم بەرنامانە بەهیندی یاخۆ بەپونجابی دەبن. ئەم جۆرە بەرنامانە زۆر کاریگەرن لەبەرئەوەی بەشێوەیەک ئامادە دەکرێن تەواو لەگەڵ ویستی کڕیاردا بگونجێ و ئەوەی دەیکرێ دەتوانێ بەبێ هیچ دەستکارییەک بیانوەشێنێ هەندێ لەو بەرنامانەی دەست دەکەون ئەمانەن: هەواڵنامەی باشووری ئاسیا _ هەفتەی پێنج ڕۆژ ئەم بەرنامەیە هەیە و هەر بەشێکی ١٥ خولەکە و لە ڕێی سەتەلایتەوە لە بریتانیا دەست دەکەوێ. بەرنامەی یو ئێس کۆریسپۆندنت نۆتبوک، ڕاپۆرتێکە ماوەکەی دە خولەکە، مانگی دوو جار هەیە و بەزمانی ئینگلیزییە. دەیتلاین پونجاب، هەفتانەیە و ماوەکەی نیو سات و بەئینگلیزی و پونجابییە. جیهانی هیندستان، نیو ساتە و بەئینگلیزییە و باس لە بابەتگەلی تایبەت بەهیندستان دەکا ... هتد.

## تێکستنیوسی ANI

ئەم هەواڵانە دەقی نووسراون و ئاراستەی ڕۆژنامە و وێبسایت و رادیۆکان دەکرێن کە کڕیاری بنەڕەتییانن. ئەم خزمەتگوزارییە بابەتگەلی جۆراوجۆر لە بوارەکانی سیاسەت و پرسە کۆمەڵایەتییەکان و زانست و تەندروستی و بازرگانی و خۆشی ئامێز لەخۆ دەگرن، لە پاڵ ئەمانەشدا بابەتی دەگمەنیش هەن لە بارەی ئەو شتە سەرسوڕهێن و دەوڵەمەندیی شاراوەی کولتووری هەمەڕەنگی باشووری ئاسیا. بۆ زیاتر دەوڵەمەندکردنی بابەتەکانی لە بارەی بازرگانییەوە نرخەکانی کاڵاکانیش بڵاو دەکاتەوە لەگەڵ شیکردنەوەی ڕووداوە ئابوورییە سەرەکییەکانی هیندستان و ئەوبەری دەریاکان. نیشانەی جیاکەرەوەی خزمەتگوزارییەکانی ANI نەرمییە. ئەم نەرمییە وای کردووە کڕیار هەر چییەکی بوێ دەستی بکەوێ و بتوانی بەڕادانی بدا. هەروەها بۆ ئەوەی جیهانی بێ، ANI هەواڵنێر و نوێنەری خۆی لە هەموو شوێنێکی گرینگی باشووری ئاسیا و ئەورووپا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەمەریکادا هەیە، لە پاڵ ئەمەشدا ئەو تۆڕە چڕەی لە نیشتماندا هەیەتی وای کردووە بابەتی دەگمەنی لە هەموو کونجێکی هیندستانەوە هەبێ.

خزمەتگوزارییەکانی ANI بەپێی خواست و ویستی ئابوونەدەرانەوە بەئیمێڵ یا بە FTP دەگاتە دەستیان.

## بەکرێدانی کارمەندان

تەلەفزیۆنی ANI ئەوەندە کارمەندی لە باشووری ئاسیادا هەیە کە هیچ ئاژانسێکی تری دەنگوباس یا کەناڵێکی تەلەفزیۆن نییەتی. زیاتر لە سەد تاقمی کامێرا بەکەرەستەی تەواوەوەی لە شوێنە ستراتیجەکانی باشووری ئاسیادا هەیە و دەتوانن زۆر بەخێرایی بگەنە شوێنی ڕووداوەکان و داپۆشینی پێویست ئەنجام بدەن. ئەو شوێنانە شوێنی زۆر سەخت و دووریشیان تێدایە کە گەیشتن پێی کارێکی سەختە و تێچووی زۆرە. بۆیە زۆر لە دەزگاکانی وەشاندنی بێگانە تاقمی ANI بۆ ئاسانکردنی داپۆشینەکانی خۆیان بەکار دێنن. ئەم خزمەتگوزارییە بۆ ئابوونەدەرانی ANI ، وەک BBC، NBC، ZEE TV، CNN، PBS (USA)، NHK، ZDF، زۆر هەرزان کراوە.

## خزمەتگوزاریی هەواڵی هیندۆئاسیایی IANS

خـزمـەتگوزاریی هەواڵی هـیندۆئاسـیـایی IANS کـە پێـشـتـر خـزمـەتگوزاریی هەواڵەکـانی دەرەوەی هـیندسـتـان بوو، بیـرۆکـەی گـۆپال ڕاجـوی دامـەزرێنەری هەفتەنامەی ئیندیا ئەبرۆد بوو، لە ساڵی ١٩٨٦دا، ئامانجەکەش هاندانی هاتوچۆی هەواڵ بوو لە نێوان هیندسـتـان و ئەمـەریکای باکـور. وەک خـزمـەتگوزارییـەکی فرەنیـشتـمـان و فرەزمـان لە بواری گـەیاندنی هەواڵەکـانی هیندسـتـان و باشـووری ئاسـیـا بەدەرەوە و گـواسـتنەوەی هەواڵەکـانی دەرەوە بۆ ئەم ناوچەیە جێی خـۆی کردەوە.

هـەمــوو گــرووپێکی ڕۆژنـامــەی دیار لە هـیـندســتــان ئابوونەدەری ئەم خزمـەتگوزارییـەیە. IANS ئابوونەدەری لە چەندین وڵاتیشدا هـەیە، لەوانە ئەمـەریکا، بریتانیا، ئوستـرالیا، باشـووری ئەفریقا، پاکستـان و وڵاتانی کەنداو وەک ئیمارات و عومان و قەتەر و بەحرەین و سعوودیە.

لەو چەند مـانگ و سـاڵەی داهاتوودا، تۆڕی IANS فرەوانتر دەبێ و وڵاتانی تریش دەتوانـن سـوود لە هـەواڵ و بـابەت و شـیـکردنەوەکـانـی هیندسـتـان و وڵاتانـی تری باشووری ئاسیا وەرگرن.

هەواڵنێـرانی IANS چەندین جـار چیـرۆکی زۆر گـرینگیـان بـەدەست هێناوە و چەندین دیمانەی ورووژێنەریان کردووە.

سـاڵی ١٩٩٥ ئـەم دەزگـایە خـزمـەتگوزارییـەکی هـیندیی کـردەوە، ئێـسـتـا ئابوونەدەرانی ئەم خزمەتگوزارییە هەموو ڕۆژنامە هیندی زمانە دیارەکانیان تێدایە. هەروەها IANS خزمەتگوزارییەکی بەزمـانی کـوجـاراتی هەیە و لە بەرنامـەیدا هەیە خزمەتگوزاریی بەزمانگەلی تریش هەبێ.

ئەمـە و IANS تاکە دەزگـای مـیدیایی باشـووری ئـاسـیـایە کە خزمـەتگوزارییـەکی بەزمـانی عارەبی هەبێ، بۆ ئەم مـەبەسـتـەش وێبسـایتی عارەبیی هەیە کە وەک پردێک بۆشـاییی زانیـاری لەگـەڵ ناوچەیەکدا پڕ دەکاتەوە کە خـەڵکێکی زۆری هیندسـتـان و باشووری ئاسیای تێدا نیشتەجێن.

دەزگای IANS خزمەتگوزارییەکی هەرزان پێشکێشی دەزگاکانی میدیا دەکا. هەواڵ و بابەت و راپۆرتەکانیشی زانیاریی باشن لە بارەی نیوچە پارزەوینەکەوە بۆ رێکخراوەکانی نامیدیایی و دەستە نێودەوڵەتییەکان و کۆمپانیا فرەنەتەوەکان و ئەو پلاندانەرانەی گرینگی بەم بەشەی جیهان دەدەن.

هەواڵەکانی IANS لە هەموو کونجێکی باشووری ئاسیا و ئەمەریکای باکور و ئەورووپا و ئوستراڵیا و هەموو ئەو ناوچانەی لە رابردوودا هەواڵی پێوەست بەهیندستانیان پێ گەیشتووە، بڵاو دەبنەوە.

## بەرهەمهێنانی رۆژنامە

دەزگای IANS خۆی خزاندە بوارێکی تری چالاکیی بازرگانییەوە، کە بێگومان پێوەندیی بەخزمەتگوزاریی هەواڵەوە هەیە، ئەو بوارەش بەرهەمهێنانی رۆژنامەیە. ئێستا IANS تەنیا لە هەوڵی ئەوەدا نییە ناوەرۆکی رۆژنامە بدا بەدەرەوەی هیندستان، بگرە لە توانایدا هەیە رۆژنامە بەتەواوی بەرهەم بهێنێ. لەگەڵ کۆتاییی ساڵی ٢٠٠٤، بەشی بەرهەمهێنانی رۆژنامە توانای هەبوو چوار رۆژنامە لە ئەمەریکا و دووان لە بریتانیا بەرهەم بهێنێ بەهەر سێ زمانی ئینگلیزی و کوجاراتی و پونجابی.

## بەشی تەلەفزیۆن

یەکێ لە بەرهەمە سروشتییەکانی گەشەکردنی دروستکردنی بەشێکی تایبەت بەدەنگ و رەنگ بوو: تەلەفزیۆنی IANS. ئەم تەلەفزیۆنە دۆکیوێنتاری جۆرایەتی بەرهەم دەهێنێ کە باس لە بابەتی نائاسایی و سەرنجراکیشی هیندستان و باشووری ئاسیا دەکەن و پێشکێشی وەرگرانی خۆی دەکا لە ناوەوە و لە دەرەوەی ناوچەکەدا.

## چارەسەرەکانی IANS

چارەسەرەکانی IANS یەکەیەکی تازەیە لەم دەزگایەدا و کارەکەی ئەوەیە چارەسەری پێویست پێشکێش بکا بەمەبەستی دارشتنی ستراتیجێکی گونجاوی

ئینتەرنێت. ئەم خزمەتگوزارییە بریتییە لە نەخشەسازی و تێکنۆلۆجیا و زانیاریی بەبازاڕیکردنی پێویست بۆ دامەزراندنی ماڵپەڕێک ئەو ئامانجانە بپێکێ کە مەبەستی تۆن. نەخشەسازەکان و گرووپی تێکنۆلۆجیا هاوکاریی کرپار دەکەن بۆ دانانی ماڵپەڕێک لە ڕووی گرافیک و کاریگەرییەوە پێشکەوتوو و کارا بێ.

# سێیەم

## بەهاكانی ئاژانسی دەنگوباس

بەیەكەم بوون شانازییەكی ڕۆژنامەوانییە. ئاژانسەكانی دەنگوباس بەردەوام لە كێبەركێ بوونە بۆ ئەوەی یەكەمین بن كە هەواڵەكانیان بگەنە سەر مێزی ئابوونەدەران. چارلس لویس هاچاس كە دامەزرێنی یەكەمین ئاژانسی دەنگوباسە، لەوە دەگەیشت كە خێرایی هۆكارێكی بنەڕەتییە لە گواستنەوەی هەواڵدا. لەبەر ئەمەش بوو ئاژانسەكەی خۆی لە شەقامی بەرامبەر فەرمانگەی پۆستەدا جێگیر كرد. لە ساڵی ١٨٣٢وەوە تەكنیك بەبێ وەستان لە پێشكەوتندایە. سوپاس بۆ پێشكەوتنەكانی تەكنیكی گەیاندن، ئاژانسەكان ئەمڕۆ باسی گواستنەوەی ڕووداوە گرینگەكان لە كاتی ڕوودانیاندا دەكەن. سەرەتا ماوەی نێوان ئاژانسەكان چەند ڕۆژێك دەبوو، دوایی بووە سات و دواتر خولەك، ئێستا ماوەی نێوانیان بەچركە دەژمێردرێ. لەم سەردەمەدا كە كەناڵەكانی هەواڵ و ئینتەرنێت ڕۆژانە ٢٤ سات كار دەكەن، هەموو كەناڵەكانی میدیا لە كێبەركێدان بۆ بەدەستهێنانی هەواڵ بەخێرایی، بەتایبەتیش كێبەركێكە لە نێوان ئاژانسەكانی دەنگوباسە لەبەرئەوەی ئەوان هەواڵ بەگشت جۆرەكانی میدیا دەدەن.

لە بەلاڤۆكی ئاژانسەكانی دەنگوباس: پێكهاتە و كاركردنیان (١٩٥٣) یونسكۆ دەڵێ: "لە ژێر سایەی سیستمی ئەو حكوومەتانەی ڕێز لە ئازادیی زانیاری دەگرن، ئامانجی ئاژانسەكان پابەندیان دەكا چاودێریی بابەتیبوونی توند و بێلایەنی بكەن،

کە بەبێ ئەمانە ئەو دەزگایانەی هەواڵیان لێ وەردەگرن ناتوانن پشت بەو مافە ببەستن کە بۆیان هەیە هەڵبژێرن کامیان لە سنووری ئازادیی دەربڕینە".

یەکەمین لیژنەی ڕۆژنامەوانیی هیندستان (١٩٥٢-١٩٥٤) ئەوەی دەرخست کە: "چالاکیی بنەڕەتیی هەر ئاژانسێکی دەنگوباس پێشکێشکردنی راپۆرتە هەواڵە لەسەر نوێترین ڕووداوەکان بەڕۆژنامەکان و ئەوانی تر کە ئابوونە بۆ بەدەستهێنانی خزمەتگوزارییەکانی دەدەن. وەک لەم ناساندنەش ئاشکرایە کاری ئاژانسی دەنگوباس تەنیا کۆکردنەوەی هەواڵە. بۆیە دەبێ بەتەواوی ڕاستگۆ بێ و هیچ بەرژەوەندییەکی لە هەواڵدا نەبێ جگە لە گواستنەوەی". لیژنەی ڕۆژنامەوانی جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە ئاژانسی دەنگوباس، وەک پرسی دادوەری، نابێ بەوەوە بوەستێ کە پابەندی ڕاستگۆییە بگرە پێویستە ئەو پابەندییەی ببینرێ. پێویستی بەبابەتیبوون لە کەسایەتیی ئاژانسی دەنگوباسەوە وەک دابینکەری هەواڵی تێروتەسەل و سەرەتاییش بۆ ژمارەیەکی جۆراوجۆری دەزگای بڵاوکردنەوەی هەواڵی خاوەن ڕەنگ و بۆچوونی جیاوازەوە سەر هەڵدەدا. تەنیا بەمەش دەتوانێ بەشدار بێ لە بڵاوکردنەوەی بۆچوونە جیاوازەکان و نیشاندانی ڕووە جیاجیاکانی ژیان. لیژنەی ڕۆژنامەوانیی هیندستان ئەوەشی ڕاگەیاند "نابێ ئاژانسی دەنگوباس هیچ جۆرە سیاسەتێکی خۆی هەبێ کە بەگشتی لە کارەکانیدا ڕەنگ بداتەوە".

## بەها ڕاگەیەنراوەکان

ئاژانسەکانی دەنگوباس خۆیان جەخت لەسەر کۆمەڵێ پرنسیپ و بەها دەکەن. ئەم پرنسیپ و بەهایانەش لە ماڵپەڕەکانیان و ئەو نووسینانەی خۆیانی پێ دەناسێنن بڵاو دەبنەوە. ئەمەش هەندێک لەو جۆرە ڕاگەیاندنانەیە لە لایەن ئاژانسگەلی جیاوازی دەنگوباسەوە:

### ڕۆیتەرز

ڕۆیتەرز لەم جۆرە وتارانەدا لە هەموو ئەوانی تر ڕەوانبێژترە و دەڵێ:

چالاکییەکانی ڕۆیتەرز لە بواری هەواڵدا لەسەر بنەمای پرنسیپەکانی دامەزراندنی کۆمپانیاکە بنیات نراون کە بەڵێن دەدەن ڕاستگۆیی و سەربەخۆیی و ئازادی لە

لایەنداری، بۆ رۆیتەرز پێویستە بەردەوام بەرز ڕاگیرێن.

رۆیتەرز پابەندە بەپاراستنی سەربەخۆیی و ڕاستگۆیی و بێلایەنیی خۆی لە کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی هەواڵ و زانیاریدا. بەپێی دەستووری کۆمپانیای رۆیتەرز فاوندەرز شێر پێویستە بەڕێوەبەرانی ئەم کۆمپانیایە بەگشتی پابەندی پرنسیپەکانی دامەزراندنی رۆیتەرز بن و بەپێی توانا لە هەوڵی مسۆگەرکردنی پابەندبوون بەو پرنسیپانە بن لە ڕێی ئەو دەسەڵاتەوە کە پێیان دراوە. دەستووری گرووپی رۆیتەرز PLC دەخوازێ بەڕێوەبەرانی رۆیتەرز لە کاتی ئەنجامدانی ئەرکەکانیاندا و لە پاڵ کارکردنیان وەک بەڕێوەبەر ڕێز لەو پرنسیپانە بگرن و کار بۆ پابەندبوون پێیانەوە بکەن.

پرنسیپەکانی دامەزراندنی رۆیتەرز ئەمانەن:

- نابێ رۆیتەرز لە هیچ کاتێکدا بکەوێتە ژێر دەستی بەرژەوەندیی کەسێک یان گرووپێک یان لایەنێکەوە.
- پێویستە بەردەوام ڕاستگۆیی و سەربەخۆیی و ڕزگاریی رۆیتەرز لە لایەنداری بپارێزرێن.
- پێویستە رۆیتەرز هەواڵی بێلایەن و باوەڕپێکراو بدا بەڕۆژنامەکان و ئاژانسەکانی دەنگوباس و وەشێنەران و هۆکارەکانی تری میدیا و بازرگانان و حکوومەتەکان و پەیمانگە و تاکەکان و هەموو ئەوانەی تر کە لەگەڵ رۆیتەرزدا گرێبەستیان هەیە.
- پێویستە رۆیتەرز بایەخی پێویست بەو هەموو بەرژەوەندییە بدا کە خزمەتیان دەکا شانبەشانی بەرژەوەندییەکانی میدیا.
- هەروەها پێویستە درێخی لە هەوڵدان نەکرێ بۆ فرەوانکردن و پێشخستن و گونجاندنی هەواڵ و خزمەتگوزاری وبەرهەمەکانی تری رۆیتەرز لە پێناو مانەوەی رۆیتەرز لەو پێگە پێشەنگەی لە بواری هەواڵی نێودەوڵەتی و بازرگانیی زانیاریدا هەیەتی.

## ئاژانسی فرانس پرێس AFP

فرانس پرێس نموونەی جۆرایەتیی سەروتار و بڕواپێکراوییە، ئەم ناوبانگە لە کاتی دامـــەرزاندنی ئاژانســـەکـــەوە لە ســـاڵی ١٨٣٥ بەدەست هاتووە، AFP بەتەواوی ســەربەخـۆیە و دوورده لە هەر دەســەڵاتێکی دەرەکیی سـیـاسی یان هاوپشکی یان ئایدیۆلۆجی یان ئاینی. ئەم ئاژانســە بابەتیـبوونی تەواو مـسـۆگـەر دەکـا و توانای پێشکێشکردنی بەرهەمی تایبەت یان بەکردن دراوی هەیە.

## ئەسۆشییێتد پرێس AP

ئەسۆشییێتد پرێس وتاری خۆناساندنی هەیە:

ئەسـۆشـیـێـتـد پرێس لە ناو بازرگـانیی زانیـاریدایە. ئەرکی بنەڕەتیی برێتـییـە لە پێشکێشکردنی هەواڵ و فۆتۆگراف و گرافیک و وەشان و خزمەتگوزاریی ئینتەرنێت لەبارەی دەوڵەت و نـەتەوە و نێودەوڵەتیـیەوە بەباشـترین جـۆر و بـەشـێـوەیەکـی جێی باوەڕ و بـابەتیـیـانە، بەخـــاوەنەکـــانی نـێـوخـــۆیی و بـەئابووریـتـرین شـێـوە. AP کۆمپانیایەکە لە لایەن ئەندامانیەوە بەڕێوە دەبرێ.

هەمـوو ئەو هەوالانەی لۆگـۆی APیان لەسـەرە چاوەڕوان دەکرێ ورد و هاوسـەنگ و پڕ زانیـاری بن. ئەسۆشـیـێتد پرێس پێی وایە گەیشتنی بـێ سنوور بەسەرچاوەکـانی هەواڵ زۆر پێویسـتـە بەمەرجێک خـۆی و دەزگاکانی تری هەواڵ پابەندی ئەو خـالانە بن.

بەڕێوەبەرە گـشـتـیـیە ئەفسـانەییـیەکـەی AP بەردەوام دەیگوت "هەواڵی ڕاست و بێلایەن، بەرزترین بیرۆکەی ئەخلاقیی بنچینەییە کە لە ئەمەریکا داهێنرا و درایە جیهان".

## یونایتد پرێس ئینتەرناشناڵ UPI

یونایـتـد پرێس دەڵێ کـە ئەو دوو پرنسـیـپی نوێی لە کـاری ئاژانسی دەنگوباسـدا داهێناوە. یەکـێکیـان ئەوەیە کـە هەر دەزگـایەکی هەواڵ دەتوانێ بەسـەربەخـۆیی هەواڵەکـانی جـیـهـان داپۆشێ. ئەوەی دووەمـیش ئەوەیە کـە ڕۆژنامـەکـان لە هەر

شوێنێکدا بن دەتوانن ئەو هەواڵانە بکڕن. ئی و سکریپس، کە خاوەن ڕۆژنامە بوو، سێ دەزگای هەرێمیی هەواڵی بەیەکەوە کۆ کردەوە و یونایتد پرێس ئەسۆشیەیشنزی دروست کرد. ڕاگەیاندنی یونایتد پرێس لە ١٥ی تەمووزی ١٩٠٧دا دەڵێ: "ڕاگەیەنراوە کە یونایتد پرێس لەسەر هێڵگەلی تەسک و بنەمای پاوانخوازی کار ناکا، بگرە هەوڵ دەدا خزمەتگوزاریی دادوەر و تەواو پێشکێشی هەموو بڵاوکەرەوەی ڕۆژنامەکان بکا". سکریپسیش دەڵێ: "پێم وایە مەزنترین خزمەت پێشکێشی خەڵکی ئەم وڵاتەم کردبێ دروستکردنی یونایتد پرێس بووە" لەبەرئەوەی ئەو کێبەرکێیەی یونایتد پرێس دروستی کرد بووە ڕێگر لەوەی ئەسۆشیێتد پرێس بازاڕی هەواڵ قۆرخ بکا و خۆی بڕیار بدا چ هەواڵێک بەجەماوەر بگا. لە ڕاگەیاندنێکی ڕۆژنامەیی ئەم دواییەدا، UPI لەبارەی خۆیەوە نووسیویەتی: "لە ساڵی ١٩٠٧ەوە، یونایتد پرێس ئینتەرناشنال UPI پێشەنگ بووە لە پێشکێشکردنی زانیاریی گرینگ بەکەناڵەکانی میدیا و بازرگانی و حکوومەتەکان و تۆژوان لە هەموو جیهاندا. بەداپۆشینی مەودایەکی فرەوانی بابەتی جیاجیا ڕۆژنامەوانانی UPI ڕاپۆرتی وردیان لەسەر گەورە ڕووداوەکان هەبووە لەگەڵ شیکردنەوەی دەگمەن بۆ ئەو پرسە جیهانییانەی کاریگەرییان لەسەر بڕیاری بازرگانی و سیاسی هەیە. بەرهەمەکانی UPI بەهەرسێ زمانی ئینگلیزی و ئیسپانی و عارەبین. بارەگای سەرەکییان لە واشنتۆنی پایەتەختە و نووسینگەیان هەیە لە بەیرووت و هۆنگ کۆنگ و لەندەن و سیئۆل و تۆکیۆ.

## ئەسۆشیێتد پرێسی ئوستراڵیا AAP

ئەسۆشیێتد پرێسی ئوستراڵیا AAP وتاری خۆناساندنی هەیە:

"پێشکێشکردنی سەرچاوەی کاریگەر و بێلایەن و باوەڕپێکراو و گشتگری هەواڵ و زانیاری بەمیدیای ئوستراڵیا و کەرتی تایبەت و گشتی". لە دەرخستەیەکی نوێتردا دەڵێ "ئامانجی ئێمە گەیاندنی هەواڵ و شیکردنەوە و زانیاریی ئاست بەرز و لە کاتی خۆی و تەواوە بەکڕیارەکانمان".

هەروەها بانگەشەی پابەندبوون بەچەند پرنسیپێک دەکا:

ئەم وتاری خۆناساندنە بەژمارەیەک پرنسیپ پشتگیری کراوە کە ڕێشاندەری AAP دەبن لە کارکردندا:

هەواڵ و زانیارییەکانی AAP بۆ هەموو میدیاکانی ئوسترالیا لەبەر دەستن.

بەردەوام خزمەتگوزارییەکانی هەواڵی AAP (دەق و وێنە) دوور لە بنەمای پاوانخوازی بەمیدیاکانی ئوسترالیا دەفرۆشرێن.

نابێ وەرگرتنی هاوکاری لە گرووپە کڕیارەکان لە قازانجی یەکێکیان و دژ بەوەی تر بێ.

ئاژانسی AAP فرۆشیاری بەکۆی زانیارییە و کێبەرکێ لەگەڵ ئەو کڕیارانەی خۆی دەکا کە لە میدیا کار دەکەن.

سەرەڕای ئەمانە، ئێمە هەوڵ دەدەین لە کێشمەکێش دوور بکەوینەوە، ئەویش بەئەنجامدانی پێوەندیی ڕێکخراو لەگەڵ کڕیارەکانمان و لە هەموو ئاستەکانی ڕێکخراوەکانیاندا.

لە کۆتاییدا، گەورەترین دوو گۆڕەپانی کێشەی چاوەڕوانکراو، کە پێویستە بەهەموو نرخێک خۆمانی لێ بپارێزین گۆڕەپانی هەر یەکێک لە نرخ و جۆری خزمەتگوزارین. کاتێ کێشە لەم دوو بوارەدا پەیدا دەبێ، چارەسەرکردنی زۆر سەختە و کاتی زۆری دەوێ و تێچووی زۆر دەبێ.

بۆیە پێشکێشکردنی هەواڵ بەچۆنایەتییەکی بەرز و لە کاتی خۆی و بەتەواوی و گشتگرانە و بەنرخێکی کێبەرکێکەرانە، کارێکی زۆر گرینگە.

## ئاژانسگەلی تر

ئاژانسی تێلیگرافی سویسرا ATS دەڵێ: "کۆمپانیاکەمان، کە تەمەنی لە سەدەیەک زیاترە، لەسەر سێ بەهای سەرەکی بنیات نراوە: سەربەخۆیی و یەکگرتوویی و توانای نوێبوونەوە، ئەمانەش بنەمای هێڵە گەرمەکانی ATSن".

ئاژانسی ANSA ئیتاڵیایی بانگەشەی پابەندبوون بەم بەهایانەوە دەکا: گەیاندنی زانیاری لە کاتی خۆیدا و بابەتیبوون و دەسەڵات. پرێس ترەستی هیندستانیش PTI باسی ڕاستیی زانیاری و وردی و خێرایی دەکا. لە کاتێکدا یونایتد نیوسی

هیندستان UNI باس له ناوبانگێکی بەرز دەکا کە لە ئاکامی داپۆشینی خێرا و وردەوە بەدەستی هێناوە. ئەسۆشیێتد پرێسی پاکستان APP پابەندە بەنەرێتە بەرزەکانی ڕۆژنامەوانی کە بریتین لە هەواڵگەیاندنی بابەتی و باوەڕ پێکراو و ورد.

جیجی پرێسی ژاپۆن دەڵێ: بەپابەندبوون بەدروشمی "هێنانی دەنگوباسی جیهان بۆ ژاپۆن و گواستنەوەی دەنگوباسی ژاپۆن بۆ جیهان" جیجی پرێس ناوبانگێکی بەرزی هەیە لە ژاپۆن و لە دەرەوەدا بەهۆی گەیاندنی هەواڵی باوەڕ پێکراو و دادوەرانە و بابەتییانە بەپشتبەستن بەبەڕێوەبردنی سەربەخۆ کە بەخاوەنداریی ١٠٠٪ی کارمەندان دەستەبەر کراوە.

ئاژانسی چینهوای چین دەڵێ "بەداپۆشینی ڕاستگۆیانە و بابەتییانەی ڕووداوەکانی نیشتمانی و نێودەوڵەتی و بەپشتگیریکردنی بەرژەوەندییەکانی جیهانی سێیەم، ئاژانسی دەنگوباسی چینهوا بەبەردەوامی ئەو دەنگە دەبێ کە جیهان ناتوانێ پشتگوێی بخا".

ئەمەش وتاری ئاژانسێکی نیشتمانیی سەر بەحکوومەتە لە دوای کۆتاییی شەڕی سارد: ئەرکی سەرەکیی ئاژانسی دەنگوباسی کۆماری سلۆڤاک کۆکردنەوە و پۆلێنکردن و ئەرشیڤاندن و پێشکێشکردنی زانیاریی جۆراوجۆرە لە بارەی ڕووداوەکانی سلۆڤاکیا و دەرەوە بەشێوەیەک پابەندی بابەتیبوون و مایەی باوەڕ پێکردن و خێرا گەیشتن بن بەپێی یاسای ژمارە ٨١ی ١٩٩٦

ئاژانسی دەنگوباسی ئەرمەنپرێس لە ئەرمینیا دروشمی مسۆگەرکردنی زانیاریی ورد و بێلایەن و خێرای بەرز کردووەتەوە.

میدیافاکس، کە گەورەترین ئاژانسی سەربەخۆی دەنگوباسە لە ڕۆمانیا ئەم "بەهاگەلی کۆمپانیا"یەی هەیە:

١- لەبەرئەوەی کڕیارەکان لە هەموو شتێک گرینگترن، بۆیە هەوڵدان بۆ بەدەنگەوەهاتنی ویستەکانیان ئامانجی بەردەوامە.

٢- پیشەییبوون و یەکپارچەیی. میدیافاکس ئەو ئاژانسەیە کە زانیاریی بابەتی و بێلایەن و خێرا پێشکێش دەکا.

٣- جۆرایەتی. جۆری باشی خزمەتگوزارییەکانی میدیافاکس وای کردووە

کڕیارەکانی ببنە وەرگری دڵسۆزی ئاژانسەکە. جۆرایەتی تەنیا بوارە کە میدیافاکس نەرمیی تێدا نانوێنێ. هەروەها میدیافاکس ئەرکی گەیاندنی زانیاریی پێویستی لە کاتی خۆیدا بەکۆمپانیاکانی ڕۆمانیای لە ئەستۆ گرتووە.

ئیتارتاسی میراتگری تاسی سۆڤێت، لە ساڵی ٢٠٠٥دا دەڵێ: هەر وەک چۆن سروشتی بەرهەمهێنانی هەواڵ لە پێشکەوتنی بەردەوامە، ئاژانسەکە نوێترین تێکنۆلۆجیا بەکار دێنێ بۆ ئەوەی بەخێراترین و کاریگەرترین شێوە هەواڵ لەگەڵ ڕوودانی دابەش بکا. "ئێمە لە نزیکەوە هاوکاری لەگەڵ دەسەڵات و حیزب و بزووتنەوە سیاسییەکان و ڕێکخراوە جەماوەری و مرۆییەکان و وەزارەتەکانی حکوومەت و دەزگا بازرگانییەکاندا دەکەین. تواناکانی ئاژانسەکەمان دەتوانن هەر تێنوێتییەک بۆ زانیاری بشکێنن". دروشمی ئیتارتاس: "خێرایی و جێی باوەڕی و جۆری باشی هەواڵ".

هەموو ئەمانەی وتران باشن. بەڵام ڕاستی چییە؟ ئایا بەڕاستی ئاژانسەکان پابەندی ئەم ڕاگەیاندنانەن؟ هیچ کێشەیەک سەبارەت خێرایی نییە. بگرە ئامانجی ئەمڕۆ گەیاندنی هەواڵە لە کاتی ڕاستەقینەی خۆیدا، لەو کاتەی ڕووداوەکە ڕوو دەدا. بەڵام ئەگەر خێرایی و وردی ڕووبەڕووی یەک بوونەوە، پێویستە وردی بخرێتە پێشەوە. ئەگەر هەڵە کران پێویستە ڕاستەوخۆ ڕاست بکرێنەوە. هەرچەندە دەشێ هەتا هەتایە گفتوگۆ لەسەر بابەتیبوون و سەربەخۆیی و دادوەری و بێلایەنی بکرێ.

**بابەتیبوون**

پرسی بابەتیبوون کێشەی گشت میدیاکانی هەواڵە، بەڵام لە هەموویشیان زیاتر کێشەی ئاژانسی دەنگوباسە، لەبەرئەوەی ئەرکی بنەڕەتیی ئاژانس کۆکردنەوەی هەواڵ و بڵاوکردنەوەیەتی بەسەر بەرەیەکی فرەوانی ئابوونەدەرانەوە کە هەر یەکێکیان بیر و بۆچوونی تایبەتی خۆی هەیە. بۆیە پێویستە حوکمی ئاژانس لەسەر دەنگوباس و هەڵبژاردنیان و ڕێکخستنیان و پێشکێشکردنی زانیارییەکان هەموو ئابوونەدەرانی خۆی خۆشحاڵ بکا. هەر کاتێ ئاژانسێک زۆر جەختی کردە سەر لایەنێک و لایەنەکانی تری سەخڵەت کرد، ئەو کات نەک تەنیا دەسبەرداری ئەرکی

خـۆی دەبێ بگرە ناپاکـیی لەگـەڵدا دەکـا، بەمـەش ئـاژانسـی دەنگوبـاس ڕاسـتگۆیـی خۆی لـەدەست دەدا و لە پاڵ ئەمەشـەوە کاریگەری و سـەنگی کۆمـەڵایەتی و پیشـەیـی خـۆشی لەدەسـت دەدا. بەردەوام ئەو ئاژانسـانەی کێـبەرکێی یەکتر دەکـەن تۆمـەتی ئەوە دەخـەنە پاڵ نەیارەکانیان کە گوایە لە لایـەنێکەوە پارەدار دەکرێن و سـەربەخۆ نین، بۆیە هەواڵەکانیان دادوەرانە و بابەتی نین.

ڕەنگە حکوومـەتێک وای پێ باش بێ ئـاژانسـێکی دەنگوباس نـاچار بکا هـەواڵێک بڵاو بکاتـەوە چونکە دەیەوێ بگاتـە خـەڵک و هـیـچی تر. لەو کـاتـەدا دەبێ هـەست بەدڵنیایی بکا لەوەی بڵاوکردنەوەی ئەو زانیارییـە هیچ زیان بەڕێژیمەکەی ناگەیەنێ. بەڵام لۆجـیکی ئەو کـارەی حکوومـەتەکـە، کـە لغـاوکـردنی چالاکـیی ئـاژانسـەکـەی دەنگوبـاسـە، مـتـمـانـەی خـەڵک بەو ئاژانسـە و بەحکوومـەتـەکـەش لاواز دەکـا. هەر کاتێکیش ئەو متمانەیە نەما هیچ ئاژانسێکی دەنگوباس ناتوانێ ڕای گشتی دروست بکا. بەم شـێـوەیە یەکێ لە ئـامرازە سـەرەکـیـیـەکـانـی بەدەسـتـهـێنانی ڕەزامـەندیی جـەمـاوەر، بەشـاراوەیی یاخـۆ بەئاشکرا، لەناو دەچێ و لـە کۆتاییدا بـڕوانەبوون بەو کەناڵی زانیارییە دەبێتە فاکتەرێکی دژ بەبەرژەوەندیی هەر سیستمێکی دیموکرات.

لەگـەڵ هـەمـوو ئەمانەشـدا تا ئێسـتا ناسـاندنێکی یەکلاکـەرەوەی بابەتیـبوون نییـە. بابەتیـبوون بۆ هـەمـوو کـەسـێک هـەمـان واتا نابەخشێ. لـە بلۆکی سۆسـیـالیسـتدا، لایەنداری کـــارێکی بـابـەتـیـــیـــە ئەگـــەر هـات و لایـەنگریی پۆل و هـێـــزە "پێـشـکەوتنخـوازەکـان" بوو. ئـەمــەش لەوێوە سـەرچاوەی گـرتووە کـە لایەنگریی سۆشیالیزم بەشێکی دانەبڕاوە لە هەڵسـەنگاندنی ڕووداو یا وتار یاخۆ تیۆرییەکاندا. خـەڵکی تیـۆری لـە بلۆکی نـاسـۆشـیـالیسـتـدا ئەمـە پەسـەند نـاکـا. ئەمـان دەڵێن ڕۆژنامـەوان پێـویسـتـە ڕاسـتی بزانێ و هـەوڵ بۆ زانینی بدا. بەڵام لەگـەڵ جیـاوازیی بۆچوونی هـەردوو بلۆک لە ناسـاندنی بابـەتیبـووندا، هەردوو لا کـۆکن لەسـەر ئەوەی بابەتیبوون بناخەی کاری ئاژانسی دەنگوباسە.

لە پێـشـەکـیی "ڕۆژنـامـەوانیی ئاژانسی دەنگوباس"دا کـە لە لایەن ڕێکخـراوی نێودەوڵەتیی ڕۆژنامەوانانەوە بڵاو کراوەتەوە، هەردوو ڕۆژنامـەوانی چیکۆسلۆڤاکیایی سـلاڤۆی هـاسکۆڤ و یارۆسـلاڤ فیـرست هەردوو بیـرۆکـەی بابەتیـبوونی ڕووت و

بێلایەنیی تەواو بە"هەڵە" دەژمێرن. ئەوان دەڵێن هیچ هەواڵنووسێک چەند کارامە بێ ناتوانێ خۆی تەلاق بدا و بەتەواوی لە ئاست پێشهاتە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکاندا بێلایەن بێ. بەڵام ئەمەش دەڵێن: "بیرۆکەیەکی تری بابەتیبوون کە دەکرێ پیادە بکرێ، ئەویش بەواقیعیبوونی مەنهەجیی هاوسەنگییە لە گواستنەوەی هەواڵدا. ئەمەش بەگشتی ئەوە دەگەیەنێ کە گواستنەوەی هەواڵ تا دەکرێ لە ڕاستییەوە نزیک بێ: واتە ڕاستییەکان و کەسایەتییەکانی لە بابەتی هەواڵەکەدا دەردەکەون پێویستە لێیان دڵنیا بی و چەند جارێک لێیان ورد ببیتەوە و دەستەواژەی هەڵسەنگاندن زۆر بەوردی بەکار بهێنرێن و تەنیا لەو شوێنانەدا بەکار بهێنرێن کە دەکرێ بەبەڵگە پشتگیری بکرێن و بەباشی لەسەر بنەمای ڕاستییەکان بنیات نرابن.

"ئەوەش دەگەیەنێ کە نابێ پێشکێشکردن تەنیا یەک لا بگرێتەوە و بەشێوەیەکی هەستبزوێن گەورە کرابێتەوە، بگرە پێویستە بەباشی هاوسەنگ کرابێ. هەروەها ئەوە دەگەیەنێ ئەگەر بکرێ لە هەموو سەرچاوەکانەوە زانیاری وەرگیرێ و هەڵسەنگاندن و بۆچوونەکانیان نابێ تێکەڵ بە هەڵسەنگاندن و بۆچوونەکانی هەواڵنووس بکرێن. هەر کاتێکیش هەواڵنووس ئەو شتانەی تۆمار کرد کە خۆی دیویەتی پێویستە ئەوە دیاری بکات و جیای بکاتەوە لە هەر زانیارییەکی دەستی دووەم کە لە چیرۆکی هەواڵەکەیدا بەکاری دەهێنێ و پێویستە پێش بەکارهێنانی لە ڕاستییەکەی دڵنیا بێ.

بەم واتا پیشەیی و مەنهەجییەی وشەکە، بابەتیبوونی ئاژانسی دەنگوباس پێویست و دەستەبەر دەبێ. هەروەها لەوانەیە ببێتە بناخەیەکی سەرەکی بۆ مامەڵکردنی ناتەواوی ئاشکرا لەگەڵ هەواڵ لە هەندێ ڕۆژنامەدا یان هەندێ لەوانەی هەواڵ شی دەکەنەوە و بەدوایدا دەچن".

هێربەرت بروکەر لە کتێبەکەیدا گەیاندن هێزە: بەها نەگۆڕەکان لە ڕۆژنامەوانیی پڕ گۆڕاندا کە چاپخانەی نیویۆرکی زانکۆی ئۆکسفۆرد بەچاپی گەیاندووە (١٩٧٣) دەڵێ: "قسەیەکی پووچە ئەگەر بڵێین شتێکی وەک بابەتیبوون بوونی نییە. هەر کەسێک لە بواری هەواڵدا کار بکا و بەتوانا بێ لەو بوارە و بەشارەزایی قاڵ بووبێتەوە بەئاسانی جیاوازیی نێوان چیرۆکێکی دەستکاریکراو و چیرۆکێکی

دادوەرانەی بێ دەستکاریت پێ دەڵێ. ڕاپۆرتدانی بابەتی تەنیا بریتییە لە ڕاپۆرتدانی باش: کاری کەسێکی پیشەیی خاوەن دیسپلینە کە خۆی کوشتووە بۆ ئەوەی هەموو چیرۆکەکەی دەست بکەوێ و دوای دەسکەوتنی بەوردی و دەستپاکییەوە پێشکێشی بکا بێ ئەوەی بهێڵێ لایەنداریی خۆی دزە بکاتە ناو چیرۆکەکەوە".

کۆمیتەی ئاژانسەکانی دەنگوباس بەسەرۆکایەتیی کولدیپ نایار لە ئابی ۱۹۷۷دا ڕاپۆرتێکی دەرخستووە دەڵێ: "سەردەمی ڕاپۆرتدانی بەکورتکراوەیی لە هەموو جیهاندا بووەتە بەشێک لە ڕابردوو. لەو کاتەدا کە دەبێ لێدوان و قسەکان بەوردی داپۆشرێن- لەبەرئەوەی وردی بەشێکی گرینگە لە بابەتیبوون- پێویستی بە زانیاریی باش و ئاگەداریی تەواو لە ڕەوتی هەر کێشەیەک کە ڕووبەڕووی کۆمەڵگە دەبێتەوە بەگشتی نابێ بەهەند هەڵنەگیرێن. کەتەلۆگێکی زانیاری بابەتێکی کاریگەری هەواڵ نییە. ئەمڕۆ پێویستە ستافی ئاژانسی دەنگوباس، چ بەشی هەواڵنێری بێ یاخۆ بەشی نووسیاری، بەباشی لەو کێشانە تێ گەیشتبن و ئاگەداری پێشهاتەکانیان بن کە دەیانەوێ مامەڵەتیان لەگەڵدا بکەن. ئەمەش بەبێ کەمێک پسپۆڕی ناکرێ، لەبەرئەوەی ئاڵۆزییەکانی کۆمەڵگەیەکی مۆدێرن لە سایەی شۆڕشی تێکنۆلۆجیای ئێستادا ناکرێ بگەیەنرێنە جەماوەر بەبێ ئەوەی ئەو ئاژانسەی دەیانگوازێتەوە بەتەواوی ئاگەداریان بێ".

پێویستی بەسەرچاوە هەواڵنێری ئاژانسی کرد بە"دیمانەکەرێکی بابەتی". لەبەرئەوەی ئەو ناچار دەبوو ئەو بۆچوونانەی لە دیمانەکەدا دەربڕاون بەوردی بنووسێتەوە، بەبێ ئەوەی بۆچوونی خۆی سەبارەت ڕاستی و ناڕاستییان تێکەڵ بەبابەتەکە بکا. ئەمە ڕەنگە هاوکاری بێ بۆ خۆ ڕزگارکردن لە بەرپرسیاری و زانینی شتی زۆر لە بارەی بابەتەکەوە، بەڵام بەهیچ جۆرێک لە بابەتیبووندا هاوکاری نابێ. لەبەرئەوەی ئەگەر کار بەو گریمانەیە بکەین کە بەهاکانی هەواڵ پێوەستن بەو کەسەوە کە دەیگێڕێتەوە، ڕۆڵی خراپی هەواڵدەر دەبێتە هۆی تێکشکاندنی ڕاستییەکە. یەکێ لەو نموونانەی ئەمە ئەو شێوازەیە سیناتۆری ئەمەریکایی جۆ مەککارتی دەیتوانی لە ڕێیانەوە سەردێرەکان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بۆ خۆی قۆرخ بکا بەتۆمەتگەلێ کە هەموو کەسێ دەیزانی ڕاست نین بەڵام کەس نەیدەزانی چۆن دەست

له باسکردنیان هەڵگرێ. ئەمە بەشێوەیەک لە شێوەکان وابەستەی ڕێگەیەکی هەڵسەنگاندنەوەی یاساکانی بابەتیبوونە لە ڕۆژئاوادا. لێکدانەوە و باکگراوند و شیکردنەوە بوونەتە بەشێکی بنەڕەتی لە هەواڵدانی بابەتیانە بەڵام لە پاڵ بەستنەوە هەواڵنێر بەئاشکراکردنی ڕادەی ڕاستیی زانیارییەکانی و وردیی وەسفەکەی. ئەم گۆڕانکارییە لە ١٩٤٧ەوە ڕێی بۆ خۆش کرا لە لایەن کۆمیتەی ئەمەریکاییی ڕۆژنامەوانیی ئازاد و بەرپرس بەسەرۆکایەتیی رۆبەرت هەچینز، ڕاوێژکاری زانکۆی شیکاگۆ. یەکەمینی ئەو پێنج پێداویستییەی لیژنەکە بەپێویستی زانین بۆ ڕۆژنامەوانی لە کۆمەڵگەیەکی ئازاددا بریتی بوو لە: "تۆمارێکی ڕاستگۆ و گشتگر و شیاوی ڕووداوەکانی ڕۆژ بەدارشتنێک کە واتا بەو بەهایانە ببەخشێ". کۆمیتەکە ئەوەشی ئاشکرا کرد کە "ئیتر تەنیا گەیاندنی ڕاستییەکان بەڕاستی بەس نییە. بگرە ئەمڕۆ پێویستە ڕاستی لە بارەی ڕاستییەکەوە بڵێی".

ئاژانسی دەنگوباس دەتوانێ بەتوندی پابەندی گشت پێداویستییەکانی بابەتیبوون بێ بەڵام بۆچوونێکی وا بەخوێنەران ببەخشێ کە ڕاستی نەیسەلمێنێ. دەکرێ دوو ئاژانس هەمان چیرۆک وەبەر بێنن بەڵام دوو ڕووی دژ بەیەک پێشان بدەن. لە ڕاستیشدا لێرەدا دەردەکەوێ کە بابەتیبوون گرینگترە لە پابەندبوون بەیاسا فەرمییەکانەوە. لەوانەیە ڕۆژنامەیەک چیرۆکێک بخاتە بەرچاو و یەکێکی تر خەفە بکا بەگوێرەی بڕیاری نووسیار لەسەر هەواڵەکان یاخۆ بەپێی سیاسەتی ڕۆژنامەکە. بەڵام ئاژانسی دەنگوباس هیچ سیاسەتێکی نییە جگە لە بەدەنگەوەهاتنی بەرژەوەندیی هەموو کۆمەڵ. هەر وەک یەکەم کۆمیتەی ڕۆژنامەوانیی هیندستان لە ١٩٥٤دا بۆی دەرکەوت کە "وەک پێشکێشکەری هەواڵ، ئەرکی ئاژانسی دەنگوباس تەنیا ئەوەندە نییە خۆیان بەدوور بگرن لە لایەنداری و بەتوندی پابەندی پرنسیپەکانی ڕاستی و بابەتیبوون و گشتگری بن، بگرە پێویستە ڕوون بێ لەبەر چاوی ڕۆژنامە و جەماوەردا کە ئاژانسی دەنگوباس پابەندی ئەو بنەمایانەیە".

بۆیە پێویستە ئاژانسی دەنگوباس زۆر ورد بێ لە هەڵبژاردنی ئەو خاڵەی هەواڵ کە دەکرێتە سەردێر لەبەرئەوەی ئەوە دەبێتە پێوانەی بابەتیبوونی ئاژانسەکە. کاریگەریی سەردێر تەنیا لەسەر "تامکەری هەواڵ" و نووسیاری یاریدەر نییە بگرە

لەسەر خوێنەریشە. سەردێر کار دەکاتە سەر بنیاتی چیرۆکەکە و چوارچێوەیەک بۆ وێنەکە پێک دەهێنێ. هەر وەک سەردێر، هەڵبژاردنی وردەکاری و گواستنەوەی قسەکان و بەکارهێنانی فەرمانەکان بۆ وەسف کردن و تەکنیکی خستنەڕووی باکگراوند، ئەو هەواڵانەی لە ئاژانسی دەنگوباسەوە دەردەچن پێویستە لە ڕوخسار و ناوەڕۆکدا بێلایەن و دادوەرانە بن.

تاقیکردنەوەی بابەتیبوون بەوەیە ئایا ڕاپۆرتەکە هەردوو ڕووی پرسەکە پێشان دەدا. ئایا دەسپاک و دادوەرە بەرامبەر بەهەموو لایەنەکانی پێوەندیدار؟ ئایا بەئاشکرا یاخۆ بەهەر شێوەیەک لای بۆچوونێک دەگرێ؟ بێگومان بابەتیبوون ئەوە نییە بەبێ چەندوچوون شتەکان وەک چۆن دیارن وەرگری. لە دیموکراسیدا زۆر گرینگە بەرهەڵستکار بەشی خۆی لە داپۆشین بەتەواوی وەرگرێ. هەروەها پێویستە ئاژانسی دەنگوباس خۆی لەوە بپارێزی بەلایەنداری بەرژەوەندییەکی دیاریکراو بناسرێ جا ئەو بەرژەوەندییە ئابووری یا کۆمەلایەتی یا سۆسیالیست یا سیاسی بێ، یا تەنانەت لایەنداری دەزگاکەی خۆی بێ لە هەر هەنگاوێکدا کە پێوەندیی بەکۆمەڵگەوە هەبێ. هەرچەندە بەرپرسیاریی سەرەکی هی دەوڵەتە، بەلام هێز و زیندوویی ئاژانسی دەنگوباسەکە خۆی پارێزەرێکە لە دژی دەستێوەردان. باشترین دەستەبەری کاریگەریی ئاژانسی دەنگوباسیش هەبوونی کەسانی بەهێزە لە ناو ئاژانسەکەدا. زۆر لە ئاژانسەکانی دەنگوباس لە جیهاندا تەکنیکی جۆراوجۆری چاودێریی ناوخۆیی و سەرپەرشتیاری بەکار دێنن بۆ ئەوەی هەر هەڵەیەک یەکسەر هەستی پێ بکرێ و هەڵسەنگاندنی ڕاستەوخۆش بۆ کارەکان هەبێ.

## لایەنداری

هەرچەندە قوتابخانەیەکی تری بیر هەیە دەڵێ جگە لە بابەتیبوون هیچ شتێکی تر نییە بەو گرینگییە. بەلام ئەوە تەنیا ئەفسانەیەکی ڕۆژنامەوانییە و نەتوانراوە بسەلمێنرێ. ئەگەر هەوڵیش هەبن بۆ پشتگوێخستنی ئەم ڕاستییە، پێوەندیی نێوان مرۆڤەکان بەردەوام لە چوارچێوەیەکدا ڕوودەدا و پێویستی بەهۆکارێک هەیە و لە نێوان تاکگەل یا گرووپگەلێکدا ڕوودەدا کە لە پێگەیەکی مێژوویی و سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتیدان. ئەم بارە نە باشە و نە خراپە. ئەو تەنیا ئەوەیە کە هەیە.

لایەنداری وشەیەکە کاریگەرییەکانی کۆکراوەی هەموو ناوەڕۆکی پەیامێکی پێ دەناسێنرێ.

لایەنداری، لە نێو کۆمەڵێ شتی تردا، لەمانەوە سەرچاوە دەگرێ:

١- بەرژەوەندیی نەتەوەیی.

٢- ئەو پێکهاتە کۆمەلایەتی و سیاسییەی ئاژانسەکە لە چوارچێوەیدا کار دەکا.

٣- سروشتی سەرچاوەی هەواڵەکە.

٤- باکگراوندی دەرگەوان یاخۆ تامکەری هەواڵ.

لایەنداری زۆرتر لە راپۆرتگەلی دەستەودەست پێکراودا زەق دیار دەبێ. لەگەڵ ئەمەشدا راپۆرتی ڕاستەوخۆش لێی بەدوور نییە و لێرەدا بەرژەوەندیی نەتەوەیی و بەرژەوەندیی زۆرینەی کڕیاران باڵ بەسەر گۆشەنیگاکاندا دەکێشێ.

ئەمە بەباشی لە نموونەی چۆن ئاژانسێکی ئەمەریکا کە زۆربەی وڵاتانی ئەمەریکای لاتین بۆ هەواڵەکانیان پشتی پێ دەبەستن، هەواڵی بەدەستهێنانی سەربەخۆیی لە لایەن هەرێمێکی داگیرکراوی ئەمەریکای باشوورەوە کە سورینامە لە ١٩٧٦دا پێشکێش کرد. ئەم ڕووداوە بۆ ئەمەریکای لاتین و هەموو جیهان، مێژوویی بوو لەبەرئەوەی لادانی دوا قەلای حوکمڕانیی ڕاستەوخۆی داگیرکاری بوو لەوپارزەوییەدا. بەلام لەبەرئەوەی ئەمەریکا تەنیا لەبەرئەوە گرینگیی بەسورینام دەدا کە سەرچاوەیەکی بەردی بوکسایت بوو بۆی، ئاژانسە ئەمەریکاییەکە لە سەردێرەکەیدا گوتی سەربەخۆیی سورینام لە دەشتی حوکمڕانیی هۆڵەندا کار ناکاتە سەر هاتنی ئەو بەردە بۆ ئەمەریکا. لێرەدا ناکرێ بگوترێ ئەو ئاژانسە ئەمەریکاییە هەڵەی کردووە لەبەرئەوەی ئەو ڕوانگەیەی ئەو لێیەوە سەیری ڕووداوەکەی کردووە لەگەڵ بەرژەوەندیی ئەمەریکادا گونجاوە. بەلام ئایا دەکرێ بەرژەوەندیی نەتەوەیی ببێتە هۆی لەناوچوونی بەهاکانی جیهانیی هەواڵ لە داپۆشینی ڕووداوێکدا؟ ئەم نموونەیە ڕەنگە ئاماژە بێ بۆ لایەندارییەک کە بەدەستی ئەنقەست نەبێ، چونکە ئاژانسێک کە خۆی بەنێودەوڵەتی بزانێ دەبوایە لەو کۆپییەی هەواڵەکانی کە ئاڕاستەی شوێنانی تری جگە لە ئەمەریکای دەکا، پێویست بوو ئەو سەردێرە بگۆڕێ.

بەڵگەنامەیەکی یونسکۆ کە کۆمیتەی نێودەوڵەتیی توێژینەوەی گرفتەکانی گەیاندن لە ۱۹۷۸دا ئامادەی کردووە، لە زاری یوڤان سۆماڤیاوە، سەرۆکی ILO، بەم شێوەیە ئەو هەڵانە ڕوون دەکاتەوە کە ئاکامی بیرۆکەی بازرگانین، بەقسەی ئەو "بیرۆکەی بازرگانی لە هەواڵدا لە ناو خۆیدا جیاکردنەوەیەکی سیستماتیک دژ بەو ڕووداوانە بەرپا دەکا کە نافرۆشرێن و ئەو ڕووداوانە هەواڵ نین لەبەرئەوەی جێی بایەخی بازاڕ نین. لە هەمان کاتیشدا ویستێکی شێواندنی ڕووداوەکان هەیە بەزەق پێشاندانی ئەو لایەنانەی کە زیاتر لە بازاڕدا ویستراون". بەم شێوەیە بەرهەمی کۆتایی "پەیامێکی بێ واتایە و لۆجیکی بازاڕ بەسەر ناوەڕۆکەکەیدا زاڵە". ناوەڕۆکی هەواڵ ڕەنگدانەوەی ئەو بەرژەوەندییانە دەبێ کە زاڵن بەسەر ئەو دەزگایەدا هەواڵە دێنێتە بەرهەم. بێگومان هەواڵەکە بەفەرمی پابەندی بەهەموو بنەماکانی بابەتیبوون دەپارێزێ، بەڵام ناوەڕۆکەکە بەلایەنداریەکی دیار و شاراوە و ورد و بەمەبەست و بێ مەبەستەوە داڕێژراوە.

سەرچاوەیەکی تری لایەنداری پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی سیاسی و ئابووریە لە ژینگەیەی ئاژانسەکە کاری تێدا دەکا. بێگومان حوکمدان لەسەر هەواڵ ڕەنگدانەوەی ئەو بەهایانە دەبێ کە ئەو پێکهاتەیەیان لەسەر بنیات نراوە. بۆیە دەرگەوان و تامکەرانی هەواڵ گرینگن کاتێ باسی لایەنداری لە هەواڵدا دەکرێ. سروشتی کۆکردنەوەی هەواڵ و پرۆسەی وەبەرهێنانەکەی لە زۆربەی کاتدا ئاستی لایەنداری بەرز دەکاتەوە. کارەکە بەسەیرکردنی فیلەکە دەچێ لە لایەن شەش کوێرەکەوە. هەر یەکێکیان بۆچوونی خۆی هەیە، کە لەسەر ئەو بەشەی لەشی فیلەکە لای دروست بووە کە خۆی دەستی لێی داوە. بەڵام ئەگەر ئەو ڕا و بۆچوونانەی هەر شەشیان کۆ بکەیتەوە وەسفی فیلت بۆ دەرناچێ. بەهەمان شێوە کاتێ هەواڵ لە سەرچاوەگەلێکی جیاجیا کۆ دەکرێتەوە، هەر ڕاپۆرتی کۆتایی وێنەیەکی تەواوی پڕ ڕاستی پێشکێش ناکا.

## توێژینەوەی هەواڵەکانی دەرەوەی IPI

زۆر توێژینەوە لە بارەی بابەتیبوون و لایەنداری لە نێو ئەو گفتوگۆ زۆرەی لەسەر یاسای نوێی زانیاری و گەیاندنی جیهان NWICO لە ۱۹۷۰کان و ۱۹۸۰کاندا

پێشکێش کران. بەڵام ئەو تۆژینەوەیەی لە ١٩٥٣دا پەیمانگەی جیهانیی ڕۆژنامەوەوانی IPI لەسەر هاتنی هەواڵ کردی، کە لایەنێکی ڕۆژنامەوانی بۆ خزمەتی ڕۆژنامەوانی ئەنجامی داوە، هەندێ بۆچوون و نرخاندن و ڕاوێژ لە بارەی داپۆشینی هەواڵەکانی دەرەوە پێشکێش دەکا کە تا ئەمڕۆ گونجاون. ئەم تۆژینەوەیە بەچاوێکی پیشەیی بابەتگەلی وەک لایەنداری دەبینێ.

هەر وەک بەشداریی نووسیارانی ئەمەریکایی لەم تۆژینەوەیەدا، نووسیارانی ئەورووپای ڕۆئاوا وشەی تریان بەرامبەر بەوشەکانی لێکدانەوە و باکگراوندی ئینگلیزی بەکار هێنا بۆ وەسفکردنی ئەو نووسینەی بەمەبەستی گونجاندنی هەواڵ لەگەڵ ئامانجی ویستراودا بەکار دێ. کەم لە نووسیارانی ئەورووپا دژی بنەمای ڕوونکردنەوەی گرینگیی ڕووداوێکی دەرەوە بوون و کەم لە نووسیارانی ئەورووپا کەمتر لە ئەمەریکاییەکان جەختیان لەسەر گرینگیی نووسینی ڕوونکەرەوە لە ڕاپۆرتەکانی ئاژانسی دەنگوباسدا کرد. لە کاتی گفتوگۆ لەسەر بابەتی نووسینی ڕوونکەرەوە لە کۆبوونەوەی لەندەنی IPI لە ١٩٥٣دا دەرکەوت نووسیارانی ئەورووپاییی ڕۆژنامەکان لە هاوپیشە ئەمەریکاییەکانیان زیاتر ئاشنای تێکەڵکردنی ڕوونکردنەوەن لەگەڵ ئەو هەواڵانەی پێیان دەگوترێ هەواڵی "ڕاستەوخۆ" و بێگومان زیاتر قبووڵی هەبوونی گوتار و بۆچوونی نووسیار لە چیرۆکی هەواڵدا دەکەن.

زۆرینەی نووسیارانی ئەورووپاییی بەشدار لە گفتوگۆیەک لەسەر نووسینی ڕوونکەرەوە لە داپۆشینی هەواڵی دەرەوە پێیان وا بوو ئەو نووسینە زۆر پێویستە. نووسیارێکی ئەڵمان گوتی: "بەهای ڕاستییەکان سنووردارە، بەهای تەواوی هەواڵ تەنیا ئەو کاتە دیار دەکرێ کە لە شێوەی گونجاوی خۆیدا دەردەکەوێ. پێویستە هەواڵەکە بەپێی باکگراوندی خۆی ڕوون بکرێتەوە".

نووسیارێکی بریتانیایی گلەیی ئەوەی کرد "بەشێکی زۆر لە هەواڵەکانی ئاژانسەکان دەبێ فڕێ بدرێن لەبەرئەوەی بەشێوەیەکی گونجاو ڕوون نەکراونەتەوە و پێشکێشکردنی زانیاریی ڕووت لە زۆربەی کاتدا بۆ خوێنەری ئاسایی بەس نییە". نزیکەی پێنجیەکی نووسیارە ئەورووپاییەکان لەو باوەڕەدان کە نووسینی ڕوونکەرەوە لە هەواڵی "ڕاستەوخۆ" جیا بکرێتەوە. نووسینی ڕوونکەرەوە لە لایەن

ئاژانسی دەنگوباسەوە بەسوودە تەنانەت لەو کاتانەشدا کە بواری ئەوە نییە چیرۆکەکان گومانیان لێ بکرێ، ئەمە بۆچوونی هەندێ لە نووسیارە ئەوروپاییەکانە. ئەم ڕوونکردنەوانە نووسیار و ستافەکەی ڕۆشنبیر دەکا و بناخەی نووسینی سەروتار دادەڕێژێ.

هەرچەندە هەندێ نووسیارانی ئەوروپا کە خوازیاری بابەتی ڕوونکەرەوەن لە هەواڵدا، مەترسیی ئەوەشیان لەبەر چاوە کە ڕوونکردنەوەی ئاژانس بۆ ڕووداوگەلی دەرەوە ڕەنگە لایەنداری یاخۆ بۆچوونی تایبەتی ئاژانسەکەی تێکەڵ بێ. نووسیارێکی بەلجیکا پێی وایە ڕەنگە "لایەنداری بەمەبەستی چاکە" هەبێ. ئەو کەمینەیەی نووسیاران کە دەیانگوت نابێ بەهیچ شێوەیەک مادەی ڕوونکەرەوە لە هەواڵدا هەبێ مەترسیی سەرەکییان پەیدابوونی لایەنداری و بۆچوونی تایبەت بوو. نووسیارێکی هۆڵەندایی کە نموونەی ژمارەیەکی کەمە کە لە هەر وڵاتێکدا هەن دەڵێ "ئێمە بەگومانین لە هەموو جۆرە ڕوونکردنەوەیەک تەنانەت هەندێ جار لە ڕوونکردنەوەکانی خۆشمان لەم سەردەمی ململانێی سایکۆلۆجییەدا".

نووسیارێکی ڕۆژنامەیەکی لەندەنی دژ بەڕوونکردنەوەکانی ئاژانسەکان بوو لەبەر سێ هۆ:

١- هەر ئاژانسێک لە ژێر کاریگەریی ناسیۆنالیستانەی وڵاتێکدایە،

٢- زۆربەی کات ڕوونکردنەوەکانی ئاژانسەکان سەرچاوەکانیان نادیارن،

٣- زۆر کەرەت ڕوونکردنەوەی ئاژانس لە لایەن "ڕۆژنامەوانانی شارۆکەکانەوەن" کە بەڕێکەوت "پێوەندییان لەگەڵ ئاژانسێکی ناسراوی جیهان پەیدا کردووە".

نووسیارێکی سویسرایی دەڵێ بۆی دەرکەوتووە "نزیکەی گشت هەواڵنێرێکی دەرەوە لە ژێر مەترسیی لایەنداریدایە. بۆیە بەردەوام مەترسیی ئەوەی لێ دەکرێ توانای پێشاندانی بابەتییانەی هەموو لایەنەکانی وێنەکە لەدەست بدا و تەنیا وێنەیەکی یەک لایەنەی ڕووداوە سیاسییەکان بخاتە بەر چاوان وەک چۆن لەو شوێنەوە دەبینرێ کە ئەو کاری تێدا دەکا". لایەنداریی نیشتمانی لە بەلجیکا بەدوو سەر کار لە هەواڵنێر دەکا "ئەگەر هەواڵنێرە تایبەتەکە بەتەواوی ئازاد بێ لە ڕادەربڕین، ئەوە لە زۆربەی کاتدا دەکەوێتە بەر کاریگەریی داوی لایەندارییەکی

دوولایەنەوە بۆ نیشتمان یەکێکیان بۆ نیشتمانەکەی و ئەوەی تریان بۆ ئەو نیشتمانەی تێیدا نیشتەجێیە".

تۆژینەوەکەی IPI ئەوەی ئاشکرا کرد کە نووسیارانی ئەوروپایی گەلێک لە ئەمەریکاییەکان زیاتر بڕوایان وا بوو پێویستە چاکسازی لە وردیی پەیامی ئاژانسەکاندا بکرێ. هەندێ نووسیاری تر باسی ورووژاندنیان کرد تەنانەت لە کاتی گەیاندنی هەواڵی ڕاستەوخۆشدا. زۆر نموونەی باش خرانە ڕوو لە بارەی کەموکورتییەکانەوە لە وەرگێڕانی ڕاپۆرتی ئاژانسەکان لە نووسینگەی خۆجێیی و ئاژانسە نیشتمانییەکان و هەندێ نووسیاری ئەوروپایی بەتایبەتی باسی ئەم کێشەیەیان کرد. نووسارێکی فرانسە گوتی کۆپییەکە "پڕە لە هەڵە" و تەنانەت "واتای پێچەوانە" دەبەخشێ بە وشەگەلێک لە کاتی دووبارەبوونەوەیان لە چەند ڕستەیەکدا. هەندێ نووسیاری تر پێیان وا بوو وەرگێڕانی ئەو کۆپییەی بۆ خوێنەری بیانی ئامادە کراوە بۆ خوێنەرانی خۆیان کێشەیە.

کێبەرکێ بۆ "پاوانکاری" توخمی ورووژاندنیشی پشتگوێ نەخستووە. نووسیاری یەکێ لە ڕۆژنامە ڕۆژانەکانی پاریس دەڵێ "هەواڵی پاوانکراو دەگمەنن، بۆیە هەندێ جار پێویستە دروست بکرێن". نووسیارێکی فرانسەیی دەڵێ نووسینگەکانی ئاژانسەکان "ئینتەلا" بەئابوونەدەرەکانیان دەکەن لە کاتێکدا ئەوەی ڕۆژنامەکان دەیانەوێ ڕاپۆرتی سووکەڵە و ڕیکوپێکە. نووسیارێکی هۆڵەندا کە نموونەیە بۆ ئەوانەی تر، وتی زۆر جار هەواڵنێری ئاژانسەکان "بۆ ئەمەریکاییەکان نەک بۆ ئەوروپاییەکان دەنووسن و جاری واش هەیە بۆ ئەنگلۆساکسۆنەکان دەنووسن و لە دەرەوە تەماشای ئەوروپا دەکەن".

تۆژینەوەکە ئەوەی ئاشکرا کردووە کە یەکێ لە سیفەتە دیارەکانی داپۆشینی ڕۆژنامەوانیی هیندستان بۆ هەواڵەکانی وڵاتانی ڕۆژئاوا ئەوەیە ڕێژەیەکی تا ڕادەیەک کەمی لە لایەن ڕۆژنامەوانی هینیدییەوە داپۆشراون. بەڕێز ڕۆبەرت ترومبول هەواڵنێری نیویۆرک تایمز لە هیندستان، ئەو وێنەیەی وڵاتەکەی شی دەکاتەوە کە ڕۆژنامەوانیی هیندستان پێشکێشی دەکا و دەڵی بەڕای ئەو وێنەی ئەمەریکا لە ڕۆژنامەوانیی هیندستاندا ئەوەندە "سەیرە" بەقەد بۆچوونی ئەمەریکاییەکی

ئاساییە بەرامبەر بەهیندستان. "ئەگەر ڕۆژنامەکان بۆچوونی هاولاتییەکی ئاسایی هیندستانیان بەرامبەر بەئەمەریکا گەلاڵە کردبێ، ئەوە ئەمەریکاییەکان وەک ڕەگەزێکی دۆلار ڕفێن و بەشێوەیەکی سەرسوڕهێن لە ساتەکانی کاردا بەبەرهەم و لە کاتی دەست بەتاڵیشدا خەریکی خوێندەنەوەی کتێبی کۆمیدیا و چوونە یانەی شەوانە و قورسترین وەرزش و سێکسی جێگرەوەن. چالاکیی کولتووری و ئاین و ژیانی خێزان لە ئەمەریکا ئەوەندە جێی بایەخ نین و لە بەرامبەردا ڕەگەزپەرستی و خۆ بەزلزانین و چاوچنۆکی باڵیان بەسەر ئەو وڵاتەدا کێشاوە".

تایا زینکین لە مانچێستەر گاردیان، باسی ئەو وێنەیە دەکا ڕۆژنامەوانیی هیندستان لە بارەی بریتانیاوە کێشاویەتی لە تۆژینەوەکەی IPIدا، خاتوون زینکین دەڵێ "داپۆشینی ئینگلتەرا لە ڕۆژنامەوانیی هیندستاندا بەگشتی لە ئاستێکی زۆر بەرزە. هیندییە ڕۆشنبیرەکان زۆر بەباشی لە ئینگلتەرا تێ دەگەن، بگرە لە زۆر بابەتدا جۆری بیرکردنەوەیان وەک بیرکردنەوەی ئینگلیزە... ئەگەر ڕاپۆرتدانی هیندی لەسەر ئینگلتەرا "لایەندارانە" بێ ئەوە ئاستەمە شێواو بێ". ئەگەر هەندێ جار ڕاپۆرتدان "لایەندار" بێ ئەوە لەبەرئەوەیە کە بۆچوونی هیندی دژ بەبۆچوونی بریتانیایە بەهەمان ئەو شێوەیەی کە بۆچوونی هەندێ بریتانیایی دژی بەهی حکوومەتەکەیانە. زینکین دەڵێ "هەندێ بابەت بەردەوام دادەپۆشرێن و هەندێک هەرگیز داناپۆشرێن. زۆر جەخت لەسەر بابەتگەلی پێوەست بەکۆلۆنیالیزم و نیوچە کۆلۆنیازمەوە دەکرێ، تەنانەت شەڕی سارد بەقەد کێشەی کۆمپانیای نەوتی ئەنگلۆ ئێرانی یاخۆ کێشەی کەناڵی سوێس و ماو ماو و یەکیەتی ئەفریقای ناوەڕاست گرینگیی پێ نادرێ. ئەو گرینگییەی بەبریتانیا دەدرێ لەوەوە سەرچاوە ناگرێ کە ئەورووپایە یاخۆ لە پەیمانی ئەتلانتییە بگرە لەوێوەیە کە هێزێکی ئیمپریالیستە و زۆربەی کات پێگەی بریتانیا لە کۆمنوێلس دەخەملێنرێ زیاد لەوەی ڕاپۆرتی لەسەر بدرێ".

## کێبەرکێی نابرووبەرە

ڕکابەران لە بازرگانیدا باش لە یەکتر دەکۆڵنەوە و هیچ هەلێک نافەوتێنن بۆ پەردە لادان لە ڕووی یەکتر لە پێناو بەدەستهێنانی خاڵێک لە کاتی پێویستدا.

ئاژانسـەکانی دەنگوباسـیش لەم دیاردەیە بەدەر نین. بەردەوام ئاژانسـەکان یەکتری بەلایەنداری و پشتبەستن بەحکوومەت تاوانبار دەکەن.

بۆ نموونە یونایتـد پرێس، لە سـەرەتاکـانیـدا ڕووبەڕووی کـارتلێکی ئاژانسگەلی فەرمی و نیـوەفـەرمـیی حکوومـەتەکانی ئەوروپا بووەوە. ئەو "ئاژانسـە هاوپەیمانانە" لەگەڵ ئەسۆشیێتد پرێس پاوانکارانە ئاڵوگۆڕی هەواڵیان دەکرد، سەرباری ئـەمەش بۆ هـەر یـەکێکیـان چـەند ناوچەیەکی جیـهـانیـان دیاری کـردبوو تیـایدا ئـەو مـافی بڵاوکـردنەوەی هـەواڵی پاوان کـردبوو. بۆ نموونـە، تەنیـا ئـاژانسی هاڤـاسی فـرانسـە بـۆی هـەبـوو هـەواڵ لـە ئـەمــەریکای بـاشـــووردا بفــرۆشـێ و لە ڕۆژهـەڵاتی دووریش ڕۆژنامــەکـانی ژاپۆنی و چینی دەبـوایە بۆ هـەواڵـەکـانی دەرەوەیان پشت بەئـاژانسی ڕۆیتەرزی بریتانیا ببەستن.

ئەمە کێبەرکێ بوو لەگەڵ هاوپـەیمانییەکی پاوانخوازدا، بەڵام یونایتد پرێس توانیی دوو پرنسیپی نوێ بـخاتە سـەر پرنسـیپـەکانـی کاری ئاژانسی دەنگوبـاس. یەکێکیـان ئەوە بوو کـە دەبێ ئاژانسی دەنگوباس هـەواڵەکانی جیـهان سـەربەخۆیانە داپۆشێ. دووەمـیشـیان ئەوە بوو کە ڕۆژنـامـەکان لە هـەر شـوێنێکی جیـهاندا بـۆیان هـەیە ئـەو خزمەتگوزارییـە بکرن. لە ئاکامدا، یونایتد پرێس بووە یەکەمین ئاژانسی دەنگوباسی ئەمــەریکای باکـور خـزمـەتگوزارییـەکـانی بگـەنە ئەوروپا و ئـەمـەریکای بـاشـوور و ڕۆژهەڵاتی دوور. لـە هـەمـان کـاتدا یـونایتـد پرێس نووسـینگـەی خـۆی لەو نـاوچانەدا کردەوە و هـەواڵنێرەکانیشـی ڕێنوێنی کران بۆ ئەوەی هـەواڵ بەشێوەیەکی بابەتییانە و بەبێ لایەندارییی حکوومەتی یا سیاسی بنووسن و بنێرن.

لە ١٩٠٥دا ڕۆیتـەرز و هـاڤـاس "چەندین جـار بەڕێزەوە، بەڵام بەزەقی" بەهاوشـێوە ڕووسـیـاییـیـەکـەی خـۆیان ئـاژانسی تێلیگرافی سـانت پیـتـەرسـبـێرگ (SPTA یاخـۆ ڤیـستنیک)یان گوت چۆن "هـەواڵەکانی چڕ بکاتەوە و بۆ کڕیارە تایبەتەکانی بریتـانیا و فـرانسـە و ئیـمـپریالەکـانی بنووسێ: هـەواڵەکـانی ڤیـستـنیـک ویسـتـراو بوون لـەبەر چـەند هـۆیـەک وەک خـــێـــرایی و وردی و بـەهاکـــانـی هـەواڵیـــان و شـــێـــوەی پێشکێشکردنیان".

کێنت کووپەر لە ١٩٤٢ لە باریەرز داون، نووسیویەتی:

"لەو کـاتەدا کـە ئاژانسـە ئەوروپاییـیـەکـان لە هەوڵی بەدیـهـێنانـی وردی بوون لە کارەکەیاندا، بووبوونە ئامـانجی کاریگەریی دەرەکی لە بواری لایەنداریدا. هەروەها کـۆمـەڵەی ڕۆژنامـەوانی نەبوون وەک ئەسـۆشـیـێـتـد پرێس کـە تەنیـا خـزمـەتی ڕۆژنامـەکانی دەکرد. ئەوان بەرژەوەندیی بازرگانییـان هەبوو وەک بانکداری و هەواڵ بەشێوەیەک لە شێوەکان بەپلەی دووەم دەهات. هـەندێکیـان کە بەقـەبارە بچووکتر بوون هەر گـوێیـان بەهەواڵ نەدەدا مـەگـەر ئەو هەواڵانە نەبن "بەخێـر" حکوومـەت و ئاژانسـە سـەرەکـییـەکـان پێیـان دەبەخشین. زۆر لـەو ئاژانسـانە کـە خـاوەندارییـان بەکۆمەڵن لە ژێر کۆنترۆڵی حکوومەت بوون و بۆ بڵاوکردنەوەی پرۆپاگاندا لە ناوەوە و دەرەوە بەکـار دەهێنران. هەندێک ئەم شـێـوازەیان لە کـۆکـردنەوە و بڵاوکـردنەوەی هەواڵی ئاسایی قازانجدارتر دەبینی."

لە ژینامـەی خـۆیدا، کێنت کووپەر نووسـیویەتی "ڕۆیتـەرز ئەو ئامـرازە بوو، کە لە ڕێی راپۆرتەکانیەوە ئەو وڵاتانەی پێوەستی بریتانیا بوون، پێوەستییەکەیان بەردەوام دەبوو. بەهەمـان مەبەسـتیش هەمـوو ئەندامـانی تری کـارتلەکەی دوورخـسـتـەوە لە ناردنـی هەواڵ بـۆ وڵاتە قـــەرەباڵغـەکـــانـی ڕۆئاوای ئـۆقـیـــانووسـی ئارام، بـەچین و ژاپۆنیـشـەوە. باڵادەسـتـیـی ئینگـتـەرا لە بازرگـانـی و دەسـەڵاتی بەسـەر ئـەو ناوچە زۆرانەدا لە لایەن ئەو هەواڵانەوە پشتگیری دەکران کە لای بریتـانیـایان دەگرت و لە ڕێی ڕۆیتـەرزەوە دەگـەیەنرانە خـەڵکی ئەو نـاوچانە. ئەوەی ڕۆیتـەر لەو بـوارەدا بۆ بریتـانیـای کـرد زیاتر بوو لەوەی هێـزە دەریاییـیـە مـەزنـەکەی ئینگلتـەرا کـردی، کە دەسـەڵاتی بەسـەر هـەمـوو دەریاکـاندا هـەبوو و لە دواییـدا بووە پێشـەنگ لە بازرگانیی جیهاندا".

سـاڵی ١٩٧٦، میـشـێل نیلسـن بەڵاڤـۆکـێکی نێوخـۆییی بۆ بـەڕێوەبەری گـشـتـیی ڕۆیتەرز، جیراڵد لۆنگ لەبارەی ئەو داهاتانەی لە حکوومەتەکانی وڵاتانی نیشتمانەوە دەهاتن ئامـادە کرد. لەو بەڵاڤۆکەدا دەڵێ ئەسۆشیێتد پرێس ٢،٢٪ و یونایتد پرێس ١،٦٪ی قـازانجـەکەیـان لە حکوومـەتی ئەمـەریکا وەردەگرن لە کاتێکدا ئەو ڕێژەیە بۆ ڕۆیتەرز ٢٪ە.

## سیستم

هەندێ جار لایەنداری بەهۆی کێشە و بۆچوونەکانی نێو سیستمەکە خۆیەوە دێ، هەر وەک چۆن ج هێربەرت ئالچوڵ لە پێشەکیی کتێبەکەیدا "ئامرازەکانی دەسەڵات" (١٩٨٤) دەڵێ:

"ساڵی ١٩٥٧ بوو و من بەرپرسی هەواڵنێرانی ئەسۆشیێتد پرێس بووم لە بۆنی پایەتەختی ئەڵمانیای ڕۆئاوا. تازە یەکیەتی دیموکراتی کریستیان CDUی کۆنراد ئادناوەر گەڕابووەوە سەر دەسەڵات لە هەڵبژاردنێکدا، کە یەکەمین جار (تەنیا جاریش) بوو لە مێژووی ئەڵمانیا تەنیا حیزبێکی سیاسی بتوانێ زۆرینەی ڕەهای پەرلەمان، بوندستاگ، بەدەست بێنێ.

بەهەر حاڵ پێم وترا (لە لایەن بەشی نیویۆرکەوە) وای پێشان بدەم سەرکەوتنی ئادناوەر "تێکشکانە" بۆ کۆمۆنیستەکان کە لە دژی CDU هەڵمەتێکیان بۆ پشتگیریی حیزبی سۆسیال دیموکرات SPD ساز کردبوو. منیش لە وەڵامدا وتم "نە. ئەو هەڵسەنگاندنە هەڵەیە لەبەرئەوەی یەکیەتی سۆڤێت دەیویست ئادناوەر بیباتەوە چونکە: ڕووسەکان زیاتر هەستیان بەئارامی دەکرد کاتێ مامەڵەتیان لەگەڵ پارێزکارێکی ڕاستگۆدا دەکرد کە دەیانتوانی وەک ئیمپریالیستێکی شەڕخواز هێرشی بکەنە سەر. مامەڵەتکردن لەگەڵ SPD بەتایبەتی لەو ماوەیەدا، مایەی سەختەتی دەبوو بۆ یەکیەتی سۆڤێت، لەبەرئەوەی هەردوو حیزبی کۆمۆنیستی یەکیەتی سۆڤێت و SPD لە ئەڵمانیای ڕۆئاوا خۆیان بەشوێنکەوتەی مارکس دەزانی و هەر جیاوازییەک لە نێوانیاندا، سەخت (ناجۆریش) بوو پاساوی بۆ بدۆزرێتەوە. ئەو هەڵمەتەش کە دژی ئادناوەر کرابوو، مەبەستەکەی ئەوە نەبوو ئەو بدۆڕێنێ، بگرە بۆ ئەوە بوو خەڵکی دژ بەکۆمۆنیزمی ئەڵمان هەموویان دەنگ بەو بدەن".

لەوێدا گفتوگۆکە کۆتایی پێ هات. بەڵام لەبەرئەوەی دەسەڵات لە لای ئەوسەری تەلەکەوە بوو، فەرمانم پێ درا ڕێنوێنییەکان جێبەجێ بکەم و چیرۆکێک بنووسم تیایدا ئەوە پێشان بدەم کە سەرکەوتنی ئادناوەر شکست بوو بۆ کۆمۆنیستەکان. من دوو هەڵبژاردنم لە پێش هەبوون: یان فەرمانەکە جێبەجێ بکەم، یان دەست لەکار کێشانەوەی خۆم پێشکێش بکەم. بێگومان ژنەکەم و منداڵەکانم هیچ جۆرە

پاڵەوانییەکی کارەساتبارییان لێم ناوێ، بۆیە شانازیی خۆم و ڕەخنەکانم قووت دایەوە و ئەوەم نووسی کە لێم داوا کرابوو. تەنیا شتێک کە بۆ من مایەوە و دڵمی دەدایەوە ئەوە بوو بابەتەکە بەبێ ناوی من بڵاوبێتەوە. بۆیە بەکەمێ ئازایییەوە وتم "با ناوی منی لەسەر نەبێ".

ئەم چیرۆکە سروشتی هەواڵ لە ژینگەی نێودەوڵەتیدا پێشان دەدا. بەبێ دوودڵی بەشێوەی "ئێمە" لە بەرامبەری "ئەوان" و "کوڕە باشەکان" بەرامبەر بە"پیاوخراپان" دەنووسرێنەوە. کرۆکی هەواڵ ململانێیە و سەختە ڕۆژنامەوانێک بەتەنیا ڕەنگی شوێنەکانی سێبەر ئاشکرا بکا، یاخۆ تەنانەت ئەو خاڵانە پێشان بدا کە "ئێمە" و "ئەوان" هەمان ئامانج و بەهامان دەبن. ئەو دروشمەی دەڵێ هەواڵ خاوەن کەسایەتییەکی سەربەخۆیە یان چیرۆکەکان خۆیان دەگێڕنەوە هەڵەیە، هەر وەک چۆن ڕاست نییە وای تێ بگەین هەواڵنێر و نووسیار دەتوانن خۆیان بەدوور بگرن لەو سیستەمە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتوورییەی کەسایەتیی ئەوانی داڕشتووە. ململانێی نێوان "ئێمە" و "ئەوان" خۆی خزاندووەتە ناو سیستەمی بڕوای ڕۆژنامەوانی هەر وەک چۆن خزاوەتە ناو هزری هاوڵاتییانیان. ئەم ململانێیە بەشێکە لە ئایدیۆلۆجیای ئەوان. بڕواهێنان بەوەی ڕۆژنامەوانان بەجیا پەروەردە کراون و دەتوانن تەواو بابەتی بن لە بارەی جیهانی دەوروبەریان و خەڵکی تر لەم توانایە بێبەشن، بڕواهێنانە بەقسەیەکی قۆڕ لە ڕووی لۆجیکەوە.

مۆرت رۆزنبلەم ڕاشکاوانە لە کتێبەکەیدا باسی شێوەی کاری ئەسۆشیێتد پرێس دەکا، کتێبەکەی کە بەناونیشانی "کوودەتا و بوومەلەرزەکان، ڕاپۆرتدان بۆ ئەمەریکا" بوو لەو کاتەدا بڵاوکرایەوە کە خۆی لە ئینتەرناشناڵ هیراڵد تریبیۆن نووسیار بوو. ئەو باسی جیاوازیی نێوان مامەڵەتکردن لە بوومەلەرزەیەک لە ئیتاڵیا و یەکێکی تر لە گواتیمالا بەم شێوەیە دەکا:

"بەڵام ئەگەر هەزاران کەس لە گواتیمالا بمرن، ڕاپۆرتدانەکە جیاواز دەبێ. ژمارەی قوربانییان ژمارەی ورد نابن بگرە تەماوی دەبن. زیاتر جەخت لەسەر هاوکارییەکانی ئەمەریکا بۆ قوربانییان دەکرێتەوە نەک لەسەر قوربانییەکان خۆیان. چیرۆکەکەش بەگشتی بایەخی زۆری پێ نادرێ. هۆی ئەم دوو پێوانەییە بەشێکی بۆ ئەوە

دەگەڕێتەوە کە داپۆشینی ئیتاڵیا ئاسانترە لە داپۆشینی گواتیمالا و لەوێ هاواڵنێری زیاتر بەئاسانی دەست دەکەون. بەڵام هۆکاری سەرەکی ئەوەیە کە ئیتاڵیاییەکان وەک تاک لە ڕووی شێوە و کولتووریشەوە لای ئەمەریکاییەکان ئاشناترن. بەڵام لە بەرامبەردا گواتیمالاییەکان تەنیا خەڵکێکی بێ ڕەگوڕووی نیشتەجێی جیهانی ژێر ئاستی پێشکەوتن. پێوانەکە بەشێکە لە توانایەکی لووسی نەنووسراو بەڵام بەباشی برەوسەندوو: هەڵدێرانی سەد پاکستانی لە شاخێک بەپسەکەیانەوە ئەوەندەی خنکانی سێ ئینگلیز لە تایمزدا کاریگەر نییە."

لە ژمارەی نیسانی ١٩٩٠ی کۆواری ناوخۆیی تایبەتی رۆیتەرزدا، هایلایتس، گای دینمۆر نووسیویەتی: "دەبێ ڕاست بێ ئێمە ئاژانسێکی زانیاریی جیهانی بین وەک چۆن بەسنگ دەرپەڕاندنەوە پێمان خۆشە بانگەشەی بۆ بکەین؟ یان لایەنی کەم لە داپۆشینی هەواڵدا رۆیتەرز تا ئێستا دامەزراوەیەکە بنکەی لە ڕۆئاوایە و دیدی ڕۆئاوایی هەیە؟ ئێمە بۆچوونەکانی کێ دەردەبڕین؟ کاتێ تەماشای ئاشکراکردنی هەواڵەکانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات دەکەم، هەندێ جار وا دەزانم شانازیکردنمان بەهەواڵدانمان سنووری تەماویبوونی تێ پەڕاندووە و چووەتە قۆناخی پیا هەڵدانەوە". دوای ئەمە دینمۆر چووە سەر باسی داپۆشینی ناوچەکەی خۆی، چین و وتی "کۆتاییی حەفت حەفتە لە پێشاندانی هێزی گەل لە بەکین تاقیکردنەوەیەکی سادە بوو". ئەو پێی وایە لایەنداری بۆ ڕۆئاوا گەشبینییەکی زۆری بەئاکامەکان هێنایە کایەوە، "ئەو سەرچاوانەی زۆربەی کات ئێمە قسەمان لێ وەردەگرتن ـ دیپلۆمات و شتی تر- بەقەد ئێمە لە لایەن بۆچوونە هیواخوازەکانیانەوە خەڵەتێنران. ئەو شیکردنەوانەی ئەو کات دەمانووسین و دەمانگوت ئەمە دەبێ کۆتاییی سەردەمی دینگ شیاوپینگ بێ، بەلایەنی کەمەوە پێشوەخت بوون. هیوا دەخوازم بتوانم بگەڕێمە دواوە و کەمێکی تر بخەمە سەر ئەو نووسینانە، بەڵام بەئاڕاستەی پێچەوانە...".

کێشەیەکی تری سیستەم پشتبەستنی زۆرە بەهاوکاران یاخۆ هەواڵنێری پارت-تایم لە لایەن ئاژانسەکانی دەنگوباسەوە. هەندێ جار ئەو هاوکارانە شتەکان زیاد گەورە دەکەنەوە یان دروستیان دەکەن بۆ ئەوەی هەلی بەکارهێنانی کۆپییەکەی ئەوان لە لایەن ئاژانسەوە زیاتر بێ. لە لایەکی تریشەوە ڕەنگە کۆپیی هاوکارەکە

ئەوەندە سنووردار بێ کە پێویستی بەپشتڕاستکردنەوەی بەشەکە بێ کە هەزاران میل لەوەوە دوورە و لە لایەن کەسانێکەوە کە ڕەنگە باکگراوندی پێویستیان نەبێ، بەمەش ئەگەری هەڵە زیاد دەبێ. جارێکیان لە ئێوارەی سەری ساڵدا هەواڵی ڕووداوی شەمەندەفەر هەبوو لە ئاسام، ڕۆیتەرز وتی ڕووداوەکە بەهۆی بارکردنی خەڵکێکی زۆرەوە بوو کە دەچوونە نیو دێلهی بۆ ئاهەنگگێڕان بەساڵی نوێوە. کە ڕاستییەکەی ئەوەیە، خەڵی ئاسام و هەرێمەکانی تری باکوری ڕۆژهەڵات کە لە دێلهی کار دەکەن بۆ ئاهەنگی جەژنی لەدایکبوون و سەری ساڵ دەچنەوە ماڵی خۆیان. هاوکارانی زۆر و کێبەرکێیان بووە هۆی گەورەکردنەوەی ژمارەی مردووەکان لەم ڕووداوەدا.

هەندێ نموونەی ڕاستەقینە:

ئاستەمە لە گرینگی و واقیعی لایەنداری و شێواندنی جۆراوجۆر بگەی بێ ئەوەی تەماشای چەند نموونەیەکی ڕاستەقینە بکەی:

ڕفاندنی گەشتیاران

هەلی ئەوەم هەبوو خوێندنەوەیەک بۆ چونیەتیی داپۆشینی چیرۆکی ڕفاندنی گەشتیارانی بیانی لە جاموو و کشمیر لە لایەن ڕۆیتەرز و ئەسۆشیێتد پرێسەوە بۆ میدیای دەرەوەی هیندستان بکەم. توانیم لە ڕێی کۆمپیوتەری BBC لە لەندەن، کە ژمارەیەکی زۆر لە کۆپیی ئاژانسەکانی دەنگوباسی بۆ دێ و دەتوانرێ لە نووسینگەی نیو دێلهی ئەو کۆپییانە ببینرێن، کۆپیی هەر یەک لە ڕۆیتەرز و ئەسۆشیێتد پرێس وەک چۆن نێردراوە بۆ میدیاکان لە لەندەن لە ڕۆژی ڕفاندنەکە ٦ی تەمووزی ١٩٥ پەیدا بکەم. ڕۆیتەرز و AP هەردووکیان هەواڵەکەیان بەناوی ئەو هاوکارە هیندییانەوە بڵاو کردووەتەوە کە زانیارییە سەرەتاییەکانیان پێ داون. بەکارهێنانی ئەو ناوانە ڕاستوێژی بەچیرۆکەکە دەبەخشێ و بەرپرسیاریی هەر هەڵەیەکیش دەخاتە ئەستۆی هاوکارەکەوە. ئەمە کۆپییەکەی AP یە:

٠٠٣٧٠.

AP هیندستان _ کشمیر _ ڕفاندن

هیندستان ـ کشمیر ـ ڕفاندن

سەربازەکان بەدوای گەشتیارە بریتانیایی و ئەمەریکاییە ڕفێنراوەکاندا دەگەڕێن کشمیر

قەیسەر میرزا

نووسەری ئەسۆشیێتد پرێس

سریناگار، هیندستان (AP)- ڕۆژی پێنجشەممە، بەسەدان سەرباز بەسەر ناوچەیەکی شاخاویی کشمیردا بڵاو بوونەوە بۆ گەڕان بەدوای دوو ئەمەریکایی و دوو بریتانیاییدا کە چەکدارانی جوداخواز بەبارمتەیان گرتوون.

پۆلیس گوتی گرووپێکی کەم ناسراوی یاخیبووانی موسڵمان، ئەلفاران، گوتی بۆیە ئەو گەشتیارانەی دوو ڕۆژ بەر لە ئێستا ڕفاندووە تا حکوومەتی هیندستان ناچار بکا شەش لە سەرکردەکانی گەریلا لە زیندان ئازاد بکا.

بەقسەی پۆلیس، ژمارەیەکی تری زۆر لە بیانییان کە لەگەڵ ئەو گەشتیارانە پیاسەیان دەکرد، شەوی چوارشەمە لە لایەن چەکدارەکانەوە ئازاد کران و درانە دەستی چاودێرانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە سریناگاری پایەتەختی هاوینەی هەرێمەکە.

ڕاپۆرتەکانی هەواڵ دەڵێن ئەو گیراوە ئازادکراوانە لەوانەیە ژن و منداڵ و پیرەمێردێک بن، بەڵام ئەم قسەیە پشتڕاست نەکرایەوە.

پۆلیس خەریکی لێپرسینەوە بوون لەگەڵ دوو ڕێشاندەری کشمیری کە لەگەڵ ئەو گەشتیارانە بوون و شەوی چوارشەممە ئەوان بوون پۆلیسیان لە ڕفاندنەکە ئاگەدار کردەوە.

ئەمە سێیەمین جار بوو، لە حوزەیرانی ١٩٩٤ەوە، لە لایەن چەکدارانی کشمیرییەوە گەشتیاری ڕۆئاوایی لە هیندستان بڕفێنرێن. لە کۆتاییی هەر جارێکیش هەموویان بەبێ ئەوەی ئازار بدرێن ئازاد کراون، هەرچەندە لە جارێکیاندا تەقە کرا و لە یەکێکی تریش سەوداکەرێک کوژرا.

یاخیبووان لە ١٩٨٩وە شەڕ بۆ سەربەخۆیی کشمیر دەکەن. لەو شەڕەی لە جاموو

کشمیر، کە تەنیا هەرێمێکە زۆرینەی موسڵمان بن لە هیندستانێک کە زۆرینەی هیندۆسن، سەری هەڵداوە، زیاتر لە ١١٦٠٠ کەس کوژراون.

دوو ڕێشاندەرە کشمیرییەکە وتیان گەشتیارەکان ئێوارەی سێشەممە لە گوندی ئارووی نزیک شارۆکەی گەشتیاریی پێهالگام، کە ٦٥ کیلۆمەتر (٤٠ میل) لە باشووری سریناگارەوەیە، گیران.

پۆلیس وتی دوو بارمتە ئەمەریکاییەکە جۆن دۆناڵد و دۆناڵد فرێیدن و دووانە بریتانیاییەکەش پاوڵ وێل و کێلی مێگانن، بەڵام هێشتا ئاشکرا نەکراوە خەڵکی کام شارانەن.

لە حوزەیرانی ١٩٩٤ دوو گەشتیاری بریتانیایی لە نزیک هەمان شوێن لە جامو و کشمیر ڕفێنران و دوای ١٧ ڕۆژ لە ڕفاندنیان لە لایەن حەرەکەت ئەلئەنسارەوە، کە گووپێکی گەریللای گومناوە و دەیەوێ هەرێمەکە ببێتە بەشێک لە پاکستانی ئیسلامیی دراوسێ، بەبێ ئەوەی ئازاریان پێ بگا ئازاد کران.

لە تشرینی یەکەمی ١٩٩٤یش چەکدارانی کشمیر سێ گەشتیاری بریتانیایی و یەکێکی ئەمەریکاییان لە نیو دێلهی ڕفاند و دە ڕۆژ لای خۆیان گلیان دانەوە. ئەمانە دوای شەڕە تەقەیەک لە بەرەبەیاندا لەگەڵ پۆلیسی هیندستان، کە کوژرانی دوو پۆلیس و ڕفێنەرێکی لێ کەوتەوە، ئازاد کران.

ئەمەشیان کۆپییەکەی رۆیتەرزە لە بارەی هەمان چیرۆکەوە و لە هەمان ڕۆژدا:

RWS DEL 000243 ٥٢٠

کشمیر- گەشتیار (PVS لەندەن)

چەکدارانی کشمیر گەشتیارانی بریتانیایی و ئەمەریکایی دەڕفێنن

لە ئاشۆک پاهالوان

جامو، هیندستان، ٦ی تەممووز (رۆیتەرز)- بەرپرسان لە ڕۆژی پێنجشەمەدا ڕایان گەیاند کە گرووپێکی چەکداری پێشتر نەناسراو، لە هەرێمی جامو کشمیری کێشەداری باکوری هیندستاندا چوار گەشتیاری بیانیی ڕفاند، دووانیان بریتانیایین و دووان ئەمەریکایی.

بەرپرسانی فەرمانگەی گەشتیاریی هەرێمەکە بەرۆیتەرزیان ڕاگەیاند کە گرووپی ئەفاران حەفت گەشتیار و دوو ڕێشاندەرەکانیان ڕفاندن، لەو کاتەدا خەریکی گەڕان بوون لە نزیک پاهالگام، نزیکەی ٩٠ کیلۆمەتر (٦٠ میل) لە ڕۆژهەڵاتی سریناگاری پایەتەختی هاوینەی هەرێمەکەوەیە.

گرووپەکە داوای ئازادکردنی ئەو سەرکردە چەکدارانە دەکا کە لە ماوەی پێنج ساڵی شۆڕشی تەنیا هەرێمی زۆرینە موسڵمانی هیندستانی زۆرینە هیندۆس گیراون، پۆلیس و نەخۆشخانەکان دەڵێن زیاتر لە بیست هەزار کەس لەو ماوەیەدا کوژراون.

دواتر گرووپەکە سێ گەشتیار، دوو ژن و پیاوێکی پیر و دوو ڕێشاندەرەکەیان ئازاد کرد و تەنیا چوار کەسیان لای خۆیان هێشتەوە کە ئەمانەن: پاوڵ وێڵز و کاتی مانجین کە خەڵکی بریتانیان و جۆن دۆرێل و دۆن فروود هاچینگ کە ئەمەریکاین.

لە لەندەن خزمانی وێڵزی تەمەن ٢٣ ساڵ کە قوتابیی فۆتۆگرافە، وتیان ئەو لە بۆ گەشتێکی شەش حەفتەیی چووبووە هیندستان.

پێشتریش قسەکەرێک بەناوی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی بریتانیا لە لەندەن وتی "ئەوان بەپیادەیی لە گردەکانی کشمیر لە بەشی هیندستانی کشمیر بوون کاتێ چەکداران دایان بەسەریاندا و چواریان لێ دەستگیر کردن.

بەرپرسانی هیندستان دەڵێن گەشتیارەکان ئەو کاتەی ڕفێنران لە پاهالگامەوە بەرەو بالتال دەچوون، لە گردەکانی خوار لووتکەی زۆجیلاوە، کە دەروازەی ناوچەی لاداکی بوودایییە.

پرێس ترەستی هیندستان PTI وتی ئەو گرووپە چەکدارە داوای ئازادکردنی سەرکردەکانی چەکدارانە، وەک ماستەر ئیحسان داری سەرکردەکەی گرووپی موجاهیدینی موسڵمان دەکات، کە ئێستا لە زیندانەکانی حکوومەتدان.

هەروەها داوای کێشانەوەی هەموو ئەو تۆمەتانە دەکات ئاراستەی جاڤید ئەحمەد میر کراون کە یەکێکە لەو سەرکردە چەکدارانەی بەرەی ئازادیی جاموو کشمیر JKLF کە بەمەرج لە لایەن حکوومەتەوە و وەک بەشێک لە پلانی زیندووکردنەوەی پرۆسەی سیاسی ئازاد کراون، ئەمە قسەی پرێس ترەستی هیندستانە.

هیندستـان دەڵێ نیازی هـەیە لە کۆتاییی ئەم ساڵەدا هەڵبژاردن بکا بۆ هەڵبژاردنی ئەنجـوومـەنێکی نـوێ بۆ هـەرێمی جـامـوو کـشـمـیـر بۆ ئەوەی جـێی ئەو ئەنجـوومـەنە بگرێتـەوە کـە دوای مـاوەیەکی کـورت لە دەست پێکردنی یاخـیـبـوون لە کـشـمـیـر لە کـانوونی دووەمی ١٩٩٠ هـەڵوەشـایەوە و هـەرێمەکە خرایە ژێر حـوکمی ڕاسـتەوخـۆی دێلهییەوە.

دوو سـێـیـەکی کـشـمـیـر لە ژێر حـوکـمـڕانیی هیندسـتـانە و ئەوەی تـری لە ژێر دەسـەڵاتی پـاکـسـتـانـە و ئەم دوو وڵاتە لەو کاتەوە سـەربەخـۆییی خـۆیان لە بریتـانیـا وەرگرتووەتەوە سێ شەڕیان کردووە دووانیان لەسـەر ئەم هەرێمە بووە.

هـەندێ لەو گـرووپە زۆر چەکدارانەی دژ بەحـوکـمـڕانیی هیندسـتـان لەو ناوچەیەی هیمـالایادا دەجەنگن بەرپرس و بازرگانانی هیندییان ڕفـانـدووە و زۆر لەو ڕفێنراوانە کوژراون.

تا ئێسـتـا سێ جـار خـەڵکی بیانی بەبـارمـتـە گـیـراون و لـە هـەوڵێکی ناسـەرکـەوتوو گرتنی بارمتەشدا گەشتیارێکی ئیسرائیلی کوژرا.

ساڵێکیش بەر لە ئێسـتـا گروپی چەکداری حەرەکەت ئەلئەنسـار کوڕە ١٦ ساڵەکەی ڕۆژنامەوان و بـازرگانی بریتـانیایی دێڤد هـاوسیگۆ و برادەرێکیـان لە نزیک پاهالگام لە کاتی پیاسەکردندا ڕفاند.

کیم هـاوسیگۆ و دێڤد ماکیی دوای ئەوەی چەندین گرووپی کشـمیری ڕفاندنەکەیان سەرکۆنە کرد و داوایان لە حەرەکەت ئەلئەنسار کرد زوو ئازادیان بکا، ئازاد کران.

لەم دوو ڕاپۆرتەدا ڕفێنەران و سـەرکردە زیندانکراوەکانیان بەیاخی وەسف کـراون و وەک چەکـدار نەک تیـرۆریست باسـیـان دەکـرێ. کـە ئەم وشـەیە هـەڵگیـرا بۆ وەسـفکردنی ئەوانەی سـەنتـەر بازرگانیی جیـهـانیان تەقاندەوە یاخـۆ بۆ تاوانبـارانی ١١ی سـێـپـتـەمـبـەر. وەک باکگراوند AP دەڵێ "یاخـیـبـووان لە ١٩٨٩وە شـەڕ بۆ سـەربەخـۆییی کشمیر دەکەن. لەو شەڕەی لە جامـوو کشـمیر، کـە تەنیـا هـەرێمێکە زۆرینەی موسـڵمان بن لە هیندستانێک کە زۆرینەی هیندۆسن، سەری هەڵداوە زیاتر لە ١١٦٠٠ کـەس کـوژراون"، هـەمـان بـاکگراوند لای ڕۆیتـەرز و لـە هـەمـان ڕۆژیشـدا ئەمـەیە "گـرووپەکـە داوای ئازادکـردنی ئەو سـەرکـردە چەکدارانە دەکا کـە لە مـاوەی

پێنج ساڵی شۆڕشی تەنیا هەرێمی زۆرینە موسڵمانی هیندستانی زۆرینە هیندۆس گیراون، پۆلیس و نەخۆشخانەکان دەڵێن زیاتر لە بیست هەزار کەس لەو ماوەیەدا کوژراون".

ژمارەکان زۆر جیاوازن لە یەک و راپۆرتەکان بۆچوونێکی هەڵە دەگەیەنن و وای پێشان دەدەن هێزەکانی حکوومەتی هیندستان ئەوانی کوشتبێ، کەچی ڕاستییەکە ئەوەیە کە زۆربەی ئەوانە لە کشمیردا بەدەستی لایەنەکەی ترەوە کوژراون. هەردوو راپۆرتەکە دەڵێن کشمیر تەنیا هەرێمە زۆرینەی موسڵمانە لە هیندستاندا کە زۆرینەی هیندۆسن، ئەوەشیان لەبیر کردووە کە هەرێمەکە ناوی جاموو کشمیرە و لە سێ ناوچە پێک هاتووە: جاموو کە زۆرینەی هیندۆسن و لاداک زۆرینەی بوودایییە و دۆڵی کشمیر کە زۆرینەی موسڵمانە. هەروەها ئەوەشیان لەبیر کردووە کە ژمارەی موسڵمانان لە هیندستان، ئیندۆنیسیای لێ بترازێ، لە هەموو وڵاتانی جیهان زۆرترە.

قسە لە پۆلیس و نەخۆشخانەکان و لە PTIش گواستراوەتەوە بۆ بەخشینی ڕاستوێژی، بەڵام هەر ڕۆژنامەوانێکی ئاگەدار زۆر زوو و بەئاسانی دەتوانێ هەست بە درۆ و دەستکارییەکان بکا. چونکە هیچ کاتێک پۆلیس و نەخۆشخانە ژمارەی هاوبەش نادەن وەک ئەوەی لە راپۆرتەکاندا باس دەکرێ. ئەگەر ڕاست بێ و زانیاریی لەو شێوەیە لەبەر دەستدا هەبن نەدەبوو ژمارەکانی ئاژانسەکان ئەوەندە لەیەکەوە دوور بن. شیکردنەوەی وردی ئەم دوو نموونەیە ئەوە ئاشکرا دەکا چۆن بەکارهێنانی باکگراوند و وشەی بارگاوی، لایەنداری دەخزێننە ناو چیرۆکێکەوە کە لە سەرەتادا زۆر بابەتی و پیشەیییانە دێتە بەر چاوان. لەگەڵ ئەمەشدا ئەو دەزگایانای میدیا کە بەهەزاران میل لە شوێنی ڕووداوەکەوە دوورن دەکەونە دوای قسەی ئەم ئاژانسانەوە و بڕوای تەواو بەو دەستکاری و لایەندارییانەش دێنن. بۆیە کڕیاری ئاسایی میدیا زیانی زیاتری بەردەکەوێ.

### کچەکەی شەڕی ڤێتنام

نموونەیەکی تری سەرنجڕاکێش لەو چیرۆکانەیە لە بارەی خاتوو کیم فوک لە لایەن APوە بڵاو دەکرانەوە و لە سەرتاسەری جیهاندا وەبەر دەهێنرانەوە. ئەم نموونانەی

ئێره ئەوانەن لە لایەن ئاسیا ئەیجەوە بەرهەم هێنراونەتەوە. ئەمەش ئەو چیرۆکەیە AP لە ١٢ی تشرینی دووەمی ١٩٩٦دا لە واشنتۆنی پایەتەختەوە بڵاوی کردەوە:

کچەکەی ناو وێنە بەناوبانگەکەی شەڕی ڤێتنام بانگەواز بۆ ئاشتی دەکا

لە هاری ف رۆزنتال

واشنتۆن، ١٢ی تشرینی دووەم: ئەو کچەی لە یەکێ لە بەناوبانگترین ئەو وێنە فۆتۆگرافانەی لە شەڕی ڤێتنامدا گیران دەرکەوتووە، داوای "ئاشتیی ڕاستەقینە و نەمانی شەڕ و نەمانی دوژمنایەتی" دەکا.

خاتوو فان تای کیم فوک، کە داواکارییەکەی هاوکار بوو ئەوەی ئەمەریکاییەکان دژ بەشەڕ بن، ڕۆژی دووشەممە لە دەرکەوتنێکی کەموێنەدا دەرکەوت و تاجەگوڵینەیەکی لەسەر پەیکەری یادکردنەوەی کۆنە سەربازانی ڤێتنام لە ڕۆژی کۆنە سەربازاندا دانا.

وێنەی خاتوو کیم فوک کاتێ بەڕووتی لەسەر یەکێ لە ڕێگە دەرەکییەکانی ڤێتنام بەترسەوە ڕای دەکرد بووە هۆی ئەوەی وێنەگری ئەسۆشیێتد پرێس، نیک ئوت، خەڵاتی پولیتزەر وەرگرێ. ئەو وێنەگرە ئێستا لە لۆس ئەنجلس بۆ AP کار دەکا.

کیم فوک کو ئێستا تەمەنی ٣٣ ساڵە، بەکۆمەڵێ کۆنە سەرباز و خێزانەکانیان دەڵێ "من زۆرم ئازار دی لە ڕووی جەستەیی و دەروونییەوە. هەندێ جار وا بیرم دەکردەوە کە ناتوانم بژیم، بەڵام خوا ژیانی منی پاراست و بڕوا و هیوای پێم بەخشی". ئەو ڕۆژە، ٨ی حوزەیرانی ١٩٧٢، کیم فوک و خێزانەکەی پەنایان بردبووە بەر پەرستگەیەکی بوودایی کاتێ گوندی ترانگ بانگ کەوتە بەر هێرشێکی بەهێز بەناپاڵم لە لایەن ڤێتنامییەکانی باشوورەوە. گوندەکە کە دەکەوێتە پارێزگای تای نین ٤٠ کیلۆمەتر لە ڕۆژئاوای سایگۆنەوە، بەبارەگای سەرەکیی ڤێت کۆنگ دەژمێردرا.

پەرستگەکە زەبرێکی ڕاستەوخۆی بەرکەوت و دوو برای کیم فوک یەکسەر گیانیان سپارد و نەوتەکەش جلەکانی ئەمی بەبەریەوە سووتاند و ئەم و براکەی، فان تی نگۆک، بەدەم قیژە و هاواری ئازار و ترسەوە ڕایان کردە دەرەوە. براکەی لە لای چەپی پێشەوەی وێنەکەوە دیارە.

کیم فوک وتی: "ئەگەر بمتوانیایە ڕووبەڕوو لەگەڵ ئەو باڵەفڕەوانە قسە بکەم کە بۆمبەکەی هاویشت، پێم دەگوت ئێمە ناتوانین مێژوو بگۆڕین بەڵام دەبێ هەوڵ بدەین هەندێ شت بۆ ئەمڕۆ و بۆ دواڕۆژ بکەین کە ئاشتی بەهێز بکەن".

خاتوو جان سکروگس، دامەزرێنی ئەو پەیکەری بیرەوەرییە، لە کاتی ناساندنی خاتوونە گەنجەکەی ئێستا شووی کردووە و منداڵێکی هەیە و لە تۆرۆنتۆ دەژی، دەستی بەگریان کرد.

ئەو باسی ئازارەکانی کیم فوکی کرد و وتی "کاتێک سەرکردەیەکی سەربازیی ئەمەریکایی فەرمانی بەباڵەفڕەکانی باشووری ڤێتنام دا بۆمبارانەکە ئەنجام بدەن. ناپاڵم چەکێکی ترسناکە. پێست دەسووتێنێ و دەگاتە سەر ئێسقان". خاتوو کیم فوک ساڵانێک پێستی بۆ چێنراوەتەوە و ئێستاش هەر بەدەستی ئاسەوارەکانی تری برینەکانیەوە دەناڵێ.

ڤێتنامییەکان لە ساڵی ١٩٨٤دا بانگیان کرد بۆ شاری هۆ شی مین بۆ ئەوەی لە فیلمی پروپاگاندەدا بەکاری بێنن. لە ساڵی ١٩٨٦ دەچێتە کووبا بۆ خوێندنی دەرمانسازی و لەوێ هۆی توان دەناسێ کە دوایی دەبێتە مێردی. هەردووکیان داوەتنامەیەکیان بۆ هات بۆ چوون بۆ ڕووسیا و لەوێ مانگی هەنگوینیان بەسەر ببەن و چوون، لە گەڕانەوەدا بۆ کووبا و کاتی باڵەفڕەکەیان لە کەنەدا نیشتەوە بۆ وەرگرتنی بانزین ئەمان داوای پەنابەرییان لە کەنەدا کرد و سەرکەوتوو بوون.

کیم فوک بەئامادەبووانی وت "من بەهۆی برینەکانمەوە هیوای شووکردنم نەبوو و بڕوام نەبوو منداڵیشم ببێ. بەڵام ئێستا مێردێکی نایابم هەیە و منداڵێکی خۆشەویست و خێزانێکی بەختەوەر، سوپاس بۆ خوا".( AP)

با ئێستاش سەیری چیرۆکێکی تر لەبارەی ئەوەوە بکەین کە AP لە تۆرۆنتۆوە لە ٦ی حوزەیرانی ١٩٩٧ ئامادەی کردووە:

کچە بچووکە ڕووتە ڤێتنامییەکە دەبوورێ و لەبیر دەکا

لە دێڤد کاری

تۆرۆنتۆ، ٦ی حوزەیران: لە جیهاندا وەک کچێکی بچکۆلە ناسراوە بەڕووتی بەدەم قیژە و ترسەوە بەجادەیەکی ڤێتنامدا ڕا دەکا. بەڵام ئێستا زۆر جیاوازە، ئەو

دایکێکی شانازە لەگەڵ کوڕە سێ ساڵانەکەی خەندە دەگۆڕێتەوە.

لە ٨ی حوزەیرانی ١٩٧٢، خاتوو فان تای کیم فوک و خێزانەکەی، لە کاتی بۆمبارانکردنی گوندەکەیان بەناپاڵم لە لایەن باڵەفڕەکانی ڤێتنامی باشوور و بەفەرمانی ئەمەریکا، پەنایان بردبووە ناو پەرستگەیەکی بوودایی. یەکێ لە ناپاڵمەکان بەر پەرستگەکە کەوت و دوو برای خاتوو کیم فوکی کوشت و ئاگریشی لە جلوبەرگی ئەم بەردا. ئەم بەدەم درینی بەرگەکەیەوە بەرەو ڕێگەکە ڕای کرد.

وێنەی کچێکی نۆ ساڵان بەدەم ڕاکردنەوە خەڵاتێکی پولتزەری بۆ نیک ئوت، وێنەگری ئەسۆشیێتد پرێس مسۆگەر کرد و بووە یەکی لەو هۆکارانەی ڕای گشتیی ئەمەریکاییەکانی گۆڕی بۆ ئەوەی دژ بەو شەڕە بوەستنەوە.

هەرچەندە ئەو وێنەیە یەکێکە لەو دیمەنانەی شەڕ کە هەرگیز ناسڕێنەوە، بەڵام کیم فوک کە ئێستا لە تۆرۆنتۆ لەگەڵ مێردەکەی و کوڕەکەیدا دەژین، بڕیاری داوە خەڵک فێری لێبووردن بکا.

ئەو لە دیمانەیەکدا دەڵێ "هەرچەندە من ئازاری جەستەیی و دەروونیم چێشت. من ئێستا دڵشادم لەبەر ئەوە بەبێ ڕق دەژیم".

ژیانی کیم فوک لەوەتی ئەو هێرشە کراوەتە سەر گوندەکەیان، ترانگ بانگ، چەندین وەرچەرخانی بەخۆوە دیوە. لە ساڵی ١٩٨٤ بەرپرسانی کۆمۆنیست بانگهێشتنیان کرد بۆ شاری هۆ شی مین بۆ ئەوەی لە فیلمی پرۆپاگەندە بەکاری بهێنن. لە ساڵی ١٩٨٦ چووە کووبا بۆ خوێندنی دەرمانسازی و لەوێ هوی توانی ناسی کە دوایی بووە مێردی.

هەردووکیان بانگهێشتنی ڕووسیایان قبووڵ کرد بۆ ئەوەی بچن لەوێ مانگی هەنگوین بەسەر ببن. ساڵی ١٩٩٢ کاتێ دەگەڕانەوە بۆ کووبا باڵەفڕکەیان لە کەنەدا بۆ وەرگرتنی بانزین نیشتەوە ئەمانیش ئەو هەلەیان قۆزتەوە و داوای مافی پەنابەرییان کرد لە کەنەدا و سەرکەوتوو بوون.

بۆ ماوەی دوو ساڵ بەهاوکاریی کۆمەڵایەتی ژیان، بەڵام ئێستا هوی توان ڕاوێژکاری کەسانی کەم ئەندامە. هەروەها پرۆژەی کتێبێک لە ئارادایە و کیم فوک ئەندامێکی چالاکی کڵێسایەکی مەعمەدانییە و چاوەڕوانی منداڵی دووەمیەتی لە

مانگی ئابدا و ئێستا سەرقاڵی تۆماسی کوڕیەتی کە منداڵێکی ڕووخۆشە و بەڤێتنامی و ئینگلیزی قسە دەکا و تاکوتەرا بەئیسپانیش. دایک و باوکی کیم فوک تا ئێستا لە ترانگ بانگ دەژین و زۆر حەز دەکا ئەوەندە پارەی هەبێ بتوانێ بۆ سەردان بیانهێنێتە تۆرۆنتۆ. لە ماوەی دوو ساڵی یەکەمیان لە کەنەدا، کیم فوک ئەوەندە چالاک نەبوو، بەڵام پار دووبارە دەرکەوتەوە کاتێک بینرا لە واشنتۆن لە ڕۆژی کۆنە سەربازانی شەڕی ڤێتنامدا، تاجەگوڵینە لەسەر پەیکەری یادکردنەوەی کۆنە سەربازانی شەڕی ڤێتنام دادەنێ.

ئینجا وتی: "ئەگەر بمتوانیبا ڕووبەڕوو لەگەڵ ئەو باڵەفڕوانە قسە بکەم کە بۆمبەکەی هاویشت، پێم دەگوت ئێمە ناتوانین مێژوو بگۆڕین بەڵام دەبێ هەوڵ بدەین هەندێ شت بۆ ئەمڕۆ و بۆ دوارۆژ بکەین کە ئاشتی بەهێز بکەن".

دوای تەواوبوونی ئاهەنگەکە ئەو ئەمەریکاییەی فەرمانی هێرشکردنە سەر گوندەکەی لە ناو قەرەباڵغییەکەوە هاتە دەرەوە و دەستی لە ملی کیم فوک کرد و بەدەم گریانەوە وتی "من زۆر بەداخم". ئەویش بەجۆن پلەمەری گوت "باشە، من دەبوورم، من دەبوورم".(AP)

کاتێ تەماشای ئەم چیرۆکانە دەکەین، چۆن دەیانپۆلێنین؟ ئایا لە بەرژەوەندیی مرۆڤە یاخۆ پرۆپاگاندایە یا هەردووکیانە؟ چیرۆکەکەی واشنتۆن دەڵی ئەو لە لایەن ڤێتنامییەکانە بانگ کرا "بۆ ئەوەی لە فیلمی پرۆپاگاندادا بەکاری بهێنن". سەرکەوتنیان لە بەدەستهێنانی مافی پەنابەری لە کەنەدا لەو کاتەدا کە باڵەفڕکەیان لە ڕێی گەڕانەوە بۆ کووبا لە کەنەدا نیشتەوە بۆ وەرگرتنی بانزین کارێکی مرۆڤپەروەرانەیە. بەڵام ئایا وەرگرتنی مافی پەنابەری لە کەنەدا ئەوەندە ئاسانە؟ یاخۆ دەکرێ بەم کارە بڵێین ڕفاندنی سەرچاوەیەکی پرۆپاگاندای ڤێتنامی بۆ ئەوەی ڕفێنەران بۆ هەمان شت بەکاری بهێنن؟ یاخۆ دەشێ بڵێین نموونەیەکی باشە بۆ چۆنێتیی ئامادەکردنی ڕووداو بۆ میدیا؟

## بازاڕی پەنابەری

لە ١٩٩٤دا یونایتد نیوسی هیندستان UNI هەواڵەکانی APی بەسەر کڕیارەکانی هیندستاندا بڵاو دەکردەوە. لە ٥ی ئەیلوولی ئەو ساڵەدا کاتێ لە هۆڵی ئوتێلێکدا

دانیشتبووم، سەیری تێلیپرینتەری UNIم کرد و چیرۆکێکم دۆزییەوە بەڕای من نموونەی باشی لایەنداری بوون بۆ ئەوەی لە وانە وتنەوە لە کۆرسی ڕۆژنامەوانیی ئاژانسی دەنگوباسدا بەکاریان بێنم. خوێندنەوەیەکی تر وای لێم کرد هەست بکەم چیرۆکەکە لەوانەیە هەڵبەستراو بێ و تەنیا لەسەر مێز داڕێژراوە و لە گۆڕەپانی خۆیدا کاری بۆ نەکراوە. چیرۆکەکە پڕ بوو لە قسەی گواستراوە، لە پێناو زیادکردنی راستوێژی، بەڵام ناوەڕۆکەکە گوماناوی بوو بەهۆی شێوازی پێشکێشکردنی. بەڵگەیەکی تریشم لەسەر ئەوەی قسە گواستراوەکان ڕەنگە هەڵبەستراو بن ئەوە بوو ئەو ڕۆژنامەوانەی قسەکانی گواستبووەوە، فێرناندۆ روی تاڤاریس، کە خەڵکی کەیپ ڤێردە یەکێک لە قوتابیانی ئەو پۆلەی وانەم پێ دەگوتنەوە. هەر خۆی بەهاوڕێکانی پۆلەکەی وتبوو ئەو ناوانەی لە چیرۆکەکەدا هاتوون تێ هەڵکێشی ناوی نیشتمانپەروەرە کووباییە ناسراوەکانن، وەک جەواهەرلال گاندی و مۆهانداس نەهرۆی هیندستان. ئەمەش چیرۆکەکەی APیە وەک چۆن لە لایەن UNIوە بڵاو کراوەتەوە:

ZCZC

FN 11

کووبا- بازاڕی پەنابەری

دەتەوێ کەڵەکێک بکڕی؟ دامەزراوەیەکی کەرتی تایبەت لەسەر کەنارەکانی هاڤانا گەشە دەکا

هاڤانا، ٥ی ئەیلوول (AP) بۆ فرۆشتن: کەڵەک لە بەرمیلە نەوت و کۆڵەکە و چارۆکەی پەڕۆ دروست کراوە و بەلایەنی کەمەوە سەرئاوکەوتنت مسۆگەر دەکەن تا ئەو کاتەی دەگەیتە نزیکترین کەشتیی پاسەوانانی کەنارەکانی ئەمەریکا. نرخ: ٣٠٠٠ دۆلار.

ئێرنستۆ ئاگرامۆنت دەڵێ "ئەم بەلەمانە نەک تەنیا دەتگەیەننە میامی، بگرە دەتبەنە کەنەدا یاخۆ ژاپۆنیش" لە کاتی ئەم قسانەشدا شەراب و کۆکاکۆلای نۆش دەکرد لە ناو ئەو بەلەمەی خۆی خێزانەکەی بەحەفتەیەک دروستیان کرد.

ڕەنگە قسەکانی ئاگرامۆنت زێدەڕۆییان تێدا هەبێ. بەڵام ئەو شتێکی هەیە

کڕیاری زۆرن: هەزاران کووبایی کە ئامادەن ژیانی خۆیان بخەنە مەترسییەوە بۆ ئەوەی ئیتر لە سایەی برسییەتی و هەژاری لەسەر ئەو دوورگە کۆمۆنیستە نەژین.

ئەو تەنیا یەکێکە لە ژمارەیەکی زۆری ئەو کووباییانەی هەوڵ دەدەن پارە لەو کۆچە بەکۆمەڵانەی ڕۆژانە کەنارەکانی هاڤانا بەخۆیانەوە دەیبینن دەربێنن. ئەمساڵ زیاتر لە ۳۱ هەزار کووبایی لە نێو دەریادا ڕێیان پێ گیراوە.

ئەنجیل کوستۆدیۆ گۆنزالیز کە کەڵەکچییە گلەیی دەکا "بانگەشەی زۆر هەن. ئەمە کارێکی تاوانکارانەیە. نرخەکان ۲۰ تا ۳۰ جار لەوە زیاترن کە پێویستە هەبن".

دێلهی ۰۷:۱۱

NNNN

ZCZC

FN 12

کووبا- بازاڕی پەنابەرانی دوو هاڤانا تەواو دەکا

لەم ڕۆژانەدا سەوڵێکی دار دوو دۆلار دەکا و چووپێکی بەکارهاتوو- کە کەرەستەی سەرەکیی بەلەمی ژینگۆڕە- نزیکەی ۲۵ دۆلارە و قیبلەنامەیەکی ئاسایش لە دەوروبەری ۳۰ دۆلارە. کەڵەکێکی ئامادەکراو بەماتۆڕەوە چەند هەزار دۆلارێک دەکا.

ئاگرامۆنت بڕیاری داوە کەڵەکەکەی بفرۆشێ، دوای ئەوەی خزمانی لە ئیسپانیا ئامۆژگارییان کرد ڕا نەکا لەبەرئەوەی پاسەوانانی کەنارەکان خێزانەکەی ڕەوانەی بنکەی ئەمەریکایی لە کەناری گوانتانامۆ دەکەن. ئەمیش لە کووبا هیچ نەبێ بەتەلەفۆن دەتوانێ پێوەندییان پێوە بکا.

پێنج شەش کەسێک ئارەزووی کڕینی کەڵەکەکەی ئاگرامۆنتیان نیشان داوە. کەڵەکچییەکان پارە و سەرچاوە پەیدا دەکەن بۆ ئەوەی ئەو بەلەمانەیان دەست کەوێ کە پێویستیانە و بازرگانی بەدۆلاری ئەمەریکاوە بکەن چونکە پیسۆکەی کووبا نرخی زۆر نزمە.

خوان برونۆ سۆتۆ، کە قیبلەنامەیەکی وەک شتێکی بەختراکێش لە ملی خۆی کردووە، دەڵێ "خەڵکانێک هەن خانوو و جلوبەرگ و هەموو شتێکی خۆیان

فرۆشتووه. ئەگەر من بەلەمێکم هەبێ و تۆ قیبلەنامەیەکت هەبێ دەتوانین سەودایەک بکەین".

هەر لەو نزیکانە، پێنج شەش کەس لە دەوری کەڵەکێکی ١٠٠ دۆلاری کۆ بووبوونەوە کە لەسەری نووسرابوو بۆ فرۆشتنە، کەڵەکەکە برێتی بوو لە سێ چووپی بەیەکەوە بەستراو. ئیگناسیۆ زیمینیز کە لەو ناوە دەگەڕا ئەمەی دی، ئەو دەڵێ "هەموو کەسێ لێرە گرینگی بەتایە دەدا؟ ئەمانە نوێن- دە دۆلار، بیرەشم دەست کەوت". کەس نەبوو. بەبێ ئەوەی لە گوڕوتین بکەوێ زیمینیز بەردەوام بوو.

دێلهی ٠٧:١١

NNNN

کەسایەتیی یەکەم لە چیرۆکەکەدا، ئێرنستۆ ئاگرامۆنت، ناوی تێ هەڵکێشی نیشتمانپەروەری کووبا ئیگناسیۆ ئاگرامۆنتی دراوەتێ کە لە ساڵی ١٨٧١ ناوبانگی دەرکرد و ناوی ئێرنستۆ "چی" گیڤارا و دوایین کەس لەم چیرۆکەدا قسەی وەرگیراوە ئیگناسیۆ زیمینیز ناوەکەی تێکەڵەی ئیگناسیۆ ئاگرامۆنت و ئالڤێر جیمینیزی نیشتمانپەروەری ١٩٥٠یە. ئایا ئەمە تەنیا هەوڵێک بوو بۆ داهێنانی هەندێ ناوی کووبایی بۆ سازدانی چیرۆکەکە، یاخۆ سووکایەتییەکی بەئەنقەستە بۆ پاڵەوانانی مێژووی کووبا؟ بەڵام خەڵکانێک لە دووریی هەزاران میل بڕوا دەکەن کە ئەمە چیرۆکێکی باشە سەبارەت کاروباری مرۆڤانە و بەکاری دێنن وەک چۆن UNI بەکاری هێنا.

بۆیە ئەم نموونانە هەڵبژێران لەبەرئەوەی زۆر روونن و پێوەندییان بەبابەتگەلێکەوە هەیە لە هەموو جیهاندا زانراون. میدیای ناوخۆیی زۆر لە وڵاتان ئەم چیرۆکانەی بەکار هێناوە و کردوویانیەتە جێی متمانە و زۆر لە کڕیاران ئاگەدار نین یاخۆ گوێ نادەن بەوەی ئەو هەواڵانە چۆن کۆ کراونەتەوە یاخۆ بەچ سیستمێک کاریان لەسەر کراوە. هەروەها ئەم نموونانە ئەوەش دەردەخەن بانگەشەکردن بۆ بێلایەنی ئاسانترە لە کارکردن بۆی.

ئەوانەی بەرپرسن لە داڕشتنی هەواڵەکان سەرچاوەی زیاتریان لەبەر دەستە لەو هەواڵنێرانەی هەواڵەکان کۆ دەکەنەوە. چۆنێیەتیی کاری ئاژانسەکانی دەنگوباس و

میدیاکانی تر ئەمرۆ ئاشکراترن لە جاران و ڕووداوەکان وا ڕێک دەخرێن لەگەڵ میدیادا بگونجێن. حەزی مرۆڤ لە تەمبەڵی لای هەواڵنێرانیش هەیە، ئەمەش تا ئەوپەڕی لە لایەن بەڕێوەبەرانی میدیاوە قۆستراوەتەوە کە ئەمان پرۆفیشنالترن و مووچەیان بەرزترە لە هەواڵنێرەکان.

پێویستە هەواڵنێر و ئاژانس بەردەوام لە خۆیان بپرسن ئایا گەیشتنە دیوەکەی تری هەواڵەوە و ئایا کەسی تر پێش ئەوان بەکاری هێناوە. هەواڵنێر و نووسیاران پێویستە لە بەکارهێنانی وەسف و باکگراوند زۆر وریا بن لەبەرئەوەی لایەنداری زۆر بەبێدەنگی دزە دەکاتە ناو کارەکانەوە.

# چوارەم

## تێکنۆلۆجیا و فرەجۆری

یەکێ لە خاڵە بەهێزەکانی ئاژانسەکانی دەنگوباس، بەکارهێنانی بەردەوامی نوێترین تێکنۆلۆجیای گەیاندن بووە. تێلیگراف، تەلەفۆن، تێلیتایپ، رادیۆ فۆتۆ و گواستنەوە بەسەتەلایت، هەموو ئەمانەش لە سەردەمی خۆیاندا تێکنۆلۆجیای گرانبایی بوونە و ئاژانسەکانی دەنگوباسیان لە پێگەی نایابدا داناوە. ئاژانسەکانی دەنگوباس دەتوانن هەواڵ و وێنە لە جێی زۆر دوورەوە بهێنن و تەنانەت بەرۆژنامە ناوخۆییە بچووکەکانیشیان بگەیەنن ئەوانەی بەم شێوەیە نەبێ ناتوانن خۆیان ئەو هەواڵ و وێنانە بەدەست بێنن. بەهۆی پێشکەوتنی تێکنۆلۆجیاوە، ئاژانسەکانی دەنگوباسیش توانییان خزمەتگوزاریی نوێ و پێشکەوتووتر پێشکێش بکەن. تەنانەت هەندێ ئاژانس دەستیان بەوەبەرهێنان لە بواری تێکنۆلۆجیادا کرد بۆ ئەوەی پێش ئەوانەی تر بکەون و هەندێکیان چوونە نێو هەوڵی هاوبەش لەگەڵ کۆمپانیا تێکنۆلۆجییەکان و هەندێ جار هاوپەیمانیی ستراتیجییان لەگەڵ ڕکابەراندا ساز دا بۆ ئەوەی بەسەر ڕکابەری تردا زاڵ بن.

### کۆتر و تێلیگراف

لە ١٨٤٩دا پاوڵ یۆلیۆس رۆیتەر بۆی دەرکەوت کە باشترین تێکنۆلۆجیای بەردەست کۆمەڵێکی ٤٥ کۆترە کە لە ماوەی دوو ساتدا دەتوانن هەواڵ و نرخەکان لە

نێوان برۆكسل و ئەڵمانیا بگوازنەوە، ئەمەش شەش سات لە شەمەندەفەر خێراتر بوو. هەر زووش رووی لە بەكارهێنانی تواناكانی كێبڵی تێلیگراف. لە ساڵی ١٨٥١ رۆیتەر بۆ یەكەمین جار هێڵی كێبڵی ژێرئاوی نێوان ئینگلتەرا و فرانسەی بەكار هێنا، بەمەش هەلی خێراتر ئاڵوگۆڕی هەواڵ و نرخەكانی نێوان لەندەن و ناوەندە سیاسی و بازرگانییەكانی ئەوروپای ڕەخساند.

لە ساڵی ١٨٥٨دا یەكەمین هەواڵ ڕاستەوخۆ لە ئەوروپاوە لە ڕێی كێبڵی ئۆقیانووسبڕەوە گەیشتە ئەمەریكا. ئەو كێبڵە كە بۆ AP نێردرابوو ٤٢ وشەی لەخۆ گرتبوو كە كورتەی پێنج چیرۆكی هەواڵ لە شێوەی ناونیشاندا بوو و بە: "یاخیبوون كپ كرایەوە، هەموو هیندستان هێمن دەبێتەوە" تەواو دەبوو.

لە كتێبی مێژوو، تیۆری و پراكتیكی تێلیگرافی كارەبایی، كە جۆرج ب پرێسكۆت نووسیویەتی و لە ١٨٦٠دا بڵاوكراوەتەوە، باسێكی چۆنێیەتیی كاركردنی AP دەكا:

"نزیكەی دە ساڵە كۆوارە سەرەكییەكانی نیویۆرك كۆمەڵەیەكیان پێك هێناوە بەمەبەستی پێكەوە كۆكردنەوە و هاوبەشی لە تێچووەكانی بەتێلیگراف ناردنی هەواڵەكان لە هەموو پارچەكانی جیهانەوە. كارمەندێكی گشتی دامەزرێنرا بۆ چاودێریكردنی كارە پراكتیكەكانی ئەو سیستمەی بڕیار بوو دامەزرێ و بارەگاكەی لە نیویۆرك بوو. كارمەندانی تریش لە هەموو شارە سەرەكییەكانی ویلایەتە یەكگرتووەكان و ئەمەریكای بریتانیایی و هەندی شاری ئەوروپادا دەبن. دوابەدوای پێكهێنانی كۆمەڵەكەی نیویۆرك، نزیكەی هەموو ڕۆژنامە ڕۆژانەكانی ئەمەریكا چوونە ناو كۆمەڵەكەوە. هەر شتێك كە جێی بایەخ بێ و لە هەر شوێنێكی ئەم وڵاتەدا ڕوو بدا، یەكسەر بەتێلیگراف ڕەوانەی نووسینگەی سەرەكی لە نیویۆرك دەكرێ، لە هەموو خاڵەكانی سەر ڕێشدا كۆپیی لێ وەردەگیرێ و بەشەكانی تری وڵاتیش لە ڕێی نووسینگەی سەرەكییەوە هەواڵەكەیان پێ دەگا. تێچووی ساڵانەی ڕاپۆرتە ڕۆژنامەوانییەكان بۆ ویلایەتە یەكگرتووەكان نزیكەی ٢٠٠ هەزار دۆلارە و نیوەی ئەم پارەیە لە لایەن ڕۆژنامەوانیی نیویۆركەوە دەدرێ و نیوەكەی تریش دابەش دەبێ بەسەر ئەندامانی كۆمەڵەدا لە شوێنە جیاجیاكانی وڵاتدا– شارە گەورەكان بەشێكی زۆری ئەم تێچووە دەدەن، لە كاتێكدا ڕۆژنامەكانی شارۆكەكان مانگانە هەر

یەکێکیان تەنیا ٣٠ تا ٤٠ دۆلار دەدەن. بەشی هەرە زۆری راپۆرتە ڕۆژنامەوانییەکان بەشەو لە ڕێی وایەرەوە دێن- لە شەشی ئێوارەوە دەست پێ دەکا و لە یەکی بەیانیدا تەواو دەبێ، بەڵام زۆربەی کات تا چواری بەیانی بەردەوام دەبێ و هەندێ جاریش بەدرێژاییی شەو بەردەوامییان هەیە."

لە نێوان ساڵانی ١٨٦٣ و ١٨٦٦ رۆیتەر بەردەوام بوو لە وەبەرهێنان لە بواری تێکنۆلۆجیادا، ئەویش بەڕاکێشانی هێڵی تێلیگراف. ئەو هێڵێکی لە نێو ئایرلاند بنیات نا کە بووە هۆی زووتر گەیاندنی هەواڵەکانی ئەودیوی ئۆقیانووسی ئەتلانتی بەلەندەن بەهەشت سات پێش ئەوەی ڕکابەرەکانی بیانگەیەنن، هەروەها هێڵی تریشی بنیات نا بۆ بەهێزکردنی گەیاندن لە پارزەوینی ئەوروپادا. AP هێڵی تێلیگرافی تایبەت بەخۆی بنیات نەنا، بەڵام لە ١٨٧٥دا بووە یەکەمین دەزگای هەواڵ لە ئەمەریکادا کە بەکرێ هێڵێکی تێلیگرافی بۆ خۆی مسۆگەر کردبێ. لە ١٨٨٢دا رۆیتەرز دەستی بەبەکارهێنانی پرینتەری ستوون کرد بۆ گواستنەوەی ئێلیکترۆنیی هەواڵ بۆ کڕیارەکان و جێی گەیاندنی لە ڕێی تەتەرەوە پێی گرتەوە. لە ١٩١٤ AP توانیی گواستنەوەی بەشێوازی مۆرس بەتێلیپرینتەر گۆڕی. لە ١٩٢٣ رۆیتەرز رادیۆی بۆ گواستنەوەی نێودەوڵەتیی هەواڵ و بەکۆدی مۆرس بەکارهێنا. بەهاتنی ساڵی ١٩٣٩ش نزیکەی ٩٠٪ی هەواڵەکانی رۆیتەرز بەشەپۆلی کورتی رادیۆیی دەگوێزرانەوە. ساڵی ١٩٢٧ رۆیتەرز تێلیپرینتەری خستە کار بۆ گەیاندنی هەواڵ بەڕۆژنامەکانی لەندەن.

## خزمەتگوزاریی وێنەی AP

لە ساڵی ١٩٢٧دا AP خزمەتگوزارییەکی ساوای وێنەی دەست پێ کرد. کۆمەڵێکی بچووکی وێنەگرانی فۆتۆگراف لە شارە سەرەکییەکاندا دانران، سەرەتا وێنەکان بەشەمەندەفەر لە نووسینگەیەکەوە بۆ نووسینگەیەکی تر دەنێردران، هەندێ جاریش بەباڵەفڕە و لە دەرەوەی وڵاتیشەوە بەهێڵی زەریایی. لە هەندێ بۆنەی تایبەتدا AP سیستمی AT&T بۆ گواستنەوەی وێنە بەکار دەهێنا بەمەبەستی ناردنی وێنەیەکی خاوەن تایبەتمەندی لە شوێنی خۆیەوە بۆ خاڵێکی بڵاوکردنەوە. لە ڕاستیدا گەیاندنی هەر وێنەیەک ماوەی ٨٥ ساتی دەویست. کاتێ هێڵی ئۆقیانووسی مۆرۆ کاسل

ئاگـرەکـەی کـەناری نـیـوجـێـرسـیی دی، وێنەگـرێکی فـڕی و وێنە لە دوای وێنەی دیمەنەکەی گرت. نێگەتیڤەکان دوایی لە نیویۆرک شۆرانەوە و نێگەتیڤە ڕەسەنـەکان بەپۆستـەی ئاسـمـانی ڕەوانەی سـەنتـەرە سـەرەکییـەکانی بڵاوکردنەوە لە چیکاگۆ و لۆس ئـەنجلس کـران. وێنـەکـان چاپ کـران و بەشـەمـەندەفـەر و پۆسـتــە دووبارە بڵاوکـرانەوە. AP بڕی دوو دۆلاری بەگـەیەنەرەکـانی شـەمـەندەفـەر دەدا بەرامـبـەر گـەیاندنی هەر پاکـەتێک بەتـەتەرەکان. لە سـەرەتای ١٩٣٠یەکـاندا ئەم سـیسـتـەمـە وردەوردە لە گـەیانـدنی وێنە بەم تـۆڕە ئاوێتـەیەی ئـاسـمـان- دەریا- هێـڵـی ئـاسنەدا پێـشکەوتنـی بەخـۆوە دەدی. بەڕێوەبەری گـشـتـیی AP، کـێنت کـووپـەر سـەرەڕای بەهەڵسـتی و تەگـەرەی تەکنیکیش سـیـسـتـمی AT&Tی بۆ پێـویسـتـیی تایبـەتی پیشەسازیی ڕۆژنامـەوانی خستە کار. ئەم سیستـمە وێنەی لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر دەگواسـتـەوە. بەڵام کووپەر دەیویست بەیەک پرۆسەی گواستنەوە وێنەکان بگەنە چەند شـارێک، بۆیە ئەندازیارانی AP و وەگـەڕخـەرانی کـۆمـپـانیـاکـانی تەلـەفـۆن دەسـتـیـان بەکار کرد. لە ١ی کـانوونـی دووەمی ١٩٣٥ تۆڕی وایەرفـۆتۆی AP لەدایک بوو، یەکـەمین وێنەش کـە گـواسـتـییـەوە وێنەی تێکشکانی باڵەفڕەیەک بوو لە باکوری ویلایەتی نیویۆرکدا. هەر لە سەرەتاوە تۆڕەکـەی AP زۆر بەخێرایی فرەوان بوو و بە ٤٧ ڕۆژنامـە لە ٢٥ ویلایەتدا دەستی پێ کرد و چەند تۆڕێکی ناوچەیی دامـەزرێنران. لە کـاتی شـەڕی دووەمی جـیـهـانیـشـدا، بەکـەمـتـر لە دە سـاڵ لە دوای لەدایکبـوونی وایەرفۆتۆی AP، وێنەگرانی AP توانییان شـەڕگەکانی جیهان داپۆشن، وێنەکان لە شـوێنی تـایبـەتی کـۆکـردنەوەیان لـە لەندەن و گـوام کـۆ بکەنەوە و بـەخـێـراییـیـەکی پێوانەیی بیانگەیەننە ئەمەریکا.

کـاتێ هێزەکانی مـارینز لە شوباتی ١٩٤٥ بۆ شـەڕی ژاپۆنییـەکان لە ئیـیۆ جیـمـا دابەزین، خزمەتگوزاریی وێنەی AP ئەو وێنانەی لە لایەن جۆ ڕۆزنتـالەوە گیرابوون لە مـاوەی کـەمـتـر لە یەک ڕۆژدا گـەیاندە ڕۆژنامـەکان. ئەو وێنەیەی ڕۆزنتـال کـە ئێـسـتـا بووەتە وێنەیەکی مـێـژوویـی مـارینـزە سـەرکـەوتـووەکـان لە کـاتی هەڵکردنی ئاڵای ئەمـەریکا لەسـەر چیـای سـوراباچی یەکێکە لە چەندین وێنە کـە لە کـاتی دابەزینی مـارینز و شـەڕ و دوای شـەڕ گـرتوویانـن. وێنەکـان دەفـڕین بـەرەو گـوام و لـەوێوە

بەرادیۆی هێزی دەریاوانی بۆ سان فرانسیسکۆ و لەوێوە دوای ١٧ سات ونیو لە گەیشتنی مارینز بەئییۆ جیما لە ڕێی خزمەتگوزاریی وایەرفۆتۆی AP بڵاو کرانەوە.

نیویۆرک تایمز وتی "شتێکە مایەی سەرسوڕمان و بڕوا پێکردنی سەختە کە ڕۆژنامەکان یەکەمین دابەزین لەسەر ئییۆ جیما بڵاو بکەنەوە و هاوکات وێنەی ئەو دابەزینەش بڵاو بکەنەوە". دوای ئەمە وای لێ هات ئەو سیستمانەی وێنە دەگوێزنەوە بەبێ ئەوەی مرۆڤ هەستی پێ بکا جێی گواستنەوەی دەستیی وێنەیان گرتەوە.

سەرکەوتنی وایەرفۆتۆی AP بووە هاندەر بۆ دەست پێکردنی دوو تۆڕی تری گواستنەوەی وێنە لە ڕێی وایەرەوە "Acme"کە دواتر بەیونایتد پرێس نیوسپیکچەر ناسرا و"ئینتەرناشناڵ نیوس فۆتۆز" دوایی لەگەڵ UP یەکیان گرت و بوونە یونایتد پرێس ئینتەرناشناڵ.

لە ئەوروپا، تۆڕگەلی سەربەخۆ دەستیان کرد بەپێشکێشکردنی وێنە بەو ڕۆژنامە ئەوروپاییانەی هەواڵی APیان وەردەگرت. بەهاتنی ١٩٥٠کانیش، ئەم تۆڕانە وێنەیان بەرادیۆ بۆ ئەوبەری ئۆقیانووسی ئەتلەنتی دەگواستەوە. لە ١٩٦٠ەکانیش کێبڵی ژێردەریا ئەم تۆڕانەی بەیەکەوە بەستەوە. لە هەندێ شوێن، AP ڕێککەوتنی لەگەڵ ئاژانسە نیشتمانییەکانی وێنەدا مۆر کرد و لە شوێنانی تریش AP توانیی تۆڕی وێنەی خۆی لەسەر شێوەی نموونە ئەمەریکاییەکە بنیات بنێ. بەهاتنی کۆتاییی ١٩٦٠کان، AP تۆڕێکی وێنەی پێک هێنا کە بەتۆکمەیی لە تۆکیۆوە بەرەو ئەمەریکا و لەوێوە بەرەو ئەوروپا تا دەگاتە مۆسکۆ وێنەی دەگواستەوە. وردەوردە ڕەنگ لە ڕۆژنامەکانی جیهاندا پەیدا بوو، وێنەگران و تەکنیککارانی ژووری تاریکی AP وێنەی ڕەنگینیان بەوایەر گواستەوە. تەکنیکی نوێ پەیدا بوون بۆ باشترکردنی جۆری وێنەکانی تۆڕی وایەرفۆتۆی AP – لە هەموویان شۆڕشگێڕانەتر لێزەرفۆتۆ بوو. بەبەکارهێنانی کاغەزی فۆتۆ کە بەگەرما کاری لەسەر کرابێ لە جیاتی مادەی کیمیایی و بەکارهێنانی تیشکی لێزەر لە جیاتی سیستمی کۆنی چرا، لێزەرفۆتۆ جۆرە وێنەیەکی نوێ و بەکوالیتیی بەرزی گەیاندە ڕۆژنامەکانی ئەمەریکا. دوای چەند ساڵێکی کەمیش، AP تۆڕێکی نوێی خستە کار بەناوی لێزەرفۆتۆ ٢ کە تێکنۆلۆجیای سەتەلایتی بۆ گواستنەوەی وێنەی ڕەنگینی هەواڵەکان بەکار هێنا.

بەڵام ڕوون بوو کە تەمەنی گواستنەوەی ئەنالۆگ- گواستنەوەی تەلەفۆنیی وێنەکان کە لە سەردەمی وەرچەرخانی سەدەوە دەرکەوتبوو و لە سەرەتاوە هاوکاری وایەرفۆتۆ بوو- کورت دەبێ. تێکنۆلۆجیا نوێکانی هەواڵ خێراییی گواستنەوەی وشەیان زیاد کرد و بەمەش ژمارەی چیرۆکە هەواڵەکان زۆرتر بوو. هێڵەکانی ئەنالۆگی تەلەفۆنیش تا دەهات سنووردارتر دەبوون بەرامبەر خواستی زیادکردووی خێراتر گەیاندنی وێنەی ڕەنگینی زۆرتر. لە سیستمی ئەنالۆگدا، گواستنەوەی یەک وێنەی ڕەنگین ٤٠ خولەکی دەویست. وەڵامی ئەم خواستەی گواستنەوەی دیجیتاڵی وێنە بوو.

پرۆسەی کارکردن بۆ باشتر گواستنەوە لە ١٩٧٠کاندا دەستی پێ کرد، بەهاتنی ساڵی ١٩٧٨ AP ئامرازێکی نوێی وێنەی پێشکێش کرد، کە بریتی بوو لە پەرجوویەکی تەکنیکی کە تێکنۆلۆجیای دیجیتاڵی بۆ مامەڵەتکردن لەگەڵ وێنەدا بەکار هێنا، ئەویش ژووری تاریکی ئێلیکترۆنیی AP بوو. لە بنەڕەتدا ئەم سیستمە بۆ وەرگرتن و ئەمبارکردن و گواستنەوەی وێنە بەشێوەی دیجیتاڵ بەکار هێنرا بێ ئەوەی جۆری وێنەکە هیچ کاری لێ بکرێ. باشترکردنی وێنە بەکۆمپیوتەر لە ژووری تاریکدا مەیسەر بوو و چاکسازیی مەزن لە جۆری وێنەدا کران، بەتایبەتی لە کاتی مامەڵەتکردن لەگەڵ وێنەی بێگانەدا. لەگەڵ هاتنی کۆتاییی ١٩٨٠کان، ژووری تاریکی ئێلیکترۆنی لە نیویۆرک و چیکاگۆ و واشنتۆنی پایەتەخت و لۆس ئەنجلس کاریان تێدا دەکرا. ژووری تاریکی ئێلیکترۆنی لە لەندەن و فرانکفۆرت و تۆکیۆش، کە خاڵی کۆنترۆڵی سەرەکیی وێنەن لە جیهاندا، بنیات نران و دابین کران. دوای ماوەیەکی کورتیش، ژووری تاریکی ئێلیکترۆنی لە چیرۆکە سەرەکییەکاندا، وەک کۆنگرە سیاسییەکان و یارییە ئۆلۆمپیاییەکان، سوودی لێ وەرگیرا.

تا وای لێ هات وێنەگرانی AP هەموو وێنەکانیان ڕەنگاوڕەنگ بێ، ئەمەش دوای داهێنانی سکانەری لیفاکس. ئەم سکانەرە ئامرازێکی گواستنەوەی وێنە بوو کە نێگەتیڤی فۆتۆگرافیشی سکان دەکرد و وێنەی دیجیتاڵی دروست دەکرد. لیفاکس توانیی خەرجکردنی کاتی زۆر و پرۆسەی نارێکی چاپکردنی کیمیایی لە شوێنی کاری بڵاوکردنەوەی وێنەی هەواڵدا وەدەر بنێ.

دواین قۆناخ لە سیستمی نوێی وێنە کە بەڕێوەیە- ڕێکخستن و جێبەجێکردنی سیستمی تەواو دیجیتاڵە.

لە ١٩٨٩دا AP ڕای گەیاند کە لیف پیکچەر دیسکی AP دەخاتە سایتی ڕۆژنامە ئەندامەکانیەوە بۆ ئەوەی وێنەی پێ وەرگرن. بەمەش تۆڕی کۆنی وایەرفۆتۆ وەلاوە دەنرێ و لێزەرفۆتۆ ٢ پاشەکشە دەکا. ئیتر توانرا وێنەی ڕەنگین لە بازنەیەکی مەزنی سەتەلایتدا بگوازرێتەوە لە ماوەی تەنیا ١٥ چرکە بۆ هەر وێنەیەک بەبەراورد لەگەڵ ٤٠ خولەک لە هێڵەکانی ئەنالۆگدا. هەروەها لەبەرئەوەی هەموو وێنەکانی ڕەنگین بوون، توانای سیستمی دیجیتاڵ لە پاراستنی جۆری بەرزی وێنەی ڕەنگیندا لە ئاستێکدا بوو سیستمی ئەنالۆگ توانای ململانێی لەگەڵدا نەبوو.

ئەم سیستمە نوێیە خوازیاری چەندین گۆڕانکاریی بەرچاو بوو لە مامەڵەتکردن لەگەڵ وێنە لە بەشەکانی کاری ڕۆژنامەدا. وێنەکان ئێستا لەسەر شاشەی کۆمپیوتەر دەبینرێن و پێویست ناکا چاپ بکرێن. هەروەها نووسیاران دەتوانن وێنەی دیجیتاڵ بەجۆرێک دەستکاری بکەن (بێگومان مەبەست شێواندن نییە - وەرگێڕ) کە پڕ بەپێستی ئەو سیستمە بێ ئەوان لە بڵاوکردنەوەدا بەکاری دێنن و لای ئەوانەوە بەرەو قۆناخەکانی پێش چاپخانە و چاپخانە بنێرارێن.

تیمێکی تەکنیکارانی AP نێردرانە ڕۆژنامەکان بۆ هاوکاریکردنیان لە دامەزراندنی ئەم سیستمە و تیمێکی فێرکەرانی AP نووسیارانیان فێر دەکرد چۆن ئەم پرۆگرامە بەکار بهێنن. لەبەرئەوەی ئێستا جۆری ئەو ڕەنگانەی بەم سیستمە وەردەگیرێن بەئاسانی کاری لەسەر دەکرێ، بۆیە زۆربەی ڕۆژنامەکانی ئێستا ڕەنگین بەپێەوانەی جارانەوە. ڕۆژنامەکان وێنەکانی خۆشیان بەم سیستمە بەکار دێنن.

دوو هەنگاوی تری کۆتایی پێشکەوتنی دیجیتاڵیان تەواو کرد. لە ٢٨ی کانوونی دووەمی ١٩٩٦دا، وێنەگرانی AP کامێرایەکی ئێلیکترۆنیی نوێیان NC2000 بەکار هێنا بۆ وێنەگرتنی یاریی سوپەر بۆڵینگ XXX بەبێ بەکارهێنانی فیلم. ئەم کامێرایە بەهاوئاهەنگیی نێوان AP و ئیستمان-کۆداک پێش خراوە وێنەی دیجیتاڵی خستە سەر تەنکەی ئێلیکترۆنیی ناو کامێراکەوە. ئەمڕۆ وێنەگرانی AP و زۆر لە ڕۆژنامە ئەندامەکانی نەوەی داهاتووی کامێرای دیجیتاڵ بەکار دێنن، کۆداک

DSC620 لەسەر بنەمای نیکۆن و کۆداک DSC520 لەسەر بنەمای کانۆن بۆ گرتنی وێنەی فرە باش لە جۆردا کە دەتوانرێ بەچەند چرکەیەک بگوێزرێتەوە.

هەنگاوەکەی تری پێشکەوتنە دیجیتاڵەکەی AP بریتی بوو لە دروستکردنی ئەرشیڤێکی دیجیتاڵی وێنە لە نیویۆرک. ئەمرۆ ئەو ئەرشیڤە نزیکەی ٧٠٠ هەزار وێنە لەخۆ دەگرێ. هەر کەسێکیش لە هەر شوێنێکی ئەم جیهانە بێ دەتوانێ لە ڕێی ئینتەرنێتەوە سەردانی ئەم ئەرشیڤە بکا و لە چەند خولەکێکی کەمدا ئەو وێنانە بدۆزێتەوە کە دەیەوێ.

ئەسۆشیێتد پرێس پێشکەوتووترین سیستمی بڵاوکردنەوەی وێنە بەڕێوە دەبا لە هەموو ڕێکخراوەکانی هەواڵ پێشکەوتووتر- ئەو جادووە ڕەشەی فیلمی کلاسیک و چاپی کیمیاییی وێنەی بەپرۆسەیەکی دیجیتاڵ گۆڕی کە هەمان کاریگەریی هەیە. ئەمرۆ هیچ شوێنێک لەسەر گۆی زەوی ئەوەندە دوور نییە کە لە هەمان ڕۆژدا وێنەی هەواڵەکانی نەگوازرێنەوە.

## خزمەتگوزارییەکانی وەشان

یونایتد پرێس ئەسۆسیەیشن وەک خزمەتگوزاریی ڕۆژنامە دەستی پێ کرد بەبڵاوکردنەوەی هەواڵەکانی بەشێوەی نووسین بۆ ئەوەی بەچاپکراوی بڵاو بکرێنەوە، بەڵام لە ١٩٣٥دا بووە یەکەمین دەزگای هەواڵ کە ڕاپۆرتەکانی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بۆ ئێزگەکانی رادیۆ ئامادە بێ.خزمەتگوزارییەکی هەواڵی بۆ رادیۆ دابین کرد تیایدا هەواڵەکان بەشێوەیەکی گونجاو بۆ خوێندنەوە لە رادیۆدا ئامادە دەکران- واتە زیاتر بۆ گوێ بوون لەوەی بۆ چاو. لە ساڵی ١٩٥٨ وەک UPI ئۆدیۆ دەستی پێ کرد و لە ١٩٨٣دا بووە تۆڕی رادیۆی UPI. ئەم تۆڕە، کە پێشتر UPI ئۆدیۆ بوو، لە ١٢:٣٢ی دوای نیوەڕۆی ڕۆژی پێنجشەمە ١٩ی ئابی ١٩٩٩ چالاکییەکانی خۆی ڕاگرت. ئەو ٤٠٠ بۆندی وەشانەی لە پاش UPI بەجێ مابوون فرۆشران بە ئەسۆشیێتد پرێسی ڕکابەری سەرەکیی.

ساڵی ١٩٤٨ی ونایتد پرێس لەگەڵ توێنتیس سێنچری فۆکس دەستیان بەخزمەتگوزارییەکی فیلمی هەواڵ کرد بەناوی UP مووڤیتۆن. دوای ئەوە لە ١٩٥٨دا

یونایتد پرێس بووە خاوەنی ئینتەرناشناڵ نیوس سێرڤس بۆیە I بۆ UP زیاد کرد و بووە UPI و ماوەیەک UPI مووڤیتۆن بوو و کاتێ مولْکی ITNای بریتانیایی بوو، بووە UPITN. ماوەیەکیش لەگەڵ دیزنی وەک ئاژانسی WTN کاریان کرد و لە کۆتاییدا لە ساڵی ١٩٩٨ بە AP فرۆشرا.

لە ساڵی ١٩٤١دا نزیکەی هەزار ئێزگەی رادیۆی بازرگانی لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا کاریان دەکرد. یونایتد پرێس و INS و ترانیرادیۆ پرێس بەشێکی سنوورداری هەواڵیان بۆ هەندێکیان دابین دەکرد. ئەوانەی تر بەهیچ جۆرێک خزمەتگوزاریی هەواڵیان وەرنەدەگرت. هەواڵەکانی ویلایەتەکە یاخۆ ناوچەکە لەو هەواڵانەی ئاژانسەکانی دەنگوباس بەرێی وایەری رادیۆدا بڵاویان دەکردەوە تەنیا لەو کاتانەدا سوودیان لێ وەردەگیرا کە هەواڵەکان زۆر بەگرینگ بۆ بەرژەوەندیی گشتی دابنرایەن. زۆربەی وەشانکاران هەواڵی ناوخۆییان بۆ بەکارهێنانی خۆیان کۆ نەدەکردەوە.

ئەسۆشیێتد پرێس بەدەستپێکردنی وەشانێکی بەوایەری بەردەوام بەناوی سێرکت ٧٧٦٠ ئەم رەوشەی گۆڕی. لە ١ی نیسانی ١٩٤١دا بەفەرمی لە لایەن ئێزگەی WSB و WQXR و WOR و WNYCی نیویۆرکەوە مۆر کرا. کەسانی پسپۆڕ تیایدا هەواڵیان بەشێوەیەک دەنووسی کە لەگەڵ گوێدا بگونجێ.

دوای تەنیا یەک ساڵ لە کردنەوەی فەرمیی وەشانی AP، زیاتر لە ٢٠٠ ئێزگە لە ١٢٠ شاردا سوودیان لەم خزمەتگوزارییە وەردەگرت، وەشانکاران دەستیان بەکۆکردنەوەی هەواڵی ناوخۆی کرد و ١١٠ کارمەند ناویان لە لیستی مووچەدا هەبوو. لە ١٩٤٧دا دەستەی کارگێڕیی AP یەکەمین گرووپی ئێزگەکانی رادیۆی هەڵبژارد- ٤٥٦ ئێزگە بوون- بۆ ئەوەی ببنە ئەندامی هاوکار. لە ١٩٥٠کان و ١٩٦٠کاندا، AP بەردەوام بوو لە کۆکردنەوەی ئەندامی وەشانکار و لە ١٩٧٤دا بەداوای ئەوان تۆڕی رادیۆی APی دامەزراند. ئەم تۆڕە گشت ساتێک دەنگوباس و هەواڵی وەرزش و پرۆگرامی بازرگانیی بەئێزگەکانی رادیۆی ئەندام دەدا و دوایی بووە یەکەمین تۆڕی رادیۆ لە جیهاندا کە خزمەتگوزارییەکانی لە رێی سەتەلایتەوە بڵاو بکرێنەوە. هەر ئەو ساڵە AP خزمەتگوزارییەکی نۆدیۆی زیاد کرد کە

ڕاستییەکانی بەدەنگەوە دەگەیاند. ئەمڕۆ ئەم خزمەتگوزارییە دەگاتە نزیکەی هەزار ئەندامی وەشانی AP.

بەهاتنی ساڵی ١٩٧٩، وایەری وەشانی ئەسۆشیێتد پرێس تەنیا و درێژترین سێرکتی بکرێ بوو لە جیهاندا. لە هەمان ساڵدا وایەری تەلەفزیۆنی ئەسۆشیێتد پرێس یەکەمین وایەری هەواڵ بوو کە بەتایبەتی بۆ ئێزگەکانی تەلەفزیۆن داڕێژرابوو، هاتە مەیدان. لە ١٩٨٠ رادیۆی AP بووە یەکەمین تۆڕی رادیۆ لە جیهاندا کە لە ڕێی سەتەلایتەوە بگەیەنرێتە کڕیارەکانی.

لە ١٩٨٣دا AP پرۆسەکانی وەشانی خۆی لە بارەگاکانی نیویۆرکەوە بۆ سەنتەری وەشانی هەواڵی AP لە واشنتۆنی پایەتەخت گواستەوە. لە ٤ی ئایاردا AP یەکەمین وەشانی خۆی لەو شوێنە نوێیەوە گواستەوە.

بەهاتنی ساڵی ١٩٨٨ ژمارەی دەروازەکانی وەشانی AP گەیشتە زیاتر لە ٥٠٠٠,

دەیەی ١٩٩٠کان بووە دەیەی تەقینەوەی خزمەتگوزارییەکانی رادیۆ و تەلەفزیۆنی AP. تیایدا AP توانیی سۆفتوێری هەرزان بایی ژووری هەواڵ، AP نیوسدێسکی تایبەت بەئێزگەکانی رادیۆ پێشکێش بکا، کە یەکەمینە لە زنجیرەیەک سۆفتوێری بەردەست کە ژووری هەواڵی ئەندامانی کاراتر کرد.

ئەسۆشیێتد پرێس ئەو ئامرازانەی خستە بەر دەستی ئەندامانی، کە بتوانن بەهۆیانەوە مامەڵەت لەگەڵ ئەو زانیارییە زۆرانەدا بکەن کە وایەرەکانی AP و سەرچاوەکانی تری زانیاری دابینیان دەکەن. لە ١٩٩٤ سەنتەری هەواڵی APکە سیستمێکی ژووری هەواڵی تایبەت بەتەلەفزیۆنە دەستی بەکار کرد. لە ١٩٩٧ سیستمی بەرهەمهێنانی ئێلیکترۆنیی هەواڵی AP بەتایبەتی بۆ دەستەی وەشانی بریتانیا BBC دروست کرا.

هەروەها AP بانکی گرافیکی پێشکێش کرد کە یەکەمین ئەرشیفی گرافیکی تەلەفزیۆنە لە تۆڕی ئینتەرنێتدا و خزمەتگوزاری پێشکێشی زیاتر لە ٣٠٠ ئێزگەی تەلەفزیۆن لە ئەمەریکا دەکا.

ساڵی ١٩٩٤، APTV کە خزمەتگوزارییەکی نێودەوڵەتیی هەواڵی ڤیدیۆییە و بارەگاکەی لە لەندەنە لە لایەن APیەوە دامەزرا. ئەم خزمەتگوزارییە لە ١٩٩٨دا بوو

به APTN دەنگوباسی تەلەفزیۆنی ئەسۆشیێتد پرێس، ئەمە دوای ئەوە بوو کە AP ئاژانسی ڤیدیۆی WTNی لە خاوەنەکانی کە کۆمپانیاگەلی ABC نیوسی ئەمەریکا و ITNای بریتانیا و کەناڵ ٩ی ئوسترالیان کڕی. APTN لە ڕێی سەتەلایتەوە وێنەی ڤیدیۆیی گرینگترین چیرۆکە هەواڵی ڕۆژ، کە ٨٣ نووسینگەی AP لە ٦٧ وڵاتی جیهاندا کۆیان دەکەنەوە، پێشکێشی گەورە دەزگاکانی هەواڵ لە سەرتاسەری جیهاندا دەکا. APTN بەزۆرێ جەخت لەسەر ڕۆژنامەوانیی سەرکێش دەکاتەوە و هەموو چیرۆکەکە لە کاتی گرینگدا و بەپێی کاتی هەر شوێنێکی جیهان پێشکێش دەکا.

هەر لە ساڵی ١٩٩٤دا ئەسۆشیێتد پرێس، AP ئۆڵ نیوس رادیۆی ANRی دامەزراند کە خزمەتگوزارییەکی هەواڵی رادیۆیە لە ڕۆژێکدا ٢٤ سات کار دەکا. ANR هەموو شێوازەکانی هەواڵ بەشێوەیەکی جەماوەری و گونجاو پێشکێش بەهەموو ئێزگەکان و بەجیاوازیی قەبارەیانەوە دەکا. ئێستا زیاتر لە ٧٠ ئێزگەی رادیۆ بەشداربووی ANRن و بەئاسانی دەتوانن هەواڵی ناوخۆیی و ڕێکلام بخەنە نێو هەواڵنامەکانی ANRوە.

لە ساڵی ١٩٩٦ و لە کارێکی هاوبەشدا APTV و ترانس وۆرڵد ئینتەرناشناڵ TWI ئاژانسی SNTVی هەواڵی ڤیدیۆیی وەرزشییان دامەزراند. ئامانجی ئەم هاوبەشکییە دەستگرتن بوو بەسەر بازاڕدا لە ڕێی کاری هاوبەشی گەورەترین دەزگای کۆکردنەوەی هەواڵی جیهان و گەورەترین دانەری سەربەخۆی پرۆگرامی وەرزشی. ئێستا زیاتر لە ١٠٠ وەشانکار لە سەرتاسەری جیهاندا سوود لە خزمەتگوزارییەکانی SNTV وەردەگرن.

## سەتەلایت و کۆمپیوتەر

لە ساڵی ١٩٥٣دا ڕۆیتەرز لە گرین ئێند لە دەروبەری لەندەندا ئێزگەیەکی نوێی گوێ شلکردنی کردەوە. گرینگیی گوێ شلکردنی وەشان بەردەوام زیاد دەبوو وەک ئامرازێک بۆ وەرگرتنی نوێترین زانیاری بەتایبەتی لە وڵاتە کۆمۆنیستەکانەوە. ساڵی ١٩٦٢ ڕۆیتەرز یەکەمین هەواڵی سەتەلایتی خۆی لە ڕێی مانگی دەستکردی

تێلستارەوە ناردە ئەمەریکا و بەمەش بووە یەکەمین کۆمپانیای کەرتی تایبەت کە بچێتە نێو گەیاندنی بۆشاییەوە. AP کە ئاژانسێکی فرەوانی دەنگوباسە سیستمێکی نووسین و نووسیاریی داهێنا بەناوی لوولەی تیشکی کاتۆد CRT، ئەم سیستمە لە ۱۹۷۱وە دەستی پێ کرد. AFP لە ۱ی ئابی ۱۹۷۱وە سەتەلایتی بۆ گواستنەوەی هەواڵ بەکار هێنا. AP لە ساڵی ۱۹۸۰وە دەستی بەگواستنەوەی هەواڵ بەسەتەلایت کرد و لە ۱۹۸٤ بووە یەکەمین دەزگای هەواڵ کە بگوێزەوەی سەتەلایتی خۆی هەبێ. یەکەمین سیستمی نووسیاریی ڤیدیۆ لە نووسینگەی نیویۆرکی رۆیتەرز لە ۱۹۷۳ دروست کرا و ڕۆژنامەوانان لە جیاتی تایپرایتەر بۆ نووسینەوە و گواستنەوەی هەواڵ VDUیان بەکارهێنا. هەروەها رۆیتەرز بووە یەکەمین کۆمپانیا کە خزمەتگوزاریی سەتەلایتی ئینتێلنێت بەکار بهێنێ، کە لە لایەن ئینتێلساتەوە بۆ گواستنەوەی هەواڵ و وێنە و زانیاریی بازاڕ دروست کرا.

دەستەی بەڕێوەبەرانی AFP لە تشرینی یەکەمی ۱۹۷۳ پێشنیازی کرد ئاژانسەکە بکۆمپیوتەرێنێ، بەڵام تەنیا لە تشرینی دووەمی ۱۹۷٥ ئەم بیرۆکەیە بووە بڕیار. نووسینگەی ئەمەریکای لاتینی AFP یەکەمین نووسینگەی ئاژانسەکە بوو و لە ئاداری ۱۹۷٦دا کۆمپیوتەرێنرا. لە ۱ی کانوونی دووەمی ۱۹۸۱ بانکێکی زانیاری بۆ بابەتەکانی AFP بەناوی ئەگۆرا دامەزرا. لە ۱ی کانوونی دووەمی ۱۹۸۲ش نووسینگەی هۆنگ کۆنگی AFP کۆمپیوتەرێنرا و لەو کاتەوە ناوچەی ئاسیا-پاسیفیک بووە خاوەنی بارەگای خۆی. لە ١٥ی تشرینی یەکەمی ۱۹۸٤ خزمەتگوزاریی ئۆدیۆی AFP دەستی پێ کرد و لە ۱ی کانوونی دووەمی ۱۹۸٥ خزمەتگوزاریی نێودەوڵەتیی وێنەی خۆی دەست پێ کرد. لە کانوونی دووەمی ۱۹۸٦وە AFP خزمەتگوزارییەکانی خۆی لە ڕێی مینتێلەوە دەگوێزێتەوە. لقی پۆلیکۆم بۆ ئاژانسەکە زیاد کرا و تۆڕی گواستنەوە جێبەجێ کرا. لە ۱ی تشرینی یەکەمی ۱۹۸۸دا AFP خزمەتگوزاریی گرافیکی خۆی دەست پێ کرد. لە ۱۹۹۱ بانکی گرافیکی AP بووە یەکەمین ئەرشیڤی گرافیک لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بۆ تەلەفزیۆن، بەبەکارهێنانی هێڵی ستانداردی تەلەفۆن.

## خزمەتگوزاریی داراییی رۆیتەرز

له ١٩٦٠كاندا رۆيتەرز هەستی بەپێویستیی فرەجۆریی بەرهەمەكانی كرد، لەو كاتەوەی تەلەفزیۆنی بازرگانی خەریک بوو قازانجەكانی گرووپە نیشتمانییەكانی رۆژنامەی كەم دەكردەوە، كە خاوەنی نیوەی رۆیتەرز بوون. سەرەتا رۆیتەرز دەستی بەجەختكردن لەسەر بنیاتنانی بەرهەمی داراییی ئێلیكترۆنی كرد بۆ پارەداركردنی باڵی بێ قازانجی هەواڵ. له ١٩٦٤ رۆیتەرز كۆمپانیای ئەلترۆنیک سیستمزی كڕی كە كۆمپانیایەكی كۆمپیوتەر بوو و لینكی بۆ دروست كرد لەگەڵ بازاڕەكانی پشک له لەندەن و نیویۆركدا. بۆیە له ١٩٦٤ لەگەڵ دامەزراندنی پرۆگرامی ستۆكماستەردا، رۆیتەرز بووە پێشەنگ له بەكارهێنانی كۆمپیوتەر بۆ گواستنەوەی زانیاریی داراییی نێودەوڵەتی.

رووخانی سیستمی رێژەی نەگۆڕ دوای هەڵوەشانەوەی رێككەوتنی بێرتن وودز و ئەو شڵەژانە دراوییەی بەدوای كێشەی نەوتی ١٩٧٠كاندا هات، پاڵنەر بوون بۆ بەرزكردنەوەی رۆیتەرز لەبەرئەوەی بازاڕ زیاتر و زیاتر هەستی بەپێویستیی وەرگرتنی هەواڵ له كاتی خۆیدا كرد. له ساڵ ١٩٧٣ خزمەتگوزاریی رۆیتەر مۆنیتەر مەنی رەیتس دەستی پێ كرد و بەهۆی ئەم خزمەتگوزارییەوە توانرا نرخی گۆڕینەوەی دراو له كاتی خۆیدا لەسەر شاشە پێشان بدرێ و پێشتر بازرگانەكان بۆ زانینی ئەو نرخانە پشتیان بەتەلەفۆن و تێلێكس دەبەست. مۆنیتەری شاشەی سەوزی رۆیتەرز بەرهەمێک بوو بۆ دەلاڵیی خانوو و بەره له ناوەڕاستی ١٩٨٠كاندا و سەرمایەی كۆمپانیاكە له ماوەی دە ساڵدا له ١٧,٥ ملیۆنەوە گەیشتە ٢٤٢ ملیۆن پاوەنی ستەرلینی.

له ساڵی ١٩٨١ خزمەتگوزاریی رۆیتەرز مۆنیتەر دیلینگ دەستی پێ كرد و ئەوانەی مامەڵەتیان بەدراوی بیانی دەكرد توانییان بەهۆی ئەم خزمەتگوزارییەوە كارەكانی خۆیان له رێی یەكەی ڤیدیۆییەوە ئەنجام بدەن. ئەم خزمەتگوزارییە ماوەی ئەنجامدانی بۆندێكی له ٤٠ چركەوە بۆ تەنیا ٢ چركە كورت كردەوە. له ١٩٨٦دا رۆیتەرز توانیی ئینستینێت بەدەست بهێنێ كە خەریک بوو دەبووە گەورەترین كۆمپانیای دەلاڵی له جیهاندا كە خزمەتی پشكەكانی دەكرد و بازاڕەكانی داهاتی

چەسپاند. ئینستیتیێت هاوکاریی کڕیارەکانی دەکرد بۆ دۆزینەوەی باشترین نرخەکان لە ڕێی گەیاندنیان بەڕێژەو(سیولة)ی جیهانی و بەهێزکردنی کاریگەرییان و ڕەخساندنی هەلی گەورەتر بۆیان. ساڵی ۱۹۸۷ ڕۆیتەرز خزمەتگوزاریی نرخدانانی ڕۆیتەرز ئیکویتیز ۲۰۰۰ی دامەزراند. یەکەی ڕۆیتەرز نیوس پیکچەر سیستمێکی نووسیاریی ئیلیکترۆنیی وێنە بوو و هەروەها خزمەتگوزاریی پۆکێت مۆنیتەر کە خزمەتگوزارییەکی زانیاریی داراییە لە ڕێی مۆبایلەوە.

ساڵی ۱۹۹۲ ڕۆیتەرز دیلینگ ۲۰۰۰ی دامەزراند کە یەکەمین خزمەتگوزاریی کۆمپیوتەرڕێنراوی نێودەوڵەتیی بەیەکگەیاندنە بۆ ئاڵوگۆڕی بیانی، هەروەها گلۆبێکس کە سیستمێکی جیهانییە بۆ بازرگانیی ئیلیکترۆنی. لە ۱۹۹۳شدا ئیکویتی فۆکەسی دامەزراند کە خزمەتگوزارییەکی پشکەکانی بریتانیایە وەک ڕکابەرێک بۆ بەرهەمە نەریتییەکەی لەندەن ستۆک ئێکسچەینج. لە ۱۹۹٤دا ڕۆیتەرز بووە خاوەنی تیبکۆ کە پێشەنگی پێشخەرانی سۆفتوێر بوو بۆ ئینتەرنێت لە جیهاندا. هەروەها دوو خزمەتگوزاریی بازرگانیی دەست پێ کرد: بزنس بریفینگ و ڕۆیتەرز فایننانشیەڵ تێلیڤیژن سێرڤس. لە ۱۹۹٥ ڕۆیتەرز گرینهاوس فەند دروست کرا بۆ وەبەرهێنان، ئەمەش دەروازەیەک بۆ ڕۆیتەرز بەڕووی تێکنۆلۆجیای نوێدا. لە ۱۹۹٦ ڕۆیتەرز زنجیرەی ۳۰۰۰ی دامەزراند کە برێتییە لە کۆمەڵێ بەرهەمی بوارەکانی سکرتاریا و گەنجینە و دراو. داهێنانە نوێکان گەیشتنیان بەزانیاریی بنکەی نوێی زانیاری و ئیمێڵی پارێزراو مسۆگەر دەکرد لە پاڵ کۆمەڵە هەواڵێکی نوێ بۆ کەناڵە جۆراوجۆرەکانی میدیا.

ڕۆیتەرز لە ساڵی ۱۹۹۷دا نوێترین ماشێنی بەدواداگەڕانی مایکرۆسۆفتی بەکار هێنا بۆ خزمەتگوزاریی بزنس بریفینگ.

لە ۱۹۹۸ ڕۆیتەرز مۆبایل داهێنرا بۆ ئەوەی کڕیارەکان بتوانن بگەنە بەرهەمەکانی ڕۆیتەرز لە ڕێی ئینتەرنێتەوە.

## AFX

لە ٤ی شوباتی ۱۹۹۱دا AFP لقێکی ئابووریی بەزمانی ئینگلیزی دامەزراند بەناوی نیوز. لە نیسانی ۱۹۹٥ AFP دایرێکت دامەزرا بۆ گواستنەوەی تایبەتی

خزمەتگوزارییەکانی AFP. لە ئاداری ۲۰۰۰دا AFP ئەو ٥٠٪ی کە هی فایناشناڵ تایمز گرووپ بوو لە AFX کڕییەوە.

## ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی ئەڵمانیا dpa

ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی ئەڵمانیا dpa کە لە ١ی ئەیلوولی ۱۹٥٠دا کەوتە کار لە رووی پێشکەوتنی تێکنۆلۆجیاوە زۆر لە دوای ئەوانی تر نەبوو. لە ۱۹٥۷دا دەستی بەوەشانی خزمەتگوزارییەکانی بۆ ئەورووپا بەهۆی شەپۆلی درێژەوە کرد، لەگەڵ ئەوەی خزمەتگوزارییە ئینگلیزییەکەی بۆ ئەوبەری زەریاکان بەپێنج شەپۆلی کورت دەگوازرانەوە.

لە ۱۹۷۳ ئەوەی یەکەمی ERNA کەوتە کار و بەهۆیەوە نووسیارانی dpa دەیانتوانی لەسەر شاشەی کۆمپیوتەر دەقەکان بنووسنەوە. لە ۱۹۷۹ توانرا کڕیارەکانی خزمەتگوزارییەکانی dpa لە ڕێی شاشەوە وەرگرن. لە ۱۹۸٠ خزمەتگوزاریی ئەوروپاییی dpa توانیی ڕۆژانە ٢٤ سات هەواڵ بگوێزێتەوە. لە ۱۹۸۳ فۆتۆ سێرڤسی dpa بووە خاوەنی بەشی ئێلیکترۆنیی وێنە.

## کاری هاوبەش

ئاژانسەکان بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدا بوون ڕێی نوێ بدۆزنەوە بۆ فرەوانکردنی دەروازەکانی گەیشتن بەجیهان و زیادکردنی جۆرەکانی داهات بۆیە لەم بوارەدا هاوپەیمانیی ستراتیجی و کاری هاوبەش تەنانەت لەگەڵ ڕکابەرەکانیشدا دەکرێن. ئەمانەش چەند نموونەیەکن:

### فاکتیڤا

فاکتیڤا، کۆمپانیایەکی داو جۆنز و ڕۆیتەرزە، باشترین کۆکراوەی زانیاریی جیهانی پێشکێش دەکا. فاکتیڤا کە لە ساڵی ۱۹۹۹دا دامەزراوە هەواڵی جیهانیی ئاستی نێودەوڵەتی و هەواڵی بازرگانی پێشکێشی ڕێکخراوەکان لە سەرتاسەری جیهان دەکا لەوانە وایەری هەواڵی داو جۆنز و ڕۆیتەرز و وۆڵ ستریت جۆرناڵ کە خزمەتگوزارییەکی تەنیایە و لە هیچ شوێنێکی تر دووبارە نابێتەوە. فاکتیڤا لە

کارەکەیدا نزیکەی ۹۰۰۰ سەرچاوە لە ۱۵۳ وڵاتەوە و بە ۲۲ زمان دادەپۆشێ.

خزمەتگوزاری و بەرهەمەکانی فاکتیڤا هاوکاری کۆمپانیاکان دەبن بۆ بەیەکەوە کۆکردنەوەی هەواڵەکان و زانیارییە بازرگانییەکان لە بواری کاری ڕۆژانەیاندا لە پێناو زیادکردنی زانیاریی ڕێکخراوەیی و زیادکردنی ناوەڕۆکی دەرەکی و ناوەکی لە کاری ڕێکخستنی زانیاریدا. چارەسەری بەسوود بۆ بەکارهێنان لە دامەزراوەکاندا پێشکێش دەکا. هەروەها ڕاوێژی تەکنیک و بۆچوون و پرۆگرامی ئێلیکترۆنیی فێرکردن.

## CNBC

لە ساڵی ۱۹۹دا دامەزرا و خزمەتگوزارییەکی NBC یونیڤێرسال و داو جۆنزە، هەواڵ و پرۆگرامی بازرگانی پێشکێشی بینەران لە ئەمەریکا و ئاسیا و ئەوروپا دەکا. داو جۆنز ناوەڕۆکی بابەتەکانی تەلەفزیۆنی بازرگانی لە ڕێی هاوپەیمانیی جیهانییەوە لەگەڵ NBC یونیڤێرسال کە تۆڕی تەلەفزیۆنی ژمارە یەکی ئەمەریکایە، بەرهەم دێنێ. هەردوولا بەیەکەوە خاوەنی CNBCن. داو جۆنز هۆکاری ئەوە بوو CNBC ببێتە تەلەفزیۆنی پێشەنگ لە بواری بازرگانیدا، لە ڕێی پێشکێشکردنی نوێترین چیرۆکە سەرەکییەکان و گەیاندنی زانیاریی بازاڕ لەو خولەکەدا کە تیایدا ڕوو دەدا سەرباری شیکردنەوە و دیمانەش. نزیکەی ۲۰۷ ملیۆن ماڵ لە سەرتاسەری جیهاندا دەتوانن CNBC ببینن.

لە ۱۲ی کانوونی دووەمی ۱۹۹۸ CNBC ئەوروپا دامەزرا و لە لەندەن بەرهەم دەهێنرێ و دەوەشێنرێ و ٤٥ نووسینگەی لە ئەوروپا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەفریقادا هەیە، لەوانە لە بەرلین و دەبلن و مەدرید و مۆسکۆ و ڕۆما و زیوریخ و عەمان و ئۆرشەلایم و جۆهانسبێرگ. خزمەتگوزارییەکانی دەگەنە ٦١ دەوڵەت و ۸٥ ملیۆن ماڵ لەو ناوچانەدا.

لە ۲ی شوباتی ۱۹۹۸ CNBC ئاسیا دامەزرا و بارەگای سەرەکیی لە سینگاپۆرە و چوار نووسینگەی هەیە لە هۆنگ کۆنگ و سیدنی و نیو دێلهی و تۆکیۆ. ئەم کەناڵە لە ۲۷ وڵاتدا دەبینرێ کە ئەمانەن: ساموای ئەمەریکا، برونەی، کامبۆدیا، چین، هۆنگ

کۆنگ، ئیندۆنیسیا، ماکاو، مالیزیا، مالدیڤ، پالاو، پاپوا گینیای نوێ، فیلیپین، سایپان و گوام، سینگاپۆر، کۆریای باشوور، تایوان، تایلاند، ڤێتنام، بەنگلادیش، هیندستان، نیپال، پاکستان، سری لانکا، ژاپۆن، تایوان، ئوستralیا و نیو زیلاند.

سمارت مۆنی

سمارت مۆنی، کۆواری وۆڵ ستریت جۆرناڵ بۆ بازرگانیی کەسیی لە ١٩٩٢ دەستی پێ کرد و کارێکی هاوبەشی نێوان داو جۆنز و کۆمپەنییە لەگەڵ هێرست کۆرپۆرەیشن و خزمەتگوزاریی زۆر گرینگ لە بواری زانیارییەکانی دارایی کەسی و ڕاوێژ بۆ باش بەکارهێنانی پارە لە ئەمەریکا دەکا. سمارت مۆنی بەڵێن دەدا وەڵامی گشت ئەو پرسیارانە بداتەوە کە ئەو کەسانە دەیکەن کە لەم سەردەمە لێڵەدا بەدوای ڕوونیدا دەگەڕێن. بیرۆکەی کردەیی پێشکێش دەکا لە بارەی پارە کۆکردنەوە و وەبەرهێنانی و خەرجکردنیدا، جگە لەمەش داپۆشینی بەردەوامی هەیە بۆ بابەتەکانی تێکنۆلۆجیا و ئۆتۆمۆبیل و ستایلەکانی ژیان.

ڤیدۆمۆستی

ڤیدۆمۆستی (تۆمارەکە) لە ١٩٩٩دا دامەزرا و خزمەتگوزارییەکی هاوبەشی داو جۆنز و پیرسن و ئیندپێندنت میدیایە و ڕۆژنامەی بازرگانیی سەربەخۆیە لە ڕووسیای نوێدا. ڕۆژانەیە و ڕووسی زمانە. لە دوو بەش پێک دێ: بەرگ و کۆمپانیا و بازارەکان. ١٦ لاپەڕەیە. بەری ڕەنجی زیاتر لە دوو هەزار ڕۆژنامەوانە لە سەرتاسەری جیهاندا. ڤیدۆمۆستی ئاراستەی بەڕێوەبەران و پیشەوەران و دامەزراوە مامناوەندی و بالاکان دەکرێ. کڕیارەکانی برێتین لەو خەڵکە دەوڵەمەندە کە بڕیاربەدەستن. ڤیدۆمۆستی جەخت دەکاتە سەر کۆمپانیا و بازارەکان بەهەموو بەش و جۆرەکانیانەوە.

**STOXX**

لە ساڵی ١٩٩٨دا دامەزراوە و STOXX کارێکی هاوبەشی نێوان دۆیچە بۆرزە و داو جۆنز و گرووپی SWXە. خزمەتی ئامارەکانی (موئەشیرات) داو جۆنز STOXX دەکا و پێشکێشیان دەکا و پێشەنگی ئامارەکانی پشکی ناوچەیی ئەورووپایە.

STOXX له شـوباتی ۱۹۹۸دا دامـەزرا، پێش دەسـتـپێکی یۆرۆ و داهێنانـی ناوچەی یۆرۆ لە ۱ی کـانوونـی دووەمی ۱۹۹۹دا. بازاڕەکـانی پشک لە ئەوروپا دادەپۆشـێ بەچەند ڕێیەکی تەواوکەر بەپێی ناوچە، قەبارە، کەرت و ئێستا بەپێی ستایلیش. نەخشەسازی و پێشخستن و گەیاندنی ئەم ئامـاژانە بەشێوەیەکن کە توانای وەبەرهێنان و بازرگانیکردن و گواستنەوەیان مسۆگەر بکا.

ف ف سۆسی

دامـەزراوەی ف ف سۆسی لە ۱۹٦۳دا پێک هێنرا لە لایەن ف ف سۆسی ئەند پارتنەرز و لیمیتد پارتنەرشیپ (کە لە ۱۹۷٤ لەگەڵ داو جۆنز ئەند کۆمپەنی و ڕێکسفۆرد پێک هێنرا). ساڵانە ۲٥۰ هەزار تۆنی مەتری لە کاغەزی شیاو بۆ ڕۆژنامە بەرهەم دێنێ.

AAP ئیمج

ئەسۆشیێتد پرێسی ئوسترالیا بەهاوبەشیی ئاژانسی وایڵدلایت فۆتۆ کۆمەڵێکی بەرفرەی وێنەی کوالیتی بەرزی ئوسترالیا پێشکێشی کۆمپانیا و تاکەکان دەکەن. ئەم خزمەتگوزارییە لەسەر تۆڕی AAPیە و ئەرشیڤێکی هەیە زیاتر لە ۸۰۰ هەزار وێنەی دیجیتاڵ لەخۆ دەگرێ کە هەموو لایەنەکانی ژیان لە ئوسترالیا دادەپۆشن.

## خزمەتگوزاریی پێوەندیی گشتیی پرێس ئەسۆشیەیشن

زۆر ئاژانس بۆ بەدێستهێنانی داهاتی زیاتر ڕوویان کردووەتە بواری پێوەندییە گشتییەکان، پرێس ئەسۆشیەیشنی بریتانیا خزمەتگوزارییەکی بەرفرە پێشکێش دەکا کە تایبەتە بەئاژانسەکانی پێوەندیی گشتی و بەشەکانی پێوەندیی گشتیی نێوخۆیی. پێکەی بێ هاوتای پرێس ئەسۆشیەیشن لە چەقی پیشەسازیی میدیا لە بریتانیادا هاوکاری بووە بۆ پێشکێشکردنی پشتگیری بۆ هەڵمەتەکانی پێوەندیی گشتی و بازاڕاندن و ئەو چالاکییانەی پێوەستن بەمیدیاوە. پرێس ئەسۆشیەیشن نیوسفایل بەبەردەوامی خزمەتگوزاریی چاودێریکردنی هەواڵ پێشکێشی ئاژانسەکان و نووسینگە ڕۆژنامەوانییەکان دەکا و بەمەش بەردەوام هەنگاوێک لە

پێش سەردێرەکانەوە دەبن. ئەم خزمەتگوزارییە رۆژانە زیاتر لە ١٠٠٠ چیرۆک، بەچیرۆکەکانی سیاسەت و هەواڵی شار و نیشتمانەوە دەگوێزێتەوە.

## ئاسیا پەڵس

ئاسیا پەڵس لە ١٩٩٦دا پێک هات و کارێکی هاوبەشی نێوان ژمارەیەک کۆمپانیای تایبەتە بەهەواڵ و زانیارییەوە، لەوانە: ئەسۆشیێتد پرێسی ئوستراليا AAP، LKBN ANTARA (ئیندۆنیسیا)، نیهۆن کێیزای شیمبون (ژاپۆن)، ئاژانسی دەنگوباسی عومان، خزمەتگوزاریی نێودەوڵەتیی زانیاریی پاکستان پرێس، ئاژانسی دەنگوباسی فیلیپین، پرێس ترەستی هیندستان، ئاژانسی دەنگوباسی ڤێتنام، ئاژانسی دەنگوباسی چینهوا (چین)، ئاژانسی دەنگوباسی یۆنهاپ (کۆریای باشوور)، ئاژانسی ناوەندیی دەنگوباس (تایوان)، ئاژانسی دەنگوباسی کۆماری ئیسلامی (ئێران) و، چەند سەچاوەیەک لە مالیزیا و سینگاپۆر. ئاسیا پەڵس دەزگایەکی زانیاری و خزمەتگوزاریی هەواڵە کە لە کاتی خۆیدا زانیاری و هەواڵی بازرگانی دەگەیەنێ لە ناوچەی ئاسیادا. ئاسیا پەڵس سی وڵات و پەنجا جۆر بازرگانی دادەپۆشێ.

## ئیتار-تاس

کەتەلۆگی ساڵی ٢٠٠٤ی ئیتار-تاس ژمارەیەکی زۆر بەرهەمی زانیاری ئامێز لەخۆ دەگرێ، جگە لە خزمەتگوزاریی تەواوی هەواڵ و خزمەتگوزاریی وێن، ئەمەش بۆ بەدەنگەوەهاتنی خواستەکانی گشت کەناڵەکانی میدیا و رێکخراوە حکوومی و ناحکوومەتییەکان لە رووسیا و لە دەرەوەدا. ئەمەش چەند بەرهەمێکە لە بەرهەمە جۆراوجۆرەکانی ئیتار-تاس:

**ئۆڵ نیوس:** بریتییە لە هەواڵگەلی سەرەکی و تەواوی تۆڕی ئیتار-تاس. رۆژانە نزیکەی ٤٠٠ راپۆرت بڵاو دەکاتەوە لە هەموو بوارێکی ژیاندا. بەردەوام لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت دەست دەکەوێ و لە کاتی خۆیدا.

وایەری خزمەتگوزاریی جیهان: بەزمانی ئینگلیزییە و رۆژانە نزیکەی ٢٠٠ راپۆرتی هەیە و لە کاتی خۆیاندا و بەبەردەوامی. بەعارەبی و فرانسەیی و ئیسپانی

و ئەڵمانیش ڕۆژانە بەهەر زمانێک ١٥٠ راپۆرتی هەیە.

هەواڵەکانی ڕووسیا: هەموو هەواڵەکانی ناو ڕووسیا و ئەو هەواڵانەی دەرەوە کە پێوەندییان بەڕووسیاوە هەیە، ڕۆژانە نزیکەی ٢٥٠ راپۆرتی هەیە و بەردەوام لە کاتی خۆیدایە.

هەواڵەکانی جیهان: هەموو هەواڵەکانی دەرەوە و نزیکەی ٢٠٠ راپۆرتی ڕۆژانەی هەیە، بەردەوام و لە کاتی خۆیدا.

چیرۆکە سەرەکییەکان: تەنیا نوێترین هەواڵ لەبارەی پێشهاتە گرینگەکانی ڕووسیا و جیهانن و ڕۆژانە نزیکەی ٥٠ چیرۆک بڵاو دەکاتەوە لەم ساتانەدا بە کاتی مۆسکۆ: ١١ و ١٥ و ١٩.

هەواڵەکانی مۆسکۆ: هەموو هەواڵەکانی پایەتەخت و ناوچەکەیەتی و ڕۆژانە نزیکەی ٣٠ راپۆرتی هەیە، بەردەوامە و لە کاتی خۆیدایە.

هەواڵەکانی هاوبەندیی وڵاتانی سەربەخۆ و بەلتیک: هەموو هەواڵەکانی ئەو وڵاتانە بڵاو دەکاتەوە و ڕۆژانە نزیکەی ٤٠ راپۆرتی هەیە و لە کاتی خۆی و بەبەردەوامی هەیە.

هەواڵەکانی لە دەسەڵاتەوە: سەرۆکی دەوڵەت و ئیدارەکەی و حکوومەت و پەرلەمان و هەموو دەزگاکانی دەسەڵات و هەواڵە سەرەکییەکانی ڕووداوگەلی سیاسی لە ڕووسیا، ڕۆژانە نزیکەی ٥٠ راپۆرتی هەیە بەبەردەوامی و لە کاتی خۆیدا.

هەواڵەکانی سیاسەتی دەرەوە: چالاکییەکانی سیاسەتی دەرەوەی ڕووسیا دەگوێزێتەوە، بەبەردەوامی و لە کاتی خۆیدا و ڕۆژانە نزیکەی ٨٠ راپۆرتی هەیە.

هەرێمە فیدراڵەکانی ڕووسیا: هەواڵی هەرێمەکان دەگوێزێتەوە و هەر پرۆگرامێک ٢٠ راپۆرتی ڕۆژانەی هەیە. بەردەوامە و لە کاتی خۆیدایە.

هەواڵەکانی ئابووری: گرینگترین هەواڵەکانی بازرگانی و ئابووری و دارایی لە ڕووسیا و وڵاتانی ترەوە، ڕۆژانە نزیکەی ٥٠ راپۆرتی هەیە لە کاتی خۆی و بەبەردەوامی.

هەواڵەکانی کولتوور: ٢٥ راپۆرتی ڕۆژانە لە بارەی شەوی یەکەم و پێشانگە و

فیستڤاڵەکان و کتێب و سینەما و شانۆ و خول و ئەستێرەکانی هونەر.

هەروەها زنجیرەیەکی درێژی تر لە بەرهەمەکانی ئیتار-تاس وەک هەواڵەکانی ئاین و تاوان و ڕووداو و باڵەفڕەن و ئاسمان و چەک و، سوپا و هێزی تایبەت و ئاین و کۆمەڵ و زانست و تێکنۆلۆجیا و دەرمان و ژینگە و خزمەتگوزاریی زانیاری بەپێی خواستی کڕیار و ژمارەیەکی زۆری تری خزمەتگوزاری.

## گرفتەکانی ڕۆیتەرز

فرەبەرهەمی هەندێ جاریش گرفت و کێشەی خۆی هەیە. ڕۆیتەرز کاتێ دوای ١٥١ ساڵ تەمەن لە ٢٠٠٢دا کە بەهۆی کێشەی دۆت کۆمەوە ڕووبەڕووی یەکەمین شکست بووەوە ئەمەی بۆ دەرکەوت. لە ١٩٨٤دا کۆمپانیاکە باڵی بەسەر بازاڕی کەلوپەلدا کێشا و ٥٠ ملیۆن پاوەن قازانجی کرد. بەڵام ئەم قازانجە پاڵەپەستۆی زیاتری خستە سەر کۆمپانیاکە بۆ ئەوەی بەرهەمەکانی ڕووەو تێکنۆلۆجیا ببا. بۆیە ڕۆیتەرز ڕووی لە کڕینی هەندێ کۆمپانیای تێکنۆلۆجیایی کرد و لە کۆتاییی ١٩٨٠کاندا قازانجی ساڵانەی گەیشتە سەرووی ١٦٠ ملیۆن پاوەن.

بەڵام لە کۆتاییی ١٩٨٠کان و سەرەتای ١٩٩٠کان بەڕێوەبەرایەتیی ڕۆیتەرز ڕووبەڕووی هەڕەشەی ڕکابەرێکی نوێ دەبووەوە، کە بلوومبێرگ بوو، مەترسیی بەرهەمی بلوومبێرگ بەسەر ڕۆیتەرزەوە ئەو زۆرە نەبوو، بلوومبێرگ توانای شیکردنەوەی نرخەکانی هەبوو کە ئەمە لای ڕۆیتەرزدا نەبوو. بەڵام هەوڵی ڕۆیتەرز بۆ ململانێ لەگەڵ بلوومبێرگ لەم بوارەدا بووە هۆی کارەساتێکی دارایی و زنجیرەیەک کەیسی دادگە.

# پێنجەم

## ئینتەرنێت

ئاژانسەکانی دەنگوباس لە سەردەمێکدا لەدایک بوون کە خێراترین هۆکاری گواستنەوەی هەواڵ کۆتر شانبەشانی تێلیگراف بوو. بەڵام ئێستا لە رووبەڕووبوونەوەدان لەگەڵ ئەو پێشکەوتنە خێرایانەی جیهان بەخۆوەیان دەبینێ لە بواری تێکنۆلۆجیای زانیاریدا، بەتایبەتیش لە گەیاندن بەئینتەرنێت. ڕۆژ بەڕۆژ ئاژانسەکانی دەنگوباس ناچار دەکرێن ڕۆڵی خۆیان لە کۆمەڵگەدا لەو ڕۆڵە نەریتییەی گەیاندنی خێرای هەواڵ و زانیاری بەمیدیای چاپکراوەوە، بۆ پێشکێشکردنی هەموو شێوازەکانی هەواڵ و زانیاری بەوێنە و گرافیک و تۆماری دەنگیشەوە بەڕادەیەکی فرەوانی بەکارهێنان بگۆڕن.

ئینتەرنێت تۆڕێکی جیهانیی کۆمپیوتەرگەلێکی پێکەوە بەستراوە کە ملیۆنان کەس بەیەک دەگەیەنێ لە سایبەرسپێسدا (ئەو بۆشاییە نەبینراوەی ئینتەرنێت کاری تێدا دەکا) و دەگاتە برێکی زۆر لە زانیاری لە سەرتاسەری جیهاندا. بەپێچەوانەی خزمەتگوزارییەکانی ئۆنلاین، کە لە ناوەندەوە کۆنترۆڵ دەکرێن، ئینتەرنێت بەپێی دیزاینەکەی ناکرێ لە ناوەندەوە کۆنترۆڵ بکرێ. هەر کۆمپیوتەرێکی ئینتەرنێت، کە پێی دەوترێ خانەخوێ، سەربەخۆیە. بەکارخەرەکانی دەتوانن ئەو خزمەتگوزارییانە دیاری بکەن کە بەکاریان دێنن و ئەو خزمەتگوزارییە خۆییانەش دەستنیشان بکەن کە دەیانخەنە ناو تۆڕی جیهانیی ئینتەرنێتەوە.

ئینتـەرنێت لە یەک کـاتدا ئامـێرێکی وەشـانی جیـهـانیـیـە و مـیکانیـزمـێکە بۆ بڵاوکردنەوەی زانیاری و ژینگەیەکە بۆ هاوکاری و بەیەکگەیشتنی نێوان تاکەکان و کۆمـپیـوتەرەکان بەبێ گوێدان بەشـوێنی جوگـرافیـاییـان. داهێنانی تێلیگراف و تەلەفۆن و رادیۆ و کۆمپیوتەر زەوینەیان بۆ ئەم یەکخستنە نوێیەی توانایانە خۆش کرد. ئینتەرنێت یەکێکە لە نموونە هەرە سەرکەوتووەکانی سوودەکانی وەبەرهێنانی بەهێزکراو و پابەندبوون بەتۆژینەوە و پێشکەوتن لە ژێرخانی زانیاریدا. لە ساڵی ١٩٧٢دا یەکەمین جێبەجێکردنی "گەرمی" پۆستی ئێلیکترۆنی پێشکێش کرا و لە هاوینی ١٩٩١دا تۆڕی جـیـهـانی WWW لە تاقـیگە هاتە دەرەوە و خـرایە بەر دەستانەوە.

ئینتەرنێت تۆڕێکی زەبەلاحی زانیارییە و بەنەرمییەکی زۆری دژ بەشکست دروست کـراوە. لە هەمـوو شـوێنێکی جـیـهـاندا بەردەسـتـە. تا ڕادەیەکی زۆر بۆ خـزمـەتگوزارییـەکانی گـواستنەوەی زانیـاری هـەرزان و خێـرایە بەبەراورد لەگەڵ هۆکارە نەریتییـەکانی گەیاندن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پارێزراو نییـە و دەکەوێتە بەر شـالاوی دزین و لەناوچوونی زانیـارییـەوە. "جـۆری خزمـەتگوزاری" لە ئینتـەرنێتـدا مسـۆگەر نییـە. بەڵام سـەرباری هەمـوو ئەمانەش دەتوانێ جـێی هێڵـە گرانبـاییـیە نەریتییـەکان بگرێتەوە. ئینتەرنێت کاریگەریی بەسەر گشت بوارەکانی تێکنۆلۆجیاوە هەیە و زۆر سەختە بوارێکی تێکنۆلۆجیای زانیاری بدۆزیتەوە کاریگەریی ئینتەرنێتی بەسەرەوە نەبێ.

ئاژانسەکانی دەنگوباس بەهۆی ئینتەرنێتـەوە مـەرگی دوورییان بینی و لە هەمـان کاتدا ترسی بەسـەرچوونی سەردەمی بـازرگانیی ئاژانسی دەنگوباسیـان لێ نیشت. ئەم بـازرگـانیـیـەی بنەمـاکـانی کـۆکـردنەوە و بـڵاوکـردنـەوەی هـەواڵـی دارِشت. ئاژانسـەکـانی دەنگوباس، پێش هـەمـوو شـتـێک، بەرهـەمـهـێنی چیـرۆکی هـەواڵ و هەروەها وێنە و گرافیک و راپۆرتی رادیۆ و ڤیـدیۆ زانیـارییـەکانی ترن بۆ مـیـدیا. بەگـشـتی ئاژانسـەکـانی دەنگوبـاس بەرهـەمـی هەواڵین ئـامـادە دەکـەن بۆ ئەوەی دەزگاکانی تری هەواڵ بەدەسکارییەکی کەمەوە یاخۆ بەبێ دەسکاری بەکاریان بهێنن و دواتر بەدەزگای تری هەواڵ و دەزگای نامیدیاییی وەک وەزارەتەکانی حکوومـەت و

کۆمپانیا و تاک و توێژەوە و هی تریان دەفرۆشنەوە. گواستنەوە بەتێلیگراف و تەلەفۆن و تێلیتایپ و رادیۆ و فۆتۆ و سەتەلایت هەمووی تێکنۆلۆجیای گرانبایی بوون لە کاتی خۆیاندا و پێگەیەکی نایابیان بەئاژانسەکانی دەنگوباس بەخشیبوو. ئاژانسەکانی دەنگوباس دەتوانن هەواڵ و وێنە لە دوورەوە بهێنن تەنانەت بۆ رۆژنامەگەلێکی نێوخۆیی بچووکیش، کە لە نەبوونی ئەو ئاژانسانەدا ناتوانن خۆیان ئەو هەواڵانە پەیدا بکەن. ئینتەرنێت هات و ئەم راستییانەی گۆڕی. بەکارهێنانی ئینتەرنێت و تێکنۆلۆجیاکانی مۆبایل و وێنەی دیجیتاڵ وایان کرد هەر کەسێک لە هەر شوێنێکی ئەم جیهانەدا بتوانێ راستەوخۆ ئیمێڵ یاخۆ SMS یاخۆ وێنە یان تەنانەت ڤیدیۆش بنێرێ. کارەکە سەخت نییە و تێچووەکەی رۆژ بەرۆژ کەمتر دەبێ. بۆیە مۆدیلە سەرەتاییەکەی بازرگانیی ئاژانسی دەنگوباس کەوتە بەر هەڕەشەوە.

ئاژانسەکانی دەنگوباس بەتەنیا و بەکۆمەڵ ئینتەرنێتیان خستە بەر گفتوگۆوە و ستراتیجیان بۆ مامەڵەتکردن لەگەڵیدا داهێنا. لە ١٩٩٩ و لە ئاهەنگی یۆبیلی زێرینی پرێس ترەستی هیندستاندا، مۆنیک ڤیلا، بەڕێوەبەری پەرەپێدان و بازرگانی لە فرانس پرێس، لە بارەی ئینتەرنێتەوە وتی:

"رۆژێک لە رۆژان ژیان سادە بوو بۆ ئەوانەمان کە لە بازرگانیی هەواڵی نێودەوڵەتیدا کاریان دەکرد. بەڵام لە ناکاو ئینتەرنێت هات و ئەو ژیانە سادە و ساکارە لە بۆشاییی سایبەرسپێسدا بزر بوو. ئێمە یەکسەر لامان روون بووەوە کە جیاوازیی نێوان کڕیارە نەرێتییەکان- رۆژنامە و کۆوار و رادیۆ و تەلەفزیۆن- و دەروازە و بڵاوکەرەوەکانی تۆڕدا کە بەمیدیای نوێ دەیانناسێنین، زۆرە."

دوای ئەوەی باسی لە شێوەی مامەڵەتکردنی AFP لەگەڵ ئەم دۆخەدا، ڤیلا وتی:

"بۆ پێشکێشکەرانی نوێ ئینتەرنێت شمشێرێکی دوو لایە. ئێمە ناتوانین لە نێو ئەو تۆڕەدا نەبین و لە هەمان کاتیشدا ناتوانین هەموو ئەوەی دەستمان دەکەوێ ببەخشین. یان ئەو بەرهەمانەمان بەلاوە بنێنێین کە پێمان وایە بڵاوکەرەوەی تری تۆڕەکە درکیان پێ کردووە. بۆیە دەستمان بەسیاسەتی ناردنی بەستەی بەرهەمەکانمان بۆ بڵاوکەرەوەکانی تۆڕەکە بەتایبەتی کرد، بەمەش بەرهەمەکەمان دەگا و خۆشمان بەبێدەنگی دەخزێنینە نێو بازرگانیی ئێلیکترۆنییەوە."

له ساڵی ٢٠٠١دا وۆرکشۆپێک له عەممان کرا له بارەی ئاژانسەکانی دەنگوباس له سەردەمی ئینتەرنێتدا، وۆرکشۆپەکە له لایەن یونسکۆوە رێک خرابوو، نوێنەرانی ١٣ ئاژانسی دەنگوباس له ئەفریقا و ئاسیا و کاریبی و ناوەڕاست و رۆژهەڵاتی ئەوروپا و رۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە تێیدا بەشدار بوون. لەوێدا شارەزایەکی تەکنیک وتی "خاڵە بەهێزەکانی ئاژانسە نیشتمانییەکان بریتین لە زانیارییەکی بەنرخی کەڵەکەبوو و ناوەڕۆکێکی خۆیی بەنرخ. خاڵەکانی لاوازی لە مامەڵەتکردنیان لەگەڵ تێکنۆلۆجیا (سەبارەت بەکەناڵەکانی ئێستای گەیاندن و هتد) و بازاڕاندن (وەک مارکەی لاواز و پێگەی لاواز لە بازاڕدا). هەلیش لە پێشدان وەک فرەوانکردنی بازاڕەکانیان لە رێی بەرهەمهێنانی خزمەتگوزاریی نوێ و گۆڕینی زانیاریی کەڵەکەبوو بەسەرمایە و فرەوانکردنی کەناڵەکانی گەیاندنی خزمەتگوزارییەکانیان. مەترسییەکانیش بریتین لە ململانێی ئاژانسە نێودەوڵەتییەکانی دەنگوباس و دەروازە ناوخۆییەکانی گەیاندن و ئاژانسە ناوخۆییە تایبەت و بازرگانییەکان. وەڵامدانەوەی ئەمانەش بەجێبەجێکردنی سیستمی بەڕێوەبردنی زانیاری و لێکۆڵینەوە و پۆلێنکردن و نرخاندنی زانیاری و فرەوانکردنی کەناڵەکانی گەیاندنی خزمەتگوزاری (دەروازەکانی ئینتەرنێت و تەلەفۆنی مۆبایل) و خزمەتگوزاریی نوێ و نواندنی میدیای فرەجۆر دەبێ". نوێنەری پرێس ترەستی هیندستانیش وتی "زۆر ئاژانس هەیە لە ماوەی یەک سەدەدا ئینجا توانیویەتی ئەو ناوبانگە پەیدا بکا کە هەیەتی لە بوارەکانی بڕوا پێکراوی و وردی و خێراییدا. ئینتەرنێت رێ خۆش دەکا بۆ تازەباوەکان بەماوەیەکی زۆر لەوە کەمتر ببنە مارکە و ناو لە بازاڕدا و ململانێ لەگەڵ یاریزانی دامەزراوی مەیدانەکەدا بکەن".

ئینتەرنێت لە ماوەی چەند ساڵێکی کەمدا توانیی بەلای کەمەوە بۆ هەندێ گەورە ئاژانسی جیهان لە مەترسییەکی زەقی سەر ئاژانسەکانی دەنگوباسەوە ببێ بەچەقی ستراتیجی ئەو ئاژانسانە بۆ گەشەکردن و قازانج. لە هەموو جیهاندا میدیاکانی هەواڵ (رێکخراوەکانی تریش) ماڵپەڕ دادەمەزرێنن و هەواڵ لەو ماڵپەڕانەدا هەن. ئەو هەواڵانە لەوانەیە هی میدیاکانی هەواڵ خۆیان بن یاخود لە ئاژانسەکانی دەنگوباسەوە وەرگیرابن. کاریگەریی تۆڕەکەش زیادکردنی هەردوو سایتی هەواڵ و

سەرچاوەی هەواڵە و ئەمەش دەبێتە مایەی ململانێیەکی چارەنووسساز بۆ ئاژانسە نەریتییەکانی دەنگوباس. بەشێکی هەرە گرینگی ئەم پرۆسەیە خۆی لە کەمکردنەوەی تێچووودا دەبینێتەوە کە ئینتەرنێت بۆ پێشخستنی خزمەتگوزارییەکانی هەواڵ لە تۆڕەکەدا پێشکێشی دەکا. کۆکردنەوەی هەواڵ هەرزانتر دەبێ، هەروەها نووسینەوە و بڵاوکردنەوەشی. گەورەترین مەترسیش ئەوەیە ئاژانسەکانی دەنگوباس لەو سیفەتە دادەماڵرێن کە نزیکەی ١٥٠ ساڵ هەیانبووە، کە بەدرێژایی ئەو ماوەیە "کۆفرۆش" بوون و لەم سەردەمە نوێیەدا دەبن بە"تاکفرۆش". تۆڕەکە شێوازێکی نوێی بڵاوکردنەوە دەخاتە ڕوو و ئاشکرایە کە هەر فۆرمێکی نوێ بێگومان دەکەوێتە ململانێ لەگەڵ فۆرمە کۆنەکاندا. ئەو ئاژانسانەی ڕاستەوخۆ لەسەر تۆڕەکە بەرهەمەکەیان بڵاو دەکەنەوە چیی تر کۆفرۆش نین و بگرە لەگەڵ مۆدیلی بازرگانیی کڕیارەکانیاندا لە ڕووبەڕووبوونەوەدان.

بۆیە بوونی ئاژانسێکی دەنگوباس بەندە بەتوانای ئەو ئاژانسەوە بۆ سەلماندنی ئەوەی دەتوانێ ئەو بەرهەمانە بگەیەنێ کە کڕیارەکان دەیانەوێ و ئامادەن پارەیان پێ بدەن. ئەو کڕیارانەی جاران بەتەواوی پشتیان بەئاژانسەکان دەبەست ئێستا لەسەر لێواری دەریایەکی مەزنی هەموو جۆر و شێوەیەکی زانیاریدا دانیشتوون و تۆڕێکیان بەدەستەوەیە دەتوانن بەهۆیەوە ئەوەی ئارەزووی دەکەن هەڵی بژێرن و ببیەن. لەم ژینگە نوێیەشدا نابێ ئاژانسەکانی دەنگوباس بەترسەوە لە تێکنۆلۆجیا نوێکانی زانیاری بڕوانن، بگرە پێویستە ئاڕاستەکە بگۆڕن و ئەم گۆڕانکارییانە بۆ قازانجی خۆیان بەکاربێنن. لە ڕاستیدا ئینتەرنێت هەموو شتێکی گۆڕیوە و لە هەمان کاتیشدا هیچی نەگۆڕیوە. هەموو شتێکی بەوە گۆڕیوە کە بەهۆی ئینتەرنێتەوە گشت ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و نووسینەوە و گەیاندن و وەرگرتنی زانیاریی گۆڕیوە. لەو ڕووەشەوە هیچی نەگۆڕیوە کە بنەماکانی ڕۆژنامەوانیی باش هەر خۆیانن: ڕوونی، یەکلاکەرەوەیی، بڕوا پێکراوی، ڕاپۆرتدانی ورد، وێنەگرتنی باش، کاری بەهێزی کامێرای تەلەفزیۆن و لە سەرەوەی هەموو ئەمانەشەوە نووسیاری و شیکاریی باش.

کاتێ یەکەمین دەروازەکانی ئینتەرنێت لە پۆڵەندا پەیدا بوون، بەڕێوەبەرانی ئەو

دەروازانە ویستیان خۆیان هەواڵ بەرهەم بهێنن. بۆ ئەم مەبەستەش ژمارەیەکی زۆری ڕۆژنامەوانانیان بەکرێ گرت. بەڵام زۆری نەبرد و بۆیان دەرکەوت کڕینی هەواڵ لە ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی پۆڵەندا PAP بۆ هەردوو لا باشترە.

ئینتەرنێت گەیاندنی جیهانیی زۆر بەهێزتر کرد بەهۆی ئاسانترکردنی بەیەکەوە گونجانی سیستمە تەکنیکییەکانەوە. پرۆتۆکۆلی TCP\IP ستانداردێکی جیهانییە بۆ چوونە ناو تۆڕەوە. هەروەها ئینتەرنێت بووە هۆی داهێنانی چەندین تێکنۆلۆجیا لە بواری گەیاندندا. ئاسانیی گواستنەوەی زانیاری بەهۆی ئەم تێکنۆلۆجیا نوێیەوە کاریگەریی لەسەر بواری وێنەی ڕۆژنامەوانیش هەبووە. وێنەی دیجیتاڵ و گواستنەوەی هەرزان وایان کردووە نووسیار لەسەر مێزی خۆی لە ڕۆژنامەکەیدا بتوانێ هەموو ئەو وێنانەی پێوەندییان بەبابەتەکەی ئەوەوە هەیە ببینێ و تەنیا ئەوەندەی لەسەرە وێنەی گونجاو هەڵبژێرێ و بەکلیکێک بیخاتە سەر ڕۆژنامەکەیەوە.

تەنانەت پێش پەیدابوونی بانکی زانیاریی ئینتەرنێت، بەلای کەمەوە یەک ئاژانس- ئاژانسی دەنگوباسی نەمسا APA کە بۆ ماوەی ٤٠ ساڵ لە ١٩٤٧ەوە تا ١٩٨٧ "نیشانەی سوور"ی هەبوو- لە کاتی خۆیدا قازانجی بەخاوەنەکانی دەدا. APA لە ڕێی دانانی بنکەی زانیاری وەک بەشێک لە بەرهەمە زانیاری ئامێزەکانی خۆیەوە توانای بازرگانیی خۆی گەورە کردەوە، هەروەها بەکۆکردنەوەی ئەم بەرهەمە لەگەڵ خزمەتگوزاریی نەریتیی گەیاندنی هەواڵ لە کاتی خۆیدا. APA سیستەمێکی یەکگیری زانیاریی بەناوی APA ئۆنلاین مەنەجەر داهێنا بۆ کۆکردنەوەی: (أ) خزمەتگوزاریی گشتیی هەواڵ کە خزمەتگوزاریی پاڵنەرە، لەگەڵ (ب) بنکەکانی زانیاری کە خزمەتگوزاریی بکێشە. نوێترین و سەرکەوتووترین بەرهەمی APA لەم ساڵانەی دواییدا بریتییە لە ڕۆژنامەوانیی ئێلیکترۆنی کە تیایدا ناوەڕۆکی ڕۆژنامە لە بنکەی زانیارییەکاندا ئەمبار کراوە و بابەت و وێنە و هەموو شتەکانی تر، تەنانەت ڤیدیۆش، لە شێوە فۆرماتی HTMLدا پێشکێش دەکرێن و دەشتوانرێ لاپەڕەکە بەتەواوی ببینرێ. لە ٢٠٠٣وە APA وێنەی وەشانەکانی تۆڕی رادیۆ و تەلەفزیۆنی نەمسا بەرهەم دێنێ بەوێنە ڤیدیۆییەکانیشەوە کە بەرهەمێکە زۆر بەباشی پێشوازیی لێ کرا.

بەو هەموو دەروازە نوێیەوە کە بۆ خزمەتگوزارییەکانی هەواڵ ڕەخساون، ئەو ئاژانسانەی دەنگوباس کە بەباشی بەڕێوە دەبرێن جەخت دەکەنە سەر چالاکیی خۆیان لە بواری هەواڵدا و بەگەشبینییەوە لە دوارۆژ دەڕوانن.

تۆم کورلی، سەرۆکی نوێ و بەڕێوەبەری کارگێڕیی ئەسۆشیێتد پرێس لە کۆبوونەوەی ٨٢ەی ساڵانەی کۆمەڵەی ڕۆژنامە بڵاوکەرەوەکانی نیویۆرک لە ٢٧ی ئابی ٢٠٠٣ باسی پلانی خۆی کرد و وتی: "ئێمە AP لە خزمەتگوزاریی وایەرەوە، کە ماوەی ١٥٠ ساڵە بەکاری دێنین، بەرەو بنکەیەکی زانیاریی زیندوو و تۆڕێکی هەواڵ کە بەیەکەوە گرێمان بدا، دەبەین. گرێدانەکەش تەنیا لە ڕووی تەکنیکەوە نەبێ بگرە لەوە گرینگتر ئەوەیە کە بازرگانییە گشتییەکەمان بەئامانجە ڕۆژنامەوانییەکانمانەوە گرێ بدەین"، بۆ زیادکردنی داهاتیش کورلی وتی پێویستە AP بوونی خۆی لە دەرەوەی وڵاتدا و خزمەتگوزاریی فۆتۆ فرەوانتر بکا و داهاتی خۆی لە ڕێی ئینتەرنێتەوە زیاتر بکا، لەگەڵ ئەمەشدا توانای خۆپاراستن لە دزی زیاتر بکا دژ بەو کەسانەی بەرهەمەکانی AP بەکار دێنن بەبێ ئەوەی بیانکڕن. خزمەتگوزاریی هەواڵ ئامرازگەلێک دەدا بەڕۆژنامە ئەندامەکان کە بەهۆیانەوە چۆنێتیی بەکارهێنانی بەرهەمەکانی AP ڕێک دەخرێن و توانای چوونە نێو لاپەڕەکانی هەواڵ زیاتر دەکەن، لەم لاپەڕانەدا هەموو جۆرەکانی هەواڵ داپۆشراون هەر لە وەرزشەوە تا بازاڕەکانی دراو. لە لای خۆشیەوە جۆن ڕەید، بەڕێوەبەری خزمەتگوزاری و تێکنۆلۆجیا شەش توخمی ئەسۆشیێتد پرێسی ئێلیکترۆنیی eAP خستە ڕوو کە ئەمانەن:

- eAP Central کۆگایەکی گشتیی بنکەی زانیاریی بۆ هەموو ناوەڕۆکی.
- eAssign سیستەمێکی نوێیە لە نێو APدا بۆ دروستکردن و ڕێکخستن و بەشبەشکردنی ئەرکەکان، بەهۆی ئەم سیستەمەوە دەکرێ بابەتەکان وەکو یەک بخرێنە بەردەستی ئەندامان و کڕیارەکانی تریشەوە.
- eCatigorise ماشینی سۆفتوێرێکە بۆ پۆلێنکردن و دانانی پێڕست و گەڕان بەدوای بابەتدا.
- ePackage بریتییە لەو ئامرازانەی نووسیار بۆ دروستکردنی کۆمەڵە بابەتی میدیا کە بەئاسانی بتوانرێ لاپەڕەی ڕۆژنامە یان ماڵپەڕ یا بەرنامەی تەلەفزیۆنیان لێ

دروست بکرێ.

_ eDistribute ناوەڕۆکی APیە لە ڕێی ئینتەرنێتەوە پێشکێشی دەکا بەشێوەیەک تەواو لەگەڵ سیستمی کڕیارەکاندا یەک بگرێتەوە.

– eSolutions بریتییە لە بەکارهێنانی هەموو پێشکەوتنەکان لە لایەن APوە بۆ پێشکێشکردنی تێکنۆلۆجیا و خزمەتگوزاریی تەکنیکی بەکڕیارەکان.

کەمکردنەوەی بەرچاوی خەرجییەکانی گەیاندن لە ڕێی بەکارهێنانی ئینتەرنێتەوە فەراهەم دەبن. ئەو داهێنانە تێکنۆلۆجیاییانەی لەسەر بنەمای ئینتەرنێت کراون زۆر بەسوودن بۆ کاری ئاژانسەکانی دەنگوباس. بۆ نموونە ئاژانسی dpa ئەڵمانیا تێکنۆلۆجیای VPN، کە تونێڵ لە ناو ئینتەرنێتدا دروست دەکا، بەکار دێنێ. ئەو تونێڵانە گەیەنەری نێوان دوو خاڵن و لە ڕێی کۆدەوە پارێزراون. ئەم تێکنۆلۆجیایە لەسەر ئینتەرنێت کەمکەرەوەیەکی بەرچاوی خەرجییە و لە ساڵی ٢٠٠٢وە لە لایەن dpaوە بۆ بەرهەمهێنانی سایت لە کۆرک (ئایرلاند) و واشنتۆنی پایەتەخت (ئەمەریکا) و بۆینس ئایرس (ئەرجەنتین) و مەدرید (ئیسپانیا) و بانکۆک (تایلاند) و قاهیرە (میسر) بەکار دێ و بووەتە هۆی زیاتر لە ٨٠٪ی کەمکردنەوەکان بەبەراورد لەگەڵ هێڵە ئاساییە بەکرێگیراوەکان.

دوو ڕێ هەن بۆ سوود وەرگرتن لە خزمەتگوزارییەکانی ئینتەرنێت، یەکێکیان ڕێکلامی ئینتەرنێتە و ئەوەی تر وەرگرتنی ئابوونەیە بەرامبەر بەزانیاری و هەواڵ و وێنە. کاری ئاژانسی دەنگوباس کە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەوە توانیویەتی بمێنێ و خۆ بگونجێنێ لەگەڵ تێکنۆلۆجیاکانی گەیاندن، لەو کاتەوە، بەهیچ شێوەیەک مەترسیی نەمانی بەسەرەوە نییە. بەڵام بەردەوام ڕۆڵی ئاژانسەکانی دەنگوباس لە گۆڕاندا دەبێ و بوارەکانی کاریان زیاتر دەبن، لەبەرئەوەی کڕیار وردەوردە ئەو هەواڵ و زانیارییانە دیاری دەکەن کە دەیانەوێ و ئەو ڕێیانەی دیاری دەکەن کە دەخوازن ئەو زانیارییانەیان لێتانەوە پێ بگا. لەم جیهانەدا کە خێرایی و فرەوانیی شەپۆلی زانیاریی تێدا لە زیادبوونی بێ سنووردایە، ئاژانسەکانی دەنگوباس دەتوانن نەک تەنیا گەیەنەری خێرا بن، بگرە جێی بڕوا بن. بەکارهێنانی تێکنۆلۆجیا و گۆڕەپانی نوێ هەلی زۆر مەزن دەڕەخسێنێ بۆ ئەوەی ئاژانسەکانی دەنگوباس

بتوانن دەرگەی نوێ بۆ بەدەستهێنانی داهات لە خۆیان بکەنەوە و کڕیاری نوێ کە پێشتر بوونیان نەبووە بۆ خۆیان بەکێش بکەن. لەگەڵ ئەو زیادبوونە زۆرەی دەروازەکانی گەیاندنی خزمەتگوزارییەکانی هەواڵدا، ئەو ئاژانسانەی بەباشی بەڕێوە دەبرێن و جەخت لەسەر چالاکییەکانی بواری هەواڵ دەکەنەوە، دەتوانن بەگەشبینییەوە بڕواننە دوارۆژ.

# شەشەم

## پێداچوونەوەیەکی بابەتە گرینگەکان

چەند چاخێکە گەیاندنی ڕاستی بناخەی سەرەکیی ڕەوشتەکانی میدیایە. لە هیندستاندا مرۆڤ دەتوانی بگەڕێتەوە سەر ڤیدا دێرینەکان. ئەو کاتە هۆکارەکانی ڕاگەیاندن و ئینتەرنێت نەبوون، بەڵام گەیاندن هەبوو، قسە هەبوو. مرۆڤ دەتوانێ بنەمای ڤیداکان لە ئوپنیشادەکاندا بدۆزیتەوە. لەوێدا فەرمانی وەک: "ڕاستی بێژە" و "نابێ ڕاستی پشتگوێ بخرێ" و "تەنیا ڕاستی سەردەکەوێ". لەم سەردەمەشدا و لە سایەی ئازادیدا ئامانجی ڕاگەیەنراوی میدیا ئاشکراکردنی ڕاستییە و هاوکارییە لە دۆزینەوەی چارەسەر بۆ کێشە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان لە ڕێی خستنەڕووی ئەو بەڵگە و بۆچوونانەی دەشێ بکرێنە بناخە بۆ بڕیارەکان. سیفەتی بنەڕەتیی ئەم پرۆسەیەش ڕزگاربوونە لە کۆنترۆڵ و دەسەڵاتی حکومەت. حکوومەت و بەرپرسەکانی، بێگومان لایەنێکن کە بەرەنجامی هەر ناکۆکییەک کاریان تێ دەکا. بۆیە نابێ ئەوان بەتەنیا ئەو کەناڵانە قۆرخ بکەن کە دەیانگەیەنێتە خەڵک و دەبنە هۆی بڕیاردان. هەروەها نابێ ماف یان دەسەڵاتی دەستوەردانی لە گەیاندنی ویستەکانی ئۆپۆزسیۆندا هەبێ. ئەمەش میدیا دەکاتە دامەزراوەیەکی سیاسی بەوەی دەبێتە هۆکارێک بۆ ڕێگرتن لەوەی حکوومەت سنوورەکانی خۆی ببەزێنێ. هەر وەک تۆماس جیفەرسن دەڵێ، دەبێتە ئەو خاڵی پشکنینە لە ڕێی حکوومەتدا، کە هیچ دامەزراوەیەکی تر ناتوانێ ببێ بەو خاڵە.

هەرچەندە ئاژانسەکانی دەنگوباس لە بنەڕەتدا تەنیا ئەو بازرگانییە بوو کە جوولەکە دەوڵەمەندەکان دایان هێنا و باڵادەستبوون تیایدا، کە توانییان لە ئارەزووی خەڵک بۆ زانینی ڕووداوەکانی دوور و نزیک پارە پەیدا بکەن، بەڵام لە کۆتاییدا بوونە ئامرازی زۆر بەهێز بەدەستی وڵاتان و ئیمپراتۆریاکانەوە. یەکێ لەو پرسە سەرەکییانەی لە سەرەتاوە لە نێو ئاژانسەکانی دەنگوباس سەری هەڵدا پێوەندییان بوو لەگەڵ حکوومەتە خانەخوێکانیاندا. ئەو ئاژانسانەی کە هی حکوومەتن لەلایەن ئاژانسەکانی کەرتی تایبەتەوە ڕەخنەیان لێ دەگیرا و لە نێو ئاژانسەکانی کەرتی تایبەتیش ئەوانەی هاوکاریی حکوومەتیان وەردەگرت دەکەوتنە بەر ڕەخنەوە. ئەسۆشیێتد پرێس کە کۆمپانیایەکی هاوبەشی چەند ڕۆژنامەیەک بوو و یونایتد پرێس ئینتەرناشناڵ کە ئاژانسێکی کەرتی تایبەتە بەردەوام ڕەخنەیان ئاراستەی ئاژانسەکانی ئەورووپا دەکرد، بەتایبەتی ڕۆیتەرز و هاڤاس، لەبەرئەوەی ئەم دووە هاوکارییان لە حکوومەتی وڵاتەکانیان وەردەگرت. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمەشدا، هەموو ئاژانسەکان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ و شاراوە پارەیان لە حکوومەتەکانی وڵاتەکانیان وەرگرتووە و بەشێوەیەک لە شێوەکان بۆ بەرژەوەندیی ئەو حکوومەتانە بەکار هێنراون. بۆ نموونە ڕۆیتەرز و AP هەردووکیان سوودیان لەوە وەرگرت کە حکوومەتەکانیان لە کرێی گەیاندن بەکێبڵ هاوکارییان کردن. کاتێکیش کێنت کووپەر بەڕاشکاوی ڕووبەڕووی ئەم ڕاستییە کرایەوە وتی حکوومەتی ئەمەریکا کاتێ تێچووی هەواڵەکانی AP کەم دەکاتەوە هاوکاریی ڕۆژنامەکان دەکا نەک ئاژانسەکە.

## ئیمپراتۆریاکانی هەواڵ

سەرۆک وەزیرانی بریتانیا، لۆرد پالمەرستۆن، لە ٢٨ی ئاداری ١٨٦١دا، پاوڵ یۆلیۆس ڕۆیتەری، کە لە ١٠ی تشرینی یەکەمی ١٨٥١ دوکانی خۆی لە دوو ژووری ١ ڕۆیاڵ ئێکسچەینج بیلدینگز- لەندەن دامەزراند، پێشکێشی دانیشتنی فەرمیی شاژن ڤیکتۆریا کرد. ئەو پێشکێشکردنە نیشانەی داننانی ئیمپراتۆریای بریتانیا بوو بەدەسەڵاتی هەواڵ. دوای نەمانی ئیمپراتۆریای بریتانیاش حکوومەتی ئەو وڵاتە بەردەوام بوو لە بەکارهێنانی ئەم هێز و دەسەڵاتەی ئاژانسی دەنگوباسی ڕۆیتەرز،

وەک نووسەری فەرمیی مێژووی ئاژانسەکە دۆناڵد رید لە کتێبەکەیدا "هێزی هەواڵ: مێژووی رۆیتەرز" باسی دەکا. نزیکەی سەد ساڵ رۆیتەرز دەزگایەکی نیشتمانی و ئیمپراتۆریایی بوو، ئاژانسی دەنگوباسی ئیمپراتۆریای بریتانیا بوو، رید ئەمە لە پێشەکییەکەیدا دەڵێ. هەروەها دەڵێ پێوەندیی رۆیتەرز لەگەڵ حکوومەتی بریتانیا لە ۱۹٦۰کان و ۱۹۷۰کاندا زۆر لەوە بەهێزتر بوو کە رۆیتەرز دەیویست ئاشکرای بکا و باسی وردەکاریی کۆمەڵێ گفتوگۆ بۆ بەدەستهێنانی هاوکاریی حکوومەت دەکا.

لە ساڵی ۱۹٦۷دا وەزارەتی دەرەوە ساڵانە ۱۲۳٤۸۰ پاوەنی بەرۆیتەرز دەدا لە جیاتی بەشەکانی ئەودیوی ئۆقیانووس و ٤۰۰ هەزار پاون لە بری نووسینگەی ناوەندیی زانیاری دەدا و لە ساڵی ۱۹۷٥دا ئەم دوو بڕە پارە ساڵانەیە بووبوونە ۲۳۹ هەزار و ۳۸۷ هەزار پاون.

پێوەندییەکانی رۆیتەرز لەگەڵ ئاژانسی دەنگوباسی عارەب ANA کە بەهۆی ئابوونەیەکی زۆری بەشی تۆژینەوەی زانیاری لە وەزارەتی دەرەوە و BBC پارەدار دەکرا بابەتێکی تری سەرنجڕاکێش بوو. ئەم ئاژانسە لە ۱۹٥٤وە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەواڵی بۆ رۆیتەرز کۆ دەکردەوە و بڵاو دەکردەوە. دوایی لە ۱۹٦۳ ناوی ئەم ئاژانسە گۆڕا و لە ۱۹٦۸دا بۆ شاردنەوەی پێوەندیی لەگەڵ رۆیتەرزدا و دۆزینەوەی پاساوێک بۆ ئەو پارەیەی بەرۆیتەرزی دەدا، مانۆڕێک کرا و تیایدا ئاژانسەکە کرایە بەشێک لە خزمەتگوزاریی دەرەوەی BBC و دەبوو ئەم پارە بەرۆیتەرز بدا، بۆیە لە ۱۹٦۸دا ۲۰ هەزار پاون و لە ۱۹٦۹ و ۱۹۷۰دا ۸۰ هەزار و لە ۱۹۷۱دا ۹۰ هەزار و لە ۱۹۷۲ سەد هەزاری بەرۆیتەرز دا. لە ساڵی ۱۹۸۰ش BBC بەتەواوی دەستبەرداری ئەم گرێبەستە بوو. ئەو کاتە پارە ساڵانەکە بووبووە ۲٥۰ هەزار پاوەن. بەهەمان شێوەش بۆ بەدزییەوە پارەدان بەرۆیتەرز حکوومەتی بریتانیا لە ۱۹٦٤دا خزمەتگوزاریی هەواڵی هەرێمیی ئەمەریکای لاتین داهێنرا و لە ۱۹٦٤ تا ۱۹۷۱ ساڵانە ۲٥ تا ۳۰ هەزار پاوەنی بەرۆیتەرز دەدا. هەروەها پێوەندیی رۆیتەرز لەگەڵ ئاژانسی لاتینۆ ئەمەریکانا Latin دەچێتە ناو هەمان چوارچێوەوە.

## گرینگی

گرینگیی ئاژانسەکانی دەنگوباس تەنانەت پێش ئەوەی نووسین و کتێبیان لەسەر هەبێ ئاشکرا بووە. بەڵگەیەک کە لە کانوونی یەکەمی ١٩٣٨دا بڵاو کراوەتەوە بۆ ئەوەی لۆجیک لە ئاژانسی EFEی ئیسپانیا ببەخشێ هەندێ سەرنجی شایانی تێدایە. "باشترین تەکنیکی پرۆپاگاندا لە ڕێی هەواڵەوەیە، هەواڵ وەک ئامرازێکی پرۆپاگاندا زۆر بەهێزترە لە وتارێکی باش یان بابەتێک کە ئیمزای نووسەرێکی لەسەر بێ. هەواڵ ڕاستی دەردەبڕێ و لە ڕێی تاوتوێکردنی ئەو ڕاستییە بەچەندین لێکدانەوەی جیاواز سەبارەت بە واتاکانی و گرینگی و هۆکارەکانیەوە خەڵکی پێ قایل دەکرێ. بۆیە وڵاتان شەڕیان لەسەر باڵادەستی لە هەواڵدا کردووە و شەڕی هەواڵیش لە ڕێی ئاژانسەکانی دەنگوباسەوە دەکرێ. بۆیە ئاژانسی دەنگوباس هیچی نە کەمترە و نە زیاترە لە هەر ئامرازێکی تری سیاسیی وڵات".

زۆر پێش ئەمەش، لە ١٨٦٩دا بسمارک هەوڵی ڕۆیتەرزی بۆ کڕینی ئاژانسی ڤولف لەبار برد. هەر لەو ساڵەدا حکوومەتی پرووسیا ڕێککەوتنێکی نهێنیی لەگەڵ نووسینگەی ڤولفدا مۆر کرد و بەپێی ئەو ڕێککەوتنە پارە و ئاسانکاریی بەکارهێنانی تێلیگرامی پێشکێشی ئاژانسەکە کرد بەرامبەر ڕێگەدان بەکۆنترۆڵکردنی هەواڵی هاوردە و دەرکردەی ئاژانسەکە لە لایەن حکوومەتەوە.

## گەمەکردن بەهەواڵ

لە سەرەتای ١٩٧٦دا هەندێ قسە کە لە کۆمیتەی تایبەت بەچالاکییە هەواڵگرییەکان لە کۆنگرێسی ئەمەریکاوە دەرچوون. ویلیەم کۆڵبی، کە بەڕێوەبەری CIA بوو و لەسەر کار لادەچوو، لە بەردەم کۆمیتەکەدا وتبووی ژمارەیەک لە هەواڵنێرانی ڕۆیتەرز بەداخڵکردنی هەواڵ کاریان بۆ CIA کردووە. هەروەها لە ١٩٨١دا لە پرۆگرامێکی BBCسەبارەت بە هەواڵگریی نێودەوڵەتییەوە، کۆنە بەرپرسێکی CIA باسی لەوە کرد کە زۆربەی هاوڕێیانی پێیان وایە کارێکی سەختە ڕۆژنامەوانێکی ڕۆیتەرزت دەست کەوێ کە بەشێوەیەک لە شێوەکان سەر بەهەواڵگریی بریتانیا نەبێ.

بێگومان ئەمە نوێ نییە. کێنت کووپەر لە ژینامەکەیدا باسی ئەوە دەکا چۆن ئەسۆشیێتد پرێس لە لایەن حکوومەتی ئەمەریکاوە بەکار هێنراوە. "سەرۆک ویلسن و وەزیری دەرەوە لانسینگ هەواڵێکیان بە AP دا گوایە تایبەتە بەئاژانسەکە، لە ڕاستیشدا هەواڵەکە تەنیا پرۆپاگاندا بوو. نامەیەکی مۆرسداری ئەڵمانەکان کەوتبووە بەر دەستی هەواڵگریی بریتانیاوە و ئەوانیش بەسەرۆک ولسنیان دابوو. نامەکە داوا لە مەکسیک دەکا هەوڵی بەدەستهێنانی پشتگیری و هاوکاریی سەربازیی ژاپۆن بدا بۆ ئەنجامدانی هێرشێکی مەکسیکی-ژاپۆنی بەسەر باشووری ڕۆژئاوای ئەمەریکادا لەو کاتەدا کە ئەمەریکا سەرقاڵی هێرشکردنە سەر ئەڵمانیا دەبێ. دوای چەندین ساڵ لانسینگ لە یادەوەرییەکانیدا دەڵێ کە ئەو و ویلسن بەنهێنی پلانیان هەبوو بۆ ئەوەی بەتەنیا AP بەکار بهێنن بۆ هاندانی خەڵک بۆ ئەوەی داوای ڕاگەیاندنی شەڕیان لێ بکەن. ئەم پێشنیازە ساردوسڕەی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەڵمانیا تەنیا لە یەک ڕۆژدا توانیی ڕای گشتی بگۆڕی، کە ئەو کاری بەهەر هۆکارێکی تر بکرایە چەند مانگێکی دەویست. هەر لەگەڵ بڵاوکردنەوەی نامەکەدا چوونە ناو شەڕ لە لایەن ئەمەریکاوە مسۆگەر بوو و گشت ئەمەریکاییەکان لە ماینەوە بۆ کالیفۆرنیا و لە میشیگانەوە بۆ تێکساس داوای ئەوەیان دەکرد". کووپەر لەسەر ئەم مەسەلەیە دەڵێ "من هەرگیز لەو بڕوایەدا نەبووم حکوومەتی ئەمەریکا بەنهێنی پلان دارێژێ بۆ چاندنی پرۆپاگاندا لە هەواڵەکان و لێرەدا. بەڵام من هەڵە بووم.

## شەڕ لە ڕێی میدیاوە

لە ڕاستیدا بەکارهێنانی هۆکارەکانی ڕاگەیاندن وەک چەکێکی تری شەڕ، لە سەردەمی شەڕی یەکەمی جیهاندا کاریگەریی خۆی سەلماند و ئەو کاریگەرییە لە سەردەمی شەڕی دووەمی جیهاندا گەیشتە ئاستێکی تەواو بەرز. بەکارهێنانی رادیۆ بەتایبەتی و ئاژانسەکانی دەنگوباس بۆ ڕێکخستنی هەواڵەکان لە ماوەی شەڕی دووەمی جیهاندا زۆر کاریگەر بوو. وشەی پرۆپاگاندا لەو کاتەوە ئەو واتا نەرێنییەی ئێستای بەدەست هێنا و وشەکە پێشتر ئەرێنی بوو.

ئێستا شەڕ لە ڕێی میدیاوە بەشەڕێکی سووکتر دەژمێردرێ شانبەشانی تێکدانی

دەروونی و وێرانکاری و لادان. تیۆریستەکانی پرۆپاگاندا دەڵێن پێویستە مرۆڤ بەئامانجی یەکەمی شەڕی سیاسی بژمێردرێ و وەک ئامانجێکی سەربازیی شەڕی گەریلا گرینگترین خاڵ لە مرۆڤدا بیریەتی. بۆیە هەر کاتێ توانیت دزە بۆ ناو بیر و مێشکی بکەی، ئەو "ئاژەڵە سیاسییە" دەبەزێ بێ ئەوەی پێویست بکا فیشەکی پێوە بنێی.

بەکارهێنانی پرۆپاگاندا و شاردنەوەی زانیارییەکان لە شەڕی کەنداودا بەربڵاو و کاریگەر بوو لە بەدیهێنانی ئامانجەکاندا. هێزە هاوپەیمانەکان سەرکەوتوو بوون لە پێشاندانی ئەو شەڕە وەک شەڕێکی "پاک" کە تیایدا بەکارهێنانی تێکنۆلۆجیای نوێ بووە هۆی ئەوەی قوربانییە مرۆییەکان ئەوەندە کەم بن شایانی باس نەبن. بەڵام لە ڕاستیدا نزیکەی سەد هەزار سەربازی عێراقی و ژمارەیەکی نادیاری هاووڵاتیی سیڤیل لەو شەڕەدا کوژران، بەڵام میدیاکان زۆر بەکەمی لایەنە شاراوەکانی شەڕەکەیان داپۆشی. لە شەڕی کەنداودا میدیا شتی تری دادەپۆشی. لەو شەڕەدا وەک ڕێکلامکەر بۆ چەکە نوێکان کاری دەکرد. ڕێکلام بۆ مووشەکی پاتریۆت کرا و دواتر بەکۆریای باشوور فرۆشرا کە ئەوەندە پارەی هەبوو بتوانێ سیستمی نوێی ئەو مووشەکانە دامەزرێنێ.

شەڕی هەواڵ و پرۆپاگاندای کۆسۆڤۆ، بەڵاڤۆکێکە پەیمانگەی نێودەوڵەتیی ڕۆژنامەوانی لە ڤیەننا لە ئەیلوولی ١٩٩٩دا بڵاوی کردەوە. ئەو بەڵاڤۆکە نموونەی زۆر لەخۆ دەگرێ: لە ٢٩ی ئاداری ١٩٩٩دا ناتۆ ڕایگەیاند کە هێزەکانی سرب فەهمی ئاغانی و چوار کەسی تری ناسراوی ئەلبانەکانی کۆسۆڤۆیان کوشتووە. فەرماندەی هێزی ئاسمانی ویلبی وتی سەرچاوەیەکی بڕوا پێکراو لە کۆسۆڤۆوە ئەو هەواڵەی پێیان ڕاگەیاندووە. دوایی هەواڵەکە درۆ دەرچوو و سەرچاوە بڕوا پێکراوەکەش نووسینگەی زانیاریی کۆسۆڤۆ بوو کە بارەگاکەی لە لەندەنە و کۆسۆڤییەکانی دوورەوڵات بەڕێوەی دەبەن. هەروەها بەبێ هیچ بنەمایەک ڕایان گەیاند کە خانووەکەی ئیبراهیم ڕۆگۆڤا سووتێنراوە و خۆی لەوێ بووە و زۆر هەواڵی تر کە هیچیان ڕاست نەبوون. ئەم هەواڵانە هەرچەندە ڕاست نەبوون بەڵام لە ڕاگەیاندندا بایەخی زۆریان پێ درا و بوونە هۆی بەهێزکردنی یەکگرتوویی هێزە

هاوپەیمانەکـان. هەروەها هـاوپەیمانـان ئەو هەواڵانەیـان وەک پاسـاو بەکـارهێنـا بۆ قایلکردنی خەڵکی ناڕازی بەڕەواییی ئەو بۆمببارانەی ئەنجامیان دەدا. بەرپرسەکان بەردەوام دەیانگوت "شـەڕی ئێمە دژ بەگەلی یۆگۆسـلاف نییە" بەڵام ئەو بۆمبباراننە بوونە هۆی کوشتنی ٢٠٠٠ سڤیل و بریندارکردنی ٦٠٠٠ و ڕووخاندنی ٣٠٠ کارگە و ٢٠٠ قوتابخانە و کۆلیج و ٢٠ نەخۆشخانە و ٣٠ عیادە و ٦٠ پرد و پێنج باڵەفڕگە.

ڕاستییەکە ئەوەیە کە لە هەموو سیستمەکاندا دەسەڵاتداران میدیا بۆ بەدیهێنانی ئامـانجەکانیـان بەکار دێنن. لەم کێبەرکێیـەشدا حکوومـەتەکان دوانەکـەوتوون و دیموکـراسـییـەکـانی ڕۆژئاوا لەمـە بەدەر نـین. سـەبـارەت بەمـیـدیا جـیـاوازیی نێـوان دیموکـراسـییـەکـانی ڕۆژئاوا لە لایەک و ڕژێمـە تۆتالیـتـار و سـۆسـیـالیسـتـەکـان لە لایەکەی تردا تەنیا لە جۆری بەکارهێنان و کۆنترۆڵی ڕاستەوخۆی میدیاکاندایە.

پرسەکانی یاسای نوێی زانیاری و گەیاندنی جیهان NWICO

لە گفتوگۆ نێودەوڵەتییەکان سەبارەت بە یاسای نوێی زانیاری و گەیاندنی جیهاندا NWICO زۆر پرس سـەریان هـەڵدا و لە ١٩٧٠کـان و ١٩٨٠کـانـدا بەزۆری جـەخت لەسـەر ئاژانسـەکـانی دەنگوباس دەکـرا. ڕاگـەیاندنی دێلهی کـە لە ١٢ی تەمـووزی ١٩٧٦ لە دانیشـتنی کۆنفرانسی وەزاریی وڵاتانی بێلایەندا لە بارەی پوولی (کۆگەی) ئاژانسەکانی دەنگوباس پەسەند کرا، ئەم پرسانەی خستە ڕوو:

١- ئەو زانیـارییانەی ئێسـتا لە جیـهاندا ئاڵوگۆڕ دەکرین نەگونجاو و ناهاوسـەنگن. هۆکـارەکـانی گـەیاندنـی زانیـاری بـەدەسـتی چـەند وڵاتێکی کـەمـەوەن. زۆربەی وڵاتانیش بوونەتـە تەنیـا وەرگرێکی نەرێنیی ئەو زانیـارییـانـەی چەند سـەنتـەرێکی دیاریکراو بڵاویان دەکەنەوە.

٢- ئەم دۆخە زیندووکەرەوەی سەردەمی کۆلۆنیالیزمە بەهەردوو چەمکی پاشکۆیەتی و باڵادەسـتـییـەوە. بڕیار لەسـەر چی پێـویسـتـە بزانرێ بەدەسـتی ژمـارەیەکی دیاریکراوەوەیە.

٣- بڵاوکـردنەوەی زانیـاری لەلایەن چەند ئـاژانسـێکەوەیە کـە لە چەند وڵاتێکی پێشکەوتوون و خەڵکی تری ئەم جیهانەش ناچارن ئەوانی تر و تەنانەت خۆشیان لە ڕێی ئەم ئاژانسانەوە ببینن.

٤- هەر وەک چۆن پاشکۆیی سیاسی و ئابووری لە پاشماوەکانی سەردەمی کۆلۆنیالیزمن، هەمان ئەم شتە بۆ بواری زانیاریش گونجاوە چونکە دەبێتە ڕێگر لە بەردەم گەشەکردنی سیاسی و ئابووریدا.

٥- لە کەشێکدا کە هۆکارەکانی زانیاری لەلایەن ژمارەیەکی کەمەوە دەستیان بەسەردا گیرابێ و مۆنۆپۆل کرابن، ئازادیی زانیاری بەواتای ئازادیی ئەو کەمینەیە دێ لە بڵاوکردنەوەی زانیاری بەو شێوەیەی ئەوان دەیانەوێ و بێبەشکردنی ئەوانی تر لە مافی زانیاری گەیاندن و زانیاری وەرگرتن بەشێوەیەکی بابەتییانە و بەوردی.

٦- وڵاتانی بێلایەن بەتایبەتی قوربانیی ئەم دیاردەیەن. هەوڵەکانیان، چ بەتەنیا یان بەکۆمەڵ، بۆ ئاشتی و دادوەری لە جیهاندا و دامەزراندنی یاسایەکی دادوەرانەی ئابووری بۆ جیهان لاواز کران یاخۆ بەباشی پێشکێش نەکران لە لایەن میدیای هەواڵی جیهانەوە. هەوڵ درا یەکیەتیان لەناو ببرێ. هەوڵەکانیان بۆ پاراستنی سەربەخۆیی سیاسی و ئابووریيان و سەقامگیرییان ناشیرین کران.

٧- وڵاتانی بێلایەن هۆکاری کەمیان بەدەستەوەیە بۆ ئەوەی زانیارییان لەسەر یەکتر هەبێ و ئەو زانیارییانەش کە هەن تەنیا لە ڕێی میدیاکانی هەواڵ و سەنتەرەکانی هەواڵی جیهانەوەن لەبەرئەوەی میدیاکانی خۆیان لەبەر نەبوونی، هێشتا ئەو توانایەیان نییە.

ئەمڕۆ کەس باسی یاسای نوێی ئابووریی جیهان و NWICO ناکا، بەڵام زۆربەی ئەو پرسانەی لە سەرەوەدا باس کراون تا ئێستاش بەردەوامن هەرچەندە سیاسەتی جیهانی گۆڕاوە و جیهان پێشکەوتنی زۆر مەزنی لە بواری تێکنۆلۆجیای گەیاندنەوە بەخۆوە دیوە. ئینتەرنێتیش توانیویەتی تا ڕادەیەکی زۆر کێشەی نەبوونی لە ڕێی کەمیی خەرجییەوە بۆ وڵاتانی هەژار چارەسەر بکا.

## پرسەکانی دوای شەڕی دووەمی جیهان

پەیمانگەی ڕۆژنامەوانیی جیهانی- ڤیەننا، مێزگەڕێکی لە بارەی "ئاژانسەکانی دەنگوباس لە گۆڕاندا" لە وارشۆ لە ٢٩ تا ٣١ی ئابی ١٩٩٦دا ساز کرد. ئەو

ڕاگەیاندنەی لەو کۆبوونەوەیە دەرکرا پرسە سەرەکییەکانی بەم شێوەیە دیاری کرد:

١- هەموو کەسێ مافی گەیشتنی ئازادانەی بەو زانیارییانە هەیە کە پێویستن بۆ پراکتیزەکردنی ماف و ئەرکەکانی وەک هاوولاتی. هیچ یاسا و ڕێسایەکیش نابێ ئەم مافە سنووردار بکا.

٢- پێویستە ئاژانسەکانی دەنگوباس مافی کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی ئازادانەی زانیارییان هەبێ. لەم بوارەشدا هیچ سانسۆرێکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ قبوول ناکرێ و نابێ هیچ دەسەلاتێکی حکوومەت لە هەر ئاستێکدا بێ، یان دەسەلاتی ئابووری یا هەر گرووپێکی تری خاوەن بەرژەوەندی دەست لە ناوەڕۆکی هەواڵ وەردا یاخۆ ڕێگر بێ لە گەیشتن بەسەرچاوەی هەواڵ.

٣- هاتوچۆی ئازادانەی زانیاری لە نێوان ئاژانسەکانی دەنگوباس و دامەزراوەکانی تری میدیا پێویستە بۆیان بۆ ئەوەی بتوانن خەڵک لە ڕاستییەکان ئاگەدار بکەنەوە. واتە پێویستە ئەوان کار بکەن بەبێ ترس لە تۆڵەسەندنەوە و سانسۆر.

٤- هەموو ئەو ئاژانسانەی دەنگوباس کە لە یەک ولاتدا کار دەکەن، بەبێ گوێدان بەشێوە و خاوەندارییان، دەبێ وەکو یەک مافی کۆکردنەوە و وەرگرتن و بڵاوکردنەوەی زانیارییان هەبێ هەروەها مافی بەکارهێنان و کارکردن بەو دەزگا و ئامرازانەی بۆ کارەکەیان پێویستن.

٥- نابێ هیچ ولاتێک ڕێ لە چالاکییەکانی کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی زانیاری بگرێ لە لایەن ئاژانسەکانی دەنگوباسی بیانی یان هەواڵنێرانی ئەو ئاژانسانەوە. دەبێ ئەوان لە کاتی خۆی و بەئازادی بگەنە سەرچاوەی هەواڵ و شوێنی ڕووداو.

٦- ئەو ئاژانسانەی موڵکی دەوڵەتن پێویستە ئازادیی تەواوی ڕۆژنامەوانییان هەبێ. هەر ڕێنوێنییەک بۆ کاری ڕۆژنامەوانانەیان پێویستە لەلایەن ڕۆژنامەوانان خۆیانەوە دەرچێ و تەنیا دەزگاکانی میدیای هەواڵ جێبەجێیان بکەن، بەبێ دەستوەردانی حکوومەت و لایەنە سیاسییەکان و لایەنە خاوەن بەرژەوەندییەکانی تر.

٧- نە نوێنەرانی حکوومەت نە هیچ دەسەلاتێکی دەوڵەت نابێ ڕێی بدرێتێ هیچ حوکمێکی فەرمی بەسەر کاری ڕۆژنامەوانیی هیچ ئاژانسێکدا بسەپێنێ.

٨- نابێ هیچ ئاژانسێک یان ڕۆژنامەوانەکانی بەهۆی ئەوەی دەینووسن یان دەیڵێن ببرێنە پێش لێپرسینەوەیان دژایەتی بکرێن.

٩- دەبێ ڕۆژنامەوانانی ئاژانسەکانی دەنگوباس ئازادانە بگەنە سەرچاوە فەرمی و نافەرمییەکانی هەواڵ و بتوانن ئەو زانیاریانە ڕەت بکەنەوە کە بەسەریاندا دەسەپێنرێن.

١٠- نابێ دەسەڵات هیچ کۆت و بەندێکی یاسایی یان تەکنیکی یان باج بسەپێنێ کە ببێتە ڕێگر لە ئاڵوگۆڕی ئازادانەی زانیاری و بڵاوکردنەوەی هەواڵ. هەروەها ئاژانسەکانی دەنگوباس دەبێ مافی تەواوی هێنان و ناردنە دەرەوەی ئەو کەلوپەلانەیان هەبێ کە بۆ کاری پیشەییی ئەوان پێویستن و هاوکاریان دەبن لە کۆکردنەوە و ناردنی زانیاریدا. ڕۆژنامەوان دەبێ لە کاتی خۆی و بێ دواخستن بەهۆی کارە سەخڵەتکەرە ئیدارییەکان و کۆتوبەندی ترەوە ڤیزا و پشتگیریی بدرێتێ.

## یەکێ بەرامبەر بەزۆرێک

پرسیارێکی تر هەیە کە قوت دەکرێتەوە ئەویش ئەوەیە ئایا دەبێ وڵاتێک زیاتر لە یەک ئاژانسی دەنگوباسی هەبێ؟ لە هیندستاندا بڕیاری لەتکردنی ساماچار بۆ چوار ئاژانسی کێبەرکێکەر ڕووبەڕووی ڕەخنە بووەوە. لەو کاتەدا لە هەموو جیهاندا تەنیا لە یەک وڵاتدا بەڕاستی دوو ئاژانسی هەبوون کێبەرکێیان دەکرد. ئەو وڵاتەش ئەمەریکایە. ئەو دیاردەیەش بە شتێکی تیۆری دەژمێردرا. کاتێکیش لە حوزەیرانی ١٩٨٢ دۆگلاس رووە و ویلیەم گیسلەر بوونە خاوەی یونایتد پرێس ئینتەرناشناڵ ئەم دۆخە کۆتاییی پێ هات.

## پرسەکانی پێوەندییە گشتییەکان

لە کاتی هەوڵدان بۆ زیادکردنی جۆرەکانی سەرچاوەکانی داهاتدا، زۆر لە ئاژانسەکانی دەنگوباس نەک تەنیا بۆ حکوومەت، بگرە بۆ کۆمپانیا تایبەتەکانیش کاریان کردووە لە ڕێی پێوەندییە گشتییەکان و خزمەتگوزارییەکانی ڕاگەیاندنە ڕۆژنامەوانییەکانەوە. بۆ نموونە پرێس ئەسۆشیەیشنی بریتانیا لە لایەن تۆڕی

هەواڵی حکوومـەتەوە هەڵبـژێردرا بۆ ئەوەی ساڵانە زیاتر لە ٦٠٠٠ ڕاگـەیاندنی وەزارەتەکانی حکوومەت و ئاژانسە فەرمییەکان و خێزانی شاهانە بگەیەنێ.

بەمەبەستی ڕێکخستنی خزمەتگوزارییەکانی پێوەندییە گشتییەکان و دەرخستنی مۆرکی میدیایی بەسەریانەوە، پێڕۆیەک هەیە بۆ هاوکاریی میدیایی. ئەم پێڕۆیە کۆمەڵی پرەنسیپ لەخۆ دەگرێ و لە تەمووزی ٢٠٠٤دا شەش ڕێکخراوی جیهانی پشتگیریی خۆیان بۆ ئەم پرنسیپانە ڕاگەیاند: پەیمانگەی نێودەوڵەتیی ڕۆژنامەوانی، فیدراسیۆنی نێودەوڵەتیی ڕۆژنامەوانان، ترانسپەیرنسی ئینتەرناشناڵ، هاوپەیمانیی نێودەوڵەتیی ڕێکخستنی پێوەندییە گشتییەکان و گەیاندن و کۆمەڵەی نێودەوڵەتیی پێوەندییە گشتییەکان. پرەنسیپەکانیش ئەمانەن:

- دەبێ بابەتی هەواڵ بەرهەمی حوکمی ڕۆژنامەوان و نووسیار بێ لەسەر هەواڵ نەک بەری بەخشینی پارە یان شتی تر بێ.
- ئەو بابەتەی بەپارە بڵاو دەکرێتەوە دەبێ دیار بێ و بەئاشکرا بوترێ ئەمە ڕێکلامە و پارەی دراوە.
- نابێ هیچ ڕۆژنامەوانێک یان نوێنەرێکی میدیا بڕیاری داپۆشینی هەواڵ بدا لەسەر بنەمای تر جگە لەوەی بابەتەکە شیاوی داپۆشینە.
- کاتێ پێویست بێ ڕۆژنامەوان بۆ پشتگیریی بۆچوونێکی بابەتییانە نموونە یان بەشێ لە بەرهەم یان خزمەتگوزارییەک پێشان بدا، دەبێ پێشتر ماوەکەی دیاری بکرێ و لە کاتی خۆیدا ئەو نموونەیە بگەڕێنێتەوە.
- دەبێ میدیا سیاسەتی نووسراوی هەبێ سەبارەت بەوەرگرتنی بەخشین و بەرهەمی هەرزانتر لە نرخی خۆی و دەبێ داوا لە ڕۆژنامەوانان بکرێ ئەو نووسراوە ئیمزا بکەن.

کاتێ زۆر لە ئاژانسەکانی دەنگوباس بەشدار دەبن لە چالاکییەکانی پێوەندیی گشتیی جیهانیدا، پێویستە ئەو پرسانەیان لە بیر بێ کە پێوەستن بەم بوارەی گەیاندنەوە.

## خاڵەکەی پوتین

وەسفی جیاوازی باری وێکچوو لە بەشە جیاجیاکانی جیهاندا پرسێکی گرینگە. ڤلادیمێر پوتینی سەرۆکی ڕووسیا ئەم بابەتەی لە کاتی کردنەوەی کۆنگرەی جیهانیی ئاژانسەکانی دەنگوباسدا وروژاند، کە تیایدا نوێنەرانی زیاتر لە سەد ئاژانسی دەنگوباسی جیهان کۆ بووبوونەوە: "بۆ نموونە وشەی تیرۆریزم. سەرچاوەی ئەم وشەیە لاتینییە. واتاکەشی لە هەموو ئەو فەرهەنگانەدا کە من دیومە بەیەک دەچێ. تیرۆریست ئەو کەسەیە کە پەنا دەباتە بەر کاری ترساندن بۆ ئەوەی نەیارە سیاسییەکانی لە ڕێی هێزەوە دەستەمۆ بکا، فەرهەنگە ئینگلیزی و فرانسەیی و ڕووسیاییەکان واتای هاوشێوەیان بەوشەکە بەخشیوە. ئەدی بۆ ئێمە وشەکە بەئارەزووی خۆمان بەکاردێنین لە کاتی قسەکردنمان لە بارەی گرووپێکی دیاریکراوەوە و لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر دەیگۆڕین؟ چۆن مرۆڤ دەتوانێ بەو تراجیدیا تۆقێنەرەی بێسلان و ئیعدامکردنی منداڵانی بێتاوان بڵێ "گەمارۆ" وەک ئەوەی هەندێ میدیا وتیان؟ بەڕێکەوتیش ئەمە بەشێکە لە وەڵامی پرسیارێک لە بارەی چ جۆرە داپۆشینێکی ڕووداو لە وڵاتی ئێمەدا پێشکێش دەکرێ. وەک دەزانن ئێمە گفتوگۆی تیرۆریستەکانمان کە بەهۆی سیستمی تەلەفۆنی ناوخۆییەوە ئەنجامیان دابوو، تۆمار کردووە. ئێمە دەزانین چییان بەیەک دەوت و چۆن. تەنانەت دڕندەی کێویش شتی لەو جۆرە ناکا. ئینجا هەندێ هەواڵدەر بەو کردەوەیەیان وت گەمارۆ و ئەوانە ئەم تاوانەیان بەیاخی ناو برد. ئەگەر ئەمە ڕێگەی کەسێک بێ بۆ گەیشتن بەکۆتایی سیاسی ئەوە دەبێ هەموو کەسێک بەهەمان شێوە پێناسەی کەسی وا بکا – پیاوکوژ و تیرۆریست".

ڕۆیتەرز لە وەڵامی پرسیارێک لە بەشی پرسیاری ئازادی سایتەکەیدا لە وەڵامی پرسیاری "بۆ تیرۆریست بەتیرۆریست وەسف ناکەن؟" دەڵێ: "ئەمە بەشێکە لە سیاسەتێکی چەسپاوی ئێمە بۆ بەکارنەهێنانی وشەی سۆزئامێز، ئێمە وشەی وەک "تیرۆریست" و "جەنگاوەری ئازادیخواز" بەکارناهێنین مەگەر لە گواستنەوەی ڕاستەوخۆی قسەی یەکێک بگوێزینەوە یان لە ناو قسەیەکدا بێ کە بشێ بدرێتە پاڵ لایەنێکی سێیەمەوە. ئێمە بابەتەکانی چیرۆکی هەواڵەکانمان بەرجەستە ناکەین بگرە

ئێـمـە باسی کـردەوەکـانیـان دەکـەین لەگـەڵ ناسنامـە و باکگراوندیان بـۆ ئەوەی خوێنەران خۆیان بڕیاری خۆیان بەگوێرەی ڕاستییەکان بدەن".

# حەفتەم

## پرۆفایلگەل

لە جیهانی ئەمڕۆدا ژمارەیەکی زۆر ئاژانسی دەنگوباس هەن و ناکرێ لێرەدا لەبەر نەبوونی بوار بەدرێژی باسی هەر یەکێکیان بکەین. بۆیە ئەمەی بەردەست پرۆفایلگەلێکی کورتن بۆ دروستکردنی وێنەیەکی گشتی. ئاژانسەکانی هیندستان لە بەشێکی تردا داپۆشراون بۆیە لێرەدا باس ناکرێن. گەورە ئاژانسە نێودەوڵەتییەکانیش بەگشتی لە شوێنی تر و لە نێو بابەتی تردا باس کراون، بۆیە لێرە زۆر بەخێرایی بەسەریاندا تێ دەپەڕین. هەروەها لێرەدا هەندێ ڕێککەوتنی ئاڵوگۆڕ و هەوڵی هاوبەش بەر چاو دەکەون، هەرچەندە هەموویان نین.

### ئاژانسی ئەنادۆڵ AA

ئاژانسی ئەنادۆڵ AA لە ٦ی نیسانی ١٩٢٠ لە لایەن مستەفا کەمال ئەتاتورک، دامەزرێنی کۆماری مۆدێرنی تورکیاوە دامەزرا و گەورەترین ئاژانسی دەنگوباسی تورکیایە. لە ساڵی ١٩٢٥ ئاژانسی ئەنادۆڵ گۆڕانکاریی پێکهاتەییی بەخۆوە دی و بوو بەکۆمپانیا. ڕۆژانە بەهۆی ٢٨ نووسینگەی هەرێمیی ناو وڵات و ٢٢ نووسینگە لە وڵاتانی تردا، AA نزیکەی ٧٠٠-٨٠٠ چیرۆکی هەواڵ و ٢٠٠ وێنەی فۆتۆگراف لە بارەی پێشهاتەکانی تورکیا و جیهانەوە بەشێوەیەکی خێرا و یەکسەر دەگەیەنێتە هاوبەشەکانی خۆی. هەروەها AA هەواڵ لەگەڵ زیاتر لە ٨٠ ئاژانسی نیشتمانی و

نێـودەوڵەتیـدا ئاڵوگـۆڕ دەکـا و سـەرچاوەی بنەڕەتی و هەرەگـرینگی هەواڵە بۆ دەزگـاکـانی ڕۆژنامـەوانی و مـیـدیا لە تورکـیـادا. چیرۆکی هەواڵ بەڕۆژنامـەکـان و کـەناڵەکـانی تەلەفـزیۆن و رادیۆکـان و دەروازەکـانی هەواڵ و بەکـارهێنان (مسـتـخـدمي)ی GSM و کۆوار و ئاژانسـەکـانی فۆتۆگـراف و ریکلام و دەزگاکـانی دەوڵەت و بەڕێوەبەرایەتییە ناوخۆییەکان و بازرگانان و بەڵێندەران و ئاژانسەکانی گەشتیاری و ئوتێل و حزبە سیاسییەکان و سیاسەتوانان و یەکیەتیەکان و پەیمانگە فێرکارییەکان دەدا.

ڕۆژانە AA زیاتر لە ٢٠٠ وێنە پێشکێش دەکا. لە ئەرشـیـڤی AAدا زیاتر لە پێنج ملیۆن نێگەتیڤ و ١٠٠ هەزار وێنەی دیجیتاڵ هەیە، کە هەموو ڕووداوە گرینگەکان لە ساڵی ١٩٦٩وە لەخۆ دەگرن. هەروەها هەواڵ و وێنە سەرەکییەکان لەسەر ماڵپەڕی AA بۆ ئەو کەسانە خراوەتە بەر دەست کە لە خزمەتگوزارییەکانیدا بەشدار نین. بابەت و راپۆرتە تایبەتەکانیش لە ڕێی "بەلاڤۆکێکی خۆجێییەوە لە ٨١ لقی نێو تورکیادا دەگاتە بەشداران.

## ئاژانسی دەنگوباسی جەزائیر AAI

ئاژانسی دەنگوباسی جـەزائیـر AAI سـەر بەکـەرتی تایبـەتە و بایەخ بەزانیـاریی ئابووری و کـۆمـەلایەتی دەدا و لە ١٧ی کـانوونی دووەمی ١٩٩٦ دامـەزرا بـەلام لە کانوونی دووەمی ١٩٩٩دا کەوتە کار. ئەم ئاژانسە یەکەمین ئاژانسی پسپۆڕی کەرتی تایبـەتە لە جـەزائیـر و دوای ڕاگـەیاندنی یاسـای ئازادیی ڕۆژنامـەوانی لە ١٩٩٠دا توانیی سەرکەوتووانە هەواڵی ئابووری بدا بەڕۆژنامە گشتییەکان و چەند کۆوارێکی کەمی تایبەتمەند لەم بوارەدا. هەوڵ لە ئارادا هەبوون بۆ دامەزراندنی ئاژانسی تر، بەلام ئەو هەولانە جەختیان دەکردە سەر ڕۆژنامەوانیی ئازاد نەک ئەو کارەی کە پێویستە ئاژانسی دەنگوباس بیکا. خزمەتگوزارییەکانی AAI بەهەردوو زمانی فرانسەیی و ئینگلیزین. بۆ گەیشتنیش بەخزمەتگوزارییەکانی دەبێ کڕیار ئابوونە بدا ئینجا زانیارییەکانی بەفاکس یان ئیمیڵ بۆ دێ. هەروەها ئاژانسەکە زانیاری بەپێی خواستی کڕیار دەنێرێ (لە جیاتی وەرگرتنی هەموو زانیارییەکان، کڕیار چ جۆرە زانیارییەکی بوێ ئەوەی بۆ دێ– وەرگێر).

## ئەسۆشیێتد پرێسی ئوسترالیا AAP

ئەسۆشییێتد پرێسی ئوسترالیا AAP لە ساڵی ١٩٣٥ وەک کۆمپانیایەکی هاوبەش دامەزرا و ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسی ئوسترالیایە. گەورەترین دروستکەر و کۆکەرەوەی سەربەخۆی هەواڵ و زانیاریشە لە ئوسترالیا و خزمەتگوزارییەکانی بەمیدیا و حکوومەت و بازرگانی و بازاڕی دراو دەگەن. خاوەنەکانی ئەم ئاژانسە چوار دەزگای هەواڵی ئوسترالیان: نیوس لیمیتد و فێرفاکس و وێست ئوسترالیەن نیوسپێپەرز و هاریس گرووپ. AAP لەسەر بنەمایەکی بازرگانی کارەکانی خۆی دامەزراندووە و مەزەندە دەکرێ تێچووی کار و چالاکییەکانی خۆی بەفرۆشتنی خزمەتگوزارییەکانی بەکڕیارەکانی نێو میدیا و دەرەوەی میدیا پڕ بکاتەوە و قازانجیشی هەبێ. ئامانجی سەرەکیی AAP داپۆشینی هەواڵەکانی ئوسترالیا و وەرزش و دراو و ئەو بابەتانەی پێوەندییان بەئوسترالیاوە هەیە یان لەسەر ئوسترالیان. هەروەها هەواڵی نێودەوڵەتی بەکڕیارەکانی دەگەیەنێ، ئەویش لە ڕێی پێوەندییەکانی لەگەڵ گەورە ئاژانسەکانی دەنگوباسی نێودەوڵەتییەوە وەک AP و فرانس پرێس و EFE و dpaو رۆیتەرز و چینهوا. ئەم ئاژانسە لە هەموو شارە سەرەکییەکانی هەرێمەکانی ئوسترالیا نووسینگەی هەیە هەروەها لە ئیندۆنیسیا و پاپوا و گینیای نوێ و نیوزیلاند و بریتانیاش نووسینگەی هەیە.

کرۆکی خزمەتگوزارییەکانی ئەم کۆمپانیایە بریتییە لە وایەری گشتگری AAP. ئەم خزمەتگوزارییە هەموو دەروازەکانی هەواڵ و وەرزش و بازرگانی و بابەتەکان لەخۆ دەگرێ. هەروەها خزمەتگوزاریی وایەری گشتگیر پێشکێشی بەشداربووانی لە کۆمپانیاکان و حکوومەت و بازاڕەکانی دراو و کۆکەرەوەکانی ناوەڕۆکی وەک لێکسەس نێکسەس و فاکتیڤا و دیالۆگ دەکا. لە ڕێی ئەم خزمەتگوزارییەوە AAP هەوڵ دەدا بەرهەمی نوێ لەو ناوەڕۆکانەوە داهێنێ بۆ ئێزگەکانی رادیۆ و تەلەفزیۆن و نەوەی سێیەمی تەلەفۆنی مۆبایل. هەروەها بەرهەمی خۆی پێشکێشی بەشێک لە کڕیارەکانی ئینتەرنێت دەکا وەک کڕیارە سەندیکاییەکان و دەروازەکان و بەکارخەرانی مۆبایل و ماڵپەڕەکان (وەک سایتەکانی وەرزش و تەندروستی و حکوومەت و کۆمپانیاکان و سایتەکانی تایبەت بەدراو) و فرۆشیارانی بناخەکانی

زانیاری (داتابەیس). داتابەیسی AAP لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت زیاتر لە ٤٠٠ هەزار وێنەی فۆتۆگرافی ئوسترالیا و جیهانی تێدایە. کۆمەڵەی وێنەکانی AAP وایەری وێنەی نیشتمانیی AAP بۆ وایەرەکانی وێنەی ئەسۆشیێتد پرێس و ئاژانسی فۆتۆی ئەوروپا EPA و فرانس پرێس لەخۆ دەگرێ.

لە ڕێی لقەکەیەوە، پێجماستەرز، زانیاریی ئامادەکراو و لیستی تەلەفزیۆن و خشتەی کەلوپەل و پشکەکان و پێشبڕکێی ئەسپسواری و ژمارەیەکی زۆری لە لاپەڕەی وەرزشیی ئامادە بۆ بڵاوکردنەوە لەسەر ڕووداوە گرینگەکانی وەرزش بڵاو دەکاتەوە. هەروەها خزمەتگوزارییەکی تری هەیە بەناوی ؟ کە تایبەتە بەخزمەتگوزارییەکانی بەڵێندەری لە بارەی ژمێریاری و نەخشەسازی و ڕێخۆشکردن و دانان و بەدەستهێنانی خزمەتگوزاری لەسەر دێسکتۆپ و تۆڕی ئینتەرنێت و بێتەل. میدیانێتەکەشی دابینکەرێکی پێشەنگی خزمەتگوزارییەکانی ڕاگەیاندنە. AAP ئەندامە لە ئاسیانێت و ئاسیا پەڵسدا.

## ئاژانسی ئەمەریکای ناوەڕاست ACAN-EFE

ئاژانسی ئەمەریکا ناوەڕاست ACAN-EFE لە کانوونی یەکەمی ١٩٧٢دا بەهاوکاریی تەکنیکی و داراییی EFE دامەزرا و بارەگای سەرەکیی لە پەنەمایە، ئاژانسێکی ناوچەییی سەرکەوتووە. ئەم ئاژانسە کۆمپانیایەکی هەواڵی هاوبەشی ڕۆژنامە و ئێزگەکانی وەشانی حەفت وڵاتی بانی پەنەمایە (لەوانە بیلایز کە پێشتر هیندۆراسی بریتانیا بوو). ئەم ئاژانسە نووسینگەی هەیە لە سان خۆزێ و ماناگوا و تیگوسیگالپا و سان سەلڤادۆر و گواتیمالا. ACAN هەواڵەکانی ئەو ناوچەیە بەمیدیاکانی ئەندام و EFE مەدرید دەدا و لە هەمان کاتدا EFE گرینگترین هەواڵەکانی ئەمەریکای لاتین و جیهان بەئەندامانی ACAN دەدا. ئەم ئاژانسە لە بازاڕەکانی هەواڵی ئەمەریکای ناوەڕاستدا بالادەستە.

## ئاژانسی فرانس پرێس AFP

ئاژانسی فرانس پرێس AFP کە بەناوی ئاژانسی هاڤاس لە ساڵی ١٨٣٥دا دامەزرا، کۆنترین ئاژانسی دەنگوباسە لە جیهاندا. ئەمڕۆ AFP ئاژانسێکی

فرەزمانی فرەلایەنی میدیاییی جیهانە کە بەردەوامە لە فرەوانکردنی چالاکییەکانی و خزمەتگوزارییەکانی لە ڕێی بارەگا سەرەکییەکەیەوە لە پاریس و بنکە هەرێمییەکانی لە واشنتۆنی پایەتەخت و هۆنگ کۆنگ و نیکۆسیا و مۆنتڤیدیۆوە دەگەیەنێتە هەزاران بەشداربووی خۆی. بەزیاتر لە ۲۰۰۰ کارمەندەوە (کە ۹۰۰یان لە دەرەوەی فرانسە کار دەکەن) AFP ڕۆژانە ٤٠٠ تا ٦٠٠ هەزار وشەی ناو دەق و ۷۰۰ وێنە و ٥٠ گرافیکی هەواڵ بەرهەم دێنێ. هەروەها ئاژانسەکە چەندین جۆرە بەرهەمی میدیایی لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت پێشکێش دەکا وەک: دەق و وێنە و گرافیک و گرافیکی داینامیکی و ڤیدیۆ. AFP خزمەتگوزاریی تەواوی خۆی بەشەش زمان پێشکێش دەکا کە ئەمانەن: فرانسەیی و ئینگلیزی و ئەڵمانی و ئیسپانی و پۆرتۆگالی و عارەبی. ئەم خزمەتگوزارییانە لە ڕێی ئاژانسگەلی هاوبەشەوە بەچەندین زمانی تریش پێشکێش دەکرێن وەک چینی و ژاپۆنی و ڕووسی و هیندی و ئیتالی.

ئاژانسی AFP هەموو هەواڵەکان لە هەموو جیهاندا دادەپۆشێ هەر لە سیاسەت و دیپۆماتیکە تا دەگاتە ئابووری و دارایی و لە وەرزش و کولتوورەوە تا زانست و تێکنۆلۆجیا و تەندروستی و خەڵک. AFP بەرهەمەکانی بەشێوەی ئامادە بۆ بەکارهێنان پێشکێش بە کڕیارەکانی دەکا. کڕیارەکانیشی بریتین لە گەورە دەزگاکانی میدیای جیهان و کۆمپانیاکان و حکوومەتەکان و ئاژانسە نێودەوڵەتییەکان. AFX نیوس لیمیتد لقێکە بەتەواوی موڵکی AFPیە و بەچەند زمانێک داپۆشینی هەواڵی بازاڕەکانی دراوی جیهان و کۆمپانیا و هەواڵە ئابوورییەکان دەگەیەنێتە دەزگا وەبەرهێنە پیشەیی و تایبەتەکان لە ڕێی ئینتەرنێت و ڕێی تریشەوە. AFX خۆی ڕۆژانە ٤٠٠٠ چیرۆکە هەواڵی بواری بازرگانی و دراو بەرهەم دێنێ یان بۆ لایەنێکی سێیەمی دەگوێزێتەوە.

دەستەی کارگێرانی AFP پازدە ئەندامی هەیە کە هەشتیان نوێنەرایەتیی ڕۆژنامەوانیی فرانسە دەکەن و دووانیان نوێنەرایەتیی رادیۆ و تەلەفزیۆنی فرانسە دەکەن و دووان نوێنەرایەتیی کارمەندانی ئاژانسەکە و سێ نوێنەری ئەو خزمەتگوزارییە گشتییە دەکەن کە خزمەتگوزارییەکانی AFP دەبەن. ئەم دەستەیە

هەر جارە و بۆ ماوەی سێ ساڵ سەرۆکێک و بەڕێوەبەرێکی کارگێڕی لە دەرەوەی ئەندامانی دەستەکە هەڵدەبژێرن. لە ١٠ی کانوونی دووەمی ١٩٥٧ پێڕۆیەک بۆ AFP دەرچوو کە یاساکانی بەڕێوەبردنی چالاکییەکانی و بێ لایەنیی AFP دیاری دەکا. هەروەها ئاژانسەکە ئەنجوومەنێکی باڵای هەیە بۆ چاودێریی پابەندبوونی تەواو بەیاسا پیشەیییەکانەوە.

## ئاژانسی برازیل

ئاژانسی برازیل، ئاژانسی دەنگوباسی رادیۆبراس، دەزگای گەیاندنی برازیلە کە سەر بەسکرتارییەتی گەیاندن لە سەرۆکایەتیی کۆماری برازیلدا. ئەم ئاژانسی دەنگوباسە بەخۆڕایی کراوەیە بەرووی خەڵکدا و ڕەوتێکی فرەلایەنی هەیە و چالاکی و ڕاستییەکانی پێوەست بەحکوومەتی فیدراڵ و دەوڵەت و هاوڵاتیبوون دادەپۆشێ. برازیلیان نیوس خزمەتگوزارییەکە رادیۆبراس پێشکێشی دەکا بۆ بڵاوکردنەوە لە دەرەوە بەمەبەستی گەیاندنی ڕاستیی برازیل بەخەڵکی بێگانە. ئەو هەواڵانەی بەئینگلیزی و ئیسپانین بەشێکن لەو مادەیەی هەواڵنێران و نووسیارانی ئاژانسی برازیل، ئاژانسی دەنگوباسی رادیۆبراس بەرهەمیان دێنن. تیمی بەشی هەواڵی نێودەوڵەتی ئەو هەواڵە سەرەکییەکانەی ڕۆژ هەڵدەبژێرێ کە ڕەنگە پێوەست بن بەخەڵکی دەرەوە و ناوەڕۆکەکەی دەوڵەمەند دەکەن و دەقەکان وەردەگێڕن. هەموو ئەو بابەت و دەق و وێنانەی ئاژانسی برازیل یاخۆ خزمەتگوزاریی زمانی بێگانە بەرهەمیان دێنن بەبێ بەرامبەر شیاوی دووبارە بڵاوکردنەوەن بەو مەرجەی ئاماژە بۆ ناوی سەرچاوەکەیان بکرێ.

## ئاژانسی ئیستادۆ

ئاژانسی ئیستادۆ Estado لەساڵی ١٩٧٠ دامەزرا بۆ پێشکێشکردنی پشتگیریی بۆ کارەکانی گرووپی میدیای ئیستادۆ: ئیستادۆ دی س پاولۆ (١٨٧٥)، جۆرنال دا تاردە (١٩٦٦) و رادیۆ ئێلدۆرادۆ (١٩٥٨). دوای ماوەیەکی کورت لە دامەزراندنی ئاژانسەکە دەستی بەدابینکردنی هەواڵ و وێنە بۆ کڕیارانی دەرەوە کرد کە زۆربەیان ڕۆژنامە و ئێزگەی رادیۆی بچووک و مامناوەندی بوون. لە کۆتاییی ١٩٨٠کاندا، لە

کاتی چاوەڕوانیی ئەو گۆڕانکارییانەی خەریک بوون بەسەر ئابووری و بازاڕی زانیاری لە برازیلدا بێن، کۆمپانیاکە کرا بەیەکەیەکی سەربەخۆی بازرگانی. ڕێکخراوەکە بەچەند گۆڕانێکدا تێ پەڕی بەمەبەستی دروستکردنی سیستمێکی گەیاندنی ئیلیکترۆنی کە بتوانێ زانیاریی پێوەست بەزۆر لە کەرتە بەرهەمهێنەکان کۆ بکاتەوە و هەڵبژێرێ و خاوێن بکاتەوە و ئاوێتەیان بکا و بیانگوێزێتەوە.

ئێستا و دوای دەیەیەک لە بنیاتنانەوەی، ئاژانسی ئێستادۆ یەکەمین و تەنیا کۆمپانیایە لە برازیل کە تەنیا بەداهاتی فرۆشی زانیاری بەدوایین بەکارهێن خۆی بژیێنێ.

## ئاژانسی ئۆ گلۆبۆ

ئەم ئاژانسە لە ١٩٧٤ دامەزرا و لقێکی ڕێکخراوی گلۆبۆی برازیلە، کە گەورەترین تۆڕی وەشانی تەلەفزیۆن و کۆمپانیایەکی بڵاوکردنەوە و تۆڕێکی رادیۆ و بەشی ئینتەرنێت و سێ ڕۆژنامە لەخۆ دەگرێ. مەبەستی ئەم ئاژانسە بڵاوکردنەوەی هەواڵە لە ناو برازیل بەپشت بەستن بەکادری خۆی و لە دەرەوە لە ڕێی هاوپشکانەوە. ئەو بابەتانەی ئۆ گلۆبۆ بڵاویان دەکاتەوە ناوەڕۆکی سێ ڕۆژنامەش لەخۆ دەگرێ، لە پاڵ کۆمەڵی زانیاریی تر لە کاتی ڕوودانیاندا کە بەشی ئینتەرنێت ئەم کارە دەکا.

زیاتر لە ٤٥٠ کەسی شارەزا کار دەکەن بۆ بەرهەمهێنان و فرۆشتنی هەواڵە بڵاوکراوەکان بەکڕیاران لە هەموو برازیل و لە دەرەوەشدا. تیمەکەیان پێک دێ لە ١٥ هەواڵنێر لە ئەمەریکاوە تا چین، هەروەها ئەوروپا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باشووری ئەمەریکاش، جگە لەمانەش ئاژانسەکە ڕۆژنامەوانی لە هەموو هەرێمەکانی برازیلدا هەیە. بەرهەمی ئاژانسەکە بەزیاتر لە سەد ڕۆژنامە دەدرێ و دەگاتە نزیکەی چل ملیۆن هاوڵاتیی برازیل. ستراتیجی گەشەکردنی ئۆ گلۆبۆ بریتییە لە زیادکردنی فرۆش لە بازاڕی تردا جگە لە ڕۆژنامەوانی وەک بڵاوکەرەوەکان و کۆمپانیاکانی تۆمارکردن و ئاژانسەکانی ڕێکلام و دەزگاکانی حکوومەت و کۆمپانیا تایبەتەکان. هەروەها خزمەتگوزاریی وێنە ڕۆژانە نزیکەی ٣٠٠ وێنەی هەواڵ بەرهەم دێنێ و بانکێکی وێنەی هەیە نزیکەی پێنج ملیۆن وێنە لەخۆ دەگرێ کە ماوەی

هەشتا ساڵ دادەپۆشن. ئۆ گلۆبۆ یەکەمین ئاژانسی برازیل بوو کە بۆ وێنەکانی خۆی کامێرای دیجیتاڵی بەکار هێنا.

هەروەها ئاژانسەکە سایتێکی تایبەتی هەیە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێتدا. ئەم سایتە تەنیا بۆ ئابوونەدەرانە و جەخت لەسەر ئابووری و سیاسەت دەکاتەوە، لەگەڵ هەواڵ و شیکردنەوە و دیمانە و راپۆرتی تایبەت.

## ئاژانسی رۆژنامەوانیی هاییتی AHP

ئاژانسی رۆژنامەوانیی هاییتی AHP تەنیا ئاژانسی ئەو وڵاتەیە و لە ساڵی ١٩٨٩دا دامەزراوە و ستافەکەی بریتین لە ١٢ کەس لە نووسینگەی پۆرت ئۆ پرینس و دە هەواڵنێری لە سەرتاسەری وڵاتدا هەیە و لە کۆماری دۆمینیکان و کەنەدا و ئەمەریکاش لە هەر یەکێکیان یەکێکی هەیە. خزمەتگوزارییەکانی ئەم ئاژانسە بەهەردوو زمانی فرانسەیی و ئینگلیزین. هەموو ئێزگەکانی رادیۆ و تەلەفزیۆن لە هاییتی و رۆژنامەکانی ناوەوە و دەرەوە و نێردە دیپلۆماتەکان و رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان خزمەتگوزارییەکانی بەکار AHP دێنن. ئەم ئاژانسە سەرچاوەی سەرەکیی هەواڵە لە وڵاتدا. لە ١٩٩٢ ئاژانسەکە راپۆرتێکی بڵاوکردەوە لە بارەی ئەو هێرشانەی دەکرێنە سەر رۆژنامەوانی و رۆژنامەوانانی هاییتی لە ساڵی یەکەمی کودەتا سەربازییەکەدا. AHP ساڵانە کورتەیەکی رووداوەکانی ساڵ بڵاو دەکاتەوە.

## ئاژانسی دەنگوباسی بورکینا AIB

ئاژانسی دەنگوباسی بورکینا AIB ئاژانسی نیشتمانیی بورکینا فاسۆیە و لە ساڵی ١٩٦٤ دامەزراوە. ئاژانسی دەنگوباسی ڤۆلتیک بەباوانی ئەم ئاژانسە دادەنرێ تا ئەو کاتەی وڵات ناوی لە ١٩٨٤دا گۆڕی. لە ١٩٩٩دا لەگەڵ دەزگای بڵاوکردنەوەی سیدوایادا تێکەڵ بوون و نووسینگەی نیشتمانیی دەنگوباسیان پێک هێنا و ئەم دامەزراوە نوێیە لە ١ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٠دا کەوتە کار، AIB هەواڵی ناوخۆیی و نێودەوڵەتی کۆ دەکاتەوە و بەکڕیارانیان دەگەیەنێ. AIB دەروازەی بورکینایە بەرووی جیهاندا و ٤٥ هەواڵنێری لە پارێزگاکانی وڵاتدا هەیە.

## ئاژانسی دەنگوباسی لاتینۆئەمەریکانا ALAI

ئاژانسی لاتینۆئەمەریکانا ALAI لە ساڵی ١٩٧٦دا دامەزراوە و بارەگای سەرەکیی لە کیۆتۆی ئیکوادۆرە. بەرهەمەکانی بەزمانەکانی ئیسپانیایی و ئینگلیزین. ALAI دامەزراوەیەکی گەیاندنە کە بەتەواوی پابەندی بەڕێزگرتن لە مافی مرۆڤ و یەکسانیی جێندەرەکان و بەشداریی خەڵک لە پێشخستن و داڕشتنی سیاسەت لە ئەمەریکا لاتین. سایتێکی لە تۆڕی ئینتەرنێتدا هەیە بۆ ئەو بڵاوکراوانەی تایبەتن بەمافی مرۆڤ. (ئاژانسێکی تر بەناوی ئاژانسی دەنگوباسی لاتینۆئەمەریکانا LATIN لە کانوونی دووەمی ١٩٧٠ لەگەڵ ١٣ پشکداری ڕۆژنامەدا دامەزرا. لە ساڵی ١٩٧٥دا خزمەتگوزاریی پێشکێشی نزیکەی ١٣٠ ئابوونەدەر دەکرد. لە ئایاری ١٩٨١دا لەکار کەوت).

## ئاژانسی دەنگوباسی ئەتینا ANA

ئاژانسی دەنگوباسی ئەتینا ANA ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسی وڵاتی یۆنانە. لە ساڵی ١٨٩٥دا وەک کۆمپانیایەکی کەرتی تایبەت دامەزرا، ئاژانسی تێلیگرافی ستیفانۆپۆلی، حکوومەتی یۆنانیش لە ١٩٠٦دا دەستی بەپارەدارکردنی کرد و لەو کاتەوە ئەم ناوەی ئێستای هەیە.

هەموو خزمەتگوزارییەکانی ANA لە تۆڕی ئینتەرنێتدان و ڕۆژانە نزیکەی ٣٥٠ بابەتی هەواڵی بەزمانی یۆنانی هەیە و ٦٠ تا ٧٠ بەئینگلیزی و ١٥ تا ٢٠ بابەتی بەفرانسەیی هەیە. بەزمانی ئینگلیزیش بەڵاڤۆکێکی ڕۆژانەی هەیە هەموو هەواڵەکانی یۆنان لەخۆ دەگرێ. فۆتۆبانکی ANA هەزاران وێنە هەواڵی یۆنان و جیهانی تێدایە و لە سەرەتای ١٩٩٦ەوە کار دەکا. هەروەها بڵاوکراوەیەکی ڕۆژنامەوانیشی هەیە بەهەردوو زمانی یۆنانی و ئینگلیزی.

## ئەندینا ANDINA

ئەندینا گەورەترین ئاژانسی دەنگوباسە لە پیرۆ و ناوچەکەدا و ڕووداوە سەرەکییەکانی پیرۆ و ئەمەریکای لاتین و شوێنەکانی تری جیهان بڵاو دەکاتەوە. ئەو

هەواڵانەی جێی بایەخی گشتین لە کاتی خۆیاندا کۆ دەکاتەوە و دەنووسێ و دەنووسێتەوە و بڵاو دەکاتەوە. لەبەرئەوەی سەر بەحکوومەتە، بۆیە هەواڵەکانی فەرمی بەپلە یەک دێن لە ڕیزبەندیی گرینگی پێداندا. لە سەرتاسەری پیرۆدا سی نووسەر و نووسیار و وێنەگر و هەواڵدەر و هەواڵنێری هەیە. هەواڵ بەدەزگاکانی ڕاگەیاندنی وڵات دەدا.

## تۆڕی ئاڵوگۆڕی هەواڵی ئاسیان ANEX

تۆڕی ئاڵوگۆڕی هەواڵی ئاسیان ANEX لە لایەن بەرناما و ئەنتارا و ئاژانسی دەنگوباسی فیلیپین و ئاژانسی دەنگوباسی تایلاندەوە ساڵی ١٩٨٠ دامەزرا بۆ ئەوەی ببێ بەسەرچاوەی سەرەکیی دەنگوباس و ڕووداوە سەرەکییەکانی ناوچەی ئاسیان بۆ میدیای چاپکراو و ئێلیکترۆنیش. هەرچەندە برونەی داروسەلام و سینگاپۆر ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسیان نییە، بەڵام ئەم دوو وڵاتە ئەندامەی ئاسیان بۆ میدیای چاپکراو و ئێلیکترۆنی هەواڵ لە ANEX وەردەگرن.

## ئەنگۆپ

ئاژانسی دەنگوباسی ئەنگۆلا، ئەنگۆپ، لە تەمووزی ١٩٧٥دا لە لواندا دامەزرا. دامەزراوەیەکی گشتییە و خاوەن بەڕێوەبەرایەتیی ئۆتۆنۆمییە و لە بۆچووندا سەربەخۆیە بەمەرجێک کە لە یاسا لانەدا. لە ٢ی شوباتی ١٩٧٨دا کرا بە ئۆرگانی حکوومەت. لە ١٩٨٠کاندا نزیکەی ٣٠٠ کەس کاریان دەکرد بۆ ئەوەی ئاژانسەکە لە ڕۆژێکدا ٢٤ سات کار بکا، ئەمانە دابەش بووبوون بەسەر ١٨ پارێزگای وڵات و پێنج نووسینگەی دەرەوەی وڵات (لە پۆرتۆگال و برازیل و بریتانیا و زیمبابوی و کۆنگۆ). ئەنگۆپ ئەندامی پوولی ئاژانسەکانی دەنگوباسی وڵاتانی بێلایەنە و لە ١٩٨٩ تا ١٩٩٢ سەرۆکایەتیی ئەو ڕێکخراوەی کردووە.

ئەنگۆپ ڕۆژانە ٢٤ سات خزمەتگوزاریی بەردەوام لە ڕێی کێبڵەوە پێشکێش دەکا و لە ڕۆژێکدا نزیکەی ٢٥٠ بابەتی هەواڵی ناوخۆیی و جیهانیی هەیە (نزیکەی پەنجا هەزار وشە)، کە بەسەر میدیاکانی حکوومەت و سەربەخۆ و ئاژانسە بێگانەکاندا دابەشیان دەکا. بۆ دەرەوەی وڵاتیش ڕۆژانە ٢٠ تا ٢٥ بابەتی هەواڵی هەیە (٤٠٠٠

وشە) بەزمانەکانی پۆرتۆگالی و ئینگلیزی و فرانسەیی.

## ئاژانسی دەنگوباسی هۆڵەندا ANP

ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسی هۆڵەندا ANP گرینگترین هەواڵدەرە لە هۆڵەندا. بەرهەمەکانی تا ڕادەیەکی زۆر لە میدیاکانی هۆڵەندا بەکار دێن. ئەم ئاژانسە لە ساڵی ١٩٣٤ لە لایەن ڕۆژنامە ڕۆژانەییەکانی هۆڵەنداوە دامەزرا. لە ئایاری ٢٠٠١ەوە ANP بەسەربەخۆیی لە بازاڕی میدیادا کار دەکا، بەمەش ئاژانسەکە توانیویەتی چالاکییە بازرگانییەکانی خۆی فرەوانتر بکا.

ئێستا ANP ساڵانە نزیکەی ١٦٠ هەزار چیرۆکی هەواڵ و ١٠٠ هەزار وێنە بەرهەم دێنێ، بەشێوەگەلێک کە بگونجێن لەگەڵ پێویستیی کەناڵە جیاجیاکانی میدیادا. ژمارەی کارمەندانی نزیکەی ٢٠٠ کەس دەبێ و بارەگای سەرەکیی لە نزیک لاهایە، جگە لەوانیش تیمێکی هەواڵنێرانی هەیە بەهەموو وڵاتدا بڵاو بوونەتەوە و نووسینگەی لە ئەمستردام و ڕۆتردام و لاهای و برۆکسلدا هەیە.

## ئاژانسی نیشتمانیی ستامپا ئەسۆسیاتا ANSA

ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسی ئیتاڵیا ANSA لە ساڵی ١٩٤٥دا وەک کۆمەڵەیەکی هاوبەشی ڕۆژنامەکان دامەزرا. ئەمڕۆ ٢٢ بنکەی لە ناو وڵاتدا هەیە و ٨٣ بنکەی تریشی لە ٧٨ وڵاتدا هەیە و گەورەترین ئاژانسی دەنگوباسی ئیتاڵیا و پێنجەمین گەورەترین ئاژانسی دەنگوباسە لە جیهاندا. خزمەتگوزاریی هەواڵ بریتییە لە هەواڵە گشتییە ناوخۆیی و جیهانییەکان (نزیکەی ٢٥٠ هەزار وشە ڕۆژانە بەئیتالی. خزمەتگوزاریی تایبەتی هەواڵ بەئینگلیزی و ئیسپانیایی و پۆرتۆگالی). ئاژانسەکە ڕۆژانە زیاتر لە ٢٠٠٠ بابەتی هەواڵ دەنووسێتەوە و ئەمانە دەکرێن بەکۆمەڵی لە بەرهەمی جۆراوجۆر و دەخرێنە بەر دەستی کڕیاری تایبەتەوە.

## ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسی ئیندۆنیسیا ANTARA

ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسی ئیندۆنیسیا ANTARA لە لایەن ئادەم مالیک و سۆمانانگ و ئم سیپانهۆنتار و پاندۆ کارتاویگۆناوە لە ١٣ی کانوونی یەکەمی

۱۹۳۷دا دامەزرا، بۆ خزمەتکردنی خەباتی لە پێناو سەربەخۆیی نیشتمان لە دەستی کۆلۆنیالیزمی هۆڵەندا و داگیرکاریی ژاپۆن. ANTARA یەکەمین لایەن بوو ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی ئیندۆنیسیا لە ۱۷ی ئابی ۱۹٤٥دا بڵاو بکاتەوە.

بارەگای سەرەکیی ANTARA لە جاکارتایە. ۲۷ بیرۆی لە پارێزگاکاندا هەیە و نزیکەی ۲۰۰ هەواڵنێری هەن هەواڵەکانی گشت کونجێکی وڵات دادەپۆشن. هەروەها ئاژانسەکە بیرۆی لە نیویۆرک و بەرلین و لاهای و کانبێرا و تۆکیۆ و بەکین و کوالا لامپور هەیە لەگەڵ ئەمانە هەواڵنێری لە قاهیرە و سەنعادا هەیە.

ڕۆژانە ANTARA زیاتر لە ۲٥۰ ڕاپۆرتی هەواڵ بەرهەم دێنێ و زیاتر لە ۳۰۰۰ چیرۆکی هەواڵ لە فرانس پرێس و رۆیتەرز و dpa و چینهوا و کیۆدۆ و ئاژانسەکانی ئەندام لە ANEX و OANA و NANAP و کۆمەڵێ لە ئاژانسەکانی وڵاتانی گەشەکردوو وەردەگرێ. هەواڵ و وێنەکانی بەهۆی نوێترین تێکنۆلۆجیاوە دەگاتە دەستی کڕیارەکانیەوە.

## ئەسۆشیێتد پرێس AP

ئەسۆشیێتد پرێس AP لە ساڵی ۱۸٤۸دا وەک کۆمپانیایەکی هاوبەشی نێوان شەش لە ڕۆژنامەکانی نیویۆرک لەدایک بوو و، ئێستا ڕێکخراوێکە خزمەتی زیاتر لە ۱۷۰۰ ڕۆژنامە و ٦۰۰۰ دەزگای وەشانی لە ئەمەریکادا دەکا. هەروەها خزمەتگوزارییەکانی AP لە ۱۲۱ وڵاتدا چاپ و دەکرێن دەوەشێنرێن. لە سەرتاسەری جیهاندا زیاتر لە ۲٤۰ نووسینگەی هەیە و ڕۆژانە زیاتر لە یەک ملیار مرۆڤ لە سەرتاسەری جیهاندا بەرهەمەکانی دەخوێننەوە یان دەشنەون یان دەبینن لە ڕێی ئەندامان و ئابوونەدەرانی APوە. خزمەتگوزارییەکانی AP دەگەنە زیاتر لە ۱٥۰۰۰ دەزگای هەواڵ و نزیکەی ۱۰۰ بڵاوکەرەوە و زیاتر لە ٥۰۰ کۆمپانیا و ئاژانسی حکوومەتی. خزمەتگوزارییەکانی ڕاگەیاندنی AP لە ڕێی سەتەلایت و ئینتەرنێتەوە بەسەر زیاتر لە ۱۲۰ وڵاتدا بڵاو دەکرێنەوە.

ئامانجی بنەڕەتیی AP بریتییە لە پێشکێشکردنی هەواڵی ویلایەت و وڵات و جیهان و وێنە و گرافیکەکانیان و وەشان و خزمەتگوزارییەکانی ئینتەرنێت بەخاوەنەکانی

خۆی لە ئەمەریکا بەشێوەیەک کە کەمترین تێچووی هەبێ. AP گەورەترین ڕێکخراوی کۆکردنەوەی هەواڵە و ٣٧٠٠ کارمەندی هەیە و خزمەتی ١٢١ وڵات دەکا.

ئەسۆشیێتد پرێس لە ساڵی ١٩٠٠ شێوەی یاسایی مۆدێرنی خۆی وەرگرت، کاتێ بەپێی یاسای دامەزراوەی ئەندامیەتیی ویلایەتی نیویۆرک وەک کۆمپانیایەکی هاوبەشی قازانج نەویست دامەزرا. ئەندامانی هاوبەش لە APدا دەستەی کارگێڕی هەڵدەبژێرن کە دەستەی حاکمی ئەسۆشیێتد پرێسە. بەپێی پێڕۆ، ژمارەی کارگێڕان نابێ لە ١٨ کەمتر و لە ٢٤ زیاتر بێ و بەلای کەمەوە سێ کارگێڕ دەبێ نوێنەری ئەو ڕۆژنامانە بن کە لەو شارانەدا دەردەچن ژمارەی دانیشتووانیان لە پەنجا هەزار کەس کەمترە بەمەرجێک لە لایەن ئەو ڕۆژنامانەوە کە لە شاری زیاتر لە ٥٠ هەزار کەسی دەردەچن کۆنترۆڵ نەکرابن و سەرپەرشتی نەکرێن. ئەو دەستەی کارگێڕییە دەتوانێ بەزۆرینەی دەنگ چوار کارگێڕی تر بۆ ماوەی دوو ساڵ دامەزرێنێ و وەک نەریت نوێنەرانی دەزگاکانی وەشان ئەم شوێنانە پڕ دەکەنەوە. سەرۆکی AP، بەهۆی ئەو دەسەڵاتانەی دەستەی کارگێڕی پێی بەخشیوە، چالاکییەکانی AP بەڕێوە دەبا.

## ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی نەمسا APA

ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی نەمسا APA کە لە ساڵی ١٩٤٦دا دامەزراوە، ئاژانسی نیشتمانیی ئەو وڵاتەیە و خاوەنەکانی بریتین لە ١٤ ڕۆژنامەی جۆراوجۆر و ئێزگەی وەشانی نەمسا. هەموو گرووپەکەی APA بریتییە لە ئاژانسی دەنگوباسەکە و چوار لق. نووسینگەی سەرەکیی APA هەواڵی نوێ و وێنە و نەخشەی گرافیک لە بارەی سیاسەت و ئابووری و دارایی و زانست و کولتوور و وەرزشەوە پێشکێش دەکا. بارەگای سەرەکییان لە ڤیەننایە و نووسینگەی هەواڵنێرانیان لە گشت پارێزگەکا و لە برۆکسل هەیە. زیاتر لە سەد ڕۆژنامەوانی APA ڕۆژانە نزیکە ٥٦٠ بابەتی هەواڵ بەرهەم دێنن. چوار لقەکەش کارەکانی APA تەواو دەکەن لە ڕێی بڵاوکردنەوە و تۆژینەوە و ڕێکخستنی زانیاری و چارەسەری تێکنۆلۆجییەوە.

خزمەتگوزارییەکانی لقەکانی APA ئەمانەن: APA مەڵتی میدیا کە دەروازەکانی ڕێکلام وخزمەتگوزارییەکانی مۆبایل لە نەمسا دابین دەکا. خزمەتگوزاریی دارایی

APA زانیاریی دارایی بەکرپارە پیشەییەکان دەگەیەنێ لە بوارەکانی میدیا و بانک و بواری کۆمپانیا هاوبەشەکان. خزمەتگوزاریی دەقی بنەڕەتیی APA گرینگترین کەناڵی بڵاوکردنەوەی نەمسایە، ئەم کەناڵە خزمەتگوزاری بەنزیکەی ٣٨٠ ڕۆژنامەوان و بنکەی ڕۆژنامەوانی و ٥٠٠٠ بەکارهێنەری تر دەگەیەنێ. هەروەها دەروازەی هەواڵیش دابین دەکا. خزمەتگوزاریی APA دیفاکتۆ گەورەترین بنکەی زانیاریی میدیایە لە نەمسا کە زیاتر لە سێ ملیۆن فایلی لە بارەی دووسەد بنکەی پیشەییی زانیارییەوە هەیە. شارەزای بواری سیستەمەکانی پێشخستنی زانیاری و ڕێکخستنی زانینە.

## ئەسۆشییێتد پرێسی پاکستان APP

ئەسۆشییێتد پرێسی پاکستان APP لە ١٩٤٧وە دەستی پێ کرد. دۆناڵد رید دەڵێ لە ١ی کانوونی دووەمی ١٩٤٩وە بەشی پاکستان لە ئەسۆشییێتد پرێسی هیندستان بنیات نرایەوە و بووە ئەسۆشییێتد پرێسی پاکستان APP. ساڵی دوای ئەوە ڕۆیتەرز دەستی خۆی کێشایەوە و APP بووە ئاژانسێکی سەربەخۆی نیشتمانی. ڕۆژنامەوانێکی پاکستانی لە ڕۆیتەرز لە لەندەن دامەزرا و وەشانێکی جیاوازی رادیۆ دامەزرا بۆ گواستنەوەی هەواڵ بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و پاکستان. ئاژانسەکە بەڕێوەبەرێکی گشتی بەڕێوەی دەبا کە حکوومەت دایمەزراندووە و ڕۆژنامەوانەکانی بەفەرمانبەری فەرمی یان نیمچە فەرمیی حکوومەت ئاژمێردرین.

## ئاژانسی دەنگوباسی جەزائیر APS

ئاژانسی دەنگوباسی جەزائیر APS لە ١ی کانوونی یەکەمی ١٩٦١ دامەزرا لە بەرەبەیانی شەڕی ئازادیی نیشتمانیدا. لە ١٩ی تشرینی دووەمی ١٩٨٥دا ئاژانسی APS بووە دەزگایەکی گشتی کە ئەرکی ئابووریی هەبێ لە پاڵ ئاراستەگەلی کۆمەڵایەتی و کولتووریدا. لە ٢٠ی نیسانی ١٩٩١ بووە کۆمپانیایەکی گشتی بەئەرکی پیشەسازی و ئابوورییەوە و بەهەموو ئیمتیازەکانی کۆمپانیایەکی گشتیشەوە.

لە نووسینگەی ناوەندیی نووسیاریی APSدا ١٢ بەشی نووسیاری هەیە:

سـیـاسـەت، کـۆمـەڵایەتی، کـولتـوور، وەرزش، ناوچەیی، وەبـەرهێنان و ڕاپۆرتدان، بازرگـانی، بـانکی زانیـاری، نێـودەوڵەتـی، وەرگـێڕان و ئینتـەرنێت. لەسـەر ئاسـتی ناوچەییدا تـۆڕی هەواڵنێـران بەسـەر ١٢ بەشـی نـاوچەییـدا دەبەش کـراوە و هـەمـوو وڵات دادەپۆشـێ. لە دەرەوەش ئاژانسـەکـە لـە ١٢ پایەتـەختـدا نوێنـەرایەتیی هـەیە: واشنتۆن، مـۆسکۆ، پاریس، لەندەن، برۆکسل، ڕۆمـا، مەدرید، قاهیـرە، ریبات، تونس، عەممان و داکار.

## ئەرمەنپرێس

ئاژانسـی دەنگوباسـی ئەرمـەنپـرێس لە کـانوونی یەکـەمی ١٩١٨دا دامـەزرا و کۆنتـرین و گەورەترین ئاژانسی دەنگوباسـە لە ئەرمـینیا و ئێسـتا کۆمـپانیـایەکی هاوبەشی داخـراوە و پشکەکانی بەدەستی حکوومـەتی ئەرمـینیاوەن. هاوبەشـەکانی ئەرمـەنپـرێس ڕۆیتـەرز و ئیـتـار-تاس و چینهوایان تێدایە کـە لەگـەڵیاندا زانیـاری دەگۆڕێتـەوە. بەڵاڤۆکی هـەواڵی ناوخۆیی و نێودەوڵـەتی و هـەرێمی بەرهـەم دێنێ لەگەڵ وێنـە و شـیـکردنەوەی هـەواڵی سـیـاسـی و ئابووری و کـولتـوور و بوارەکـانـی تر. هەواڵەکـان بـەزمـانـی ئەرمـەنی و ڕووسـی و ئینگلیـزی بڵاو دەکـرێنەوە. ئاژانسـەکـە ئەرشـیـڤـێکی دەوڵەمـەندی زانیـاری و وێنەی هەیە کـە سـەرچاوەیەکی دەگـمـەنی زانیـارییـە لە بارەی مێژووی ئەرمـینیا و ناوچەکـەوە. لەو ئەرشـیـڤـەدا نزیکەی سـەد هەزار وێنە هـەیە.

## ئاسیا پەڵس

کۆمپانیـایەکی کاری هـاوبەشە لە سـاڵی ١٩٩٦ پێک هێنرا. زانیـاریی بازرگـانی لە کـاتـی خـۆی و هـەواڵ پێـشکێـشـی ٣٠ وڵات و ٥٠ بواری پیـشـەسـازیی ئاسـیـا دەکا. پشت بـەسـەرچاوەکـانی گـەورەترین پێـشکێـشکارانی زانیـاری و هەواڵ لـە ئاسـیـا دەبەسـتێ، لەوانە ئەسـۆشـیـێتد پرێسی ئوسـترالیـا، LKBN ئانتـارا (ئیندۆنیسـیـا)، نیهـۆن کانزای شیـمبون (ژاپۆن)، ئاژانسی دەنگوباسـی عومـان، پرێس ئینتەرناشـناڵ ئینفـۆرمەیشن سێرڤـسزی پاکسـتان، ئاژانسی دەنگوباسـی فیلیپین، پرێس تـرەستی هیندسـتـان، ئـاژانسـی دەنگوباسـی ڤـێتنام، ئاژانسی دەنگوباسـی چینهـوا، ئاژانسـی

دەنگوباسی یۆنهاپ (کۆریای باشوور)، ئاژانسی ناوەندیی دەنگوباس (تایوان)، ئاژانسی دەنگوباسی کۆماری ئیسلامی (ئێران) و سەرچاوەگەلێک لە مالیزیا و سینگاپۆر. ئەم دەزگایە بەبەردەوامی زانیاری نوێ دەکاتەوە و زەمینەی کێبەرکێ بۆ بازرگانی لە ئاسیا دەڕەخسێنێ. هەروەها پرۆفایل پێشکێش دەکا سەبارەت بەپیشەسازییە سەرەکییەکانی ئاسیا و هەموو گۆڕانکارییەکی هەر بوارێک بەکڕیارانی ڕادەگەیەنێ.

## ئاژانسی تێلیگرافی ئەلبانیا ATA

میهال شێرکۆ ئاژانسی تێلیگرافی ئەلبانیای ATA لە ساڵی ١٩٢٩دا دامەزراند و هەر لە سەرەتاوە ئاژانسەکە تۆڕێکی هەواڵنێرانی لە شارە سەرەکییەکانی وڵاتدا هەبوو و بۆ هەواڵی نێودەوڵەتیش پێوەندیی لەگەڵ ئاژانسە نێودەوڵەتییەکاندا هەبوو. بەرهەمی سەرەکیی ئاژانسەکە خزمەتگوزاریی گشتیی هەواڵە بەزمانی ئەلبانی کە نزیکەی ٤٠ هەواڵی ناوخۆیین و ٨٠ هەواڵیشی دەرەکین. زانیارییەکانی ATA 40 تا ٥٠٪ی ڕۆژنامە ڕۆژنامەکانی وڵات پڕ دەکەنەوە. خزمەتگوزارییە ئینگلیزی و فرانسەییەکانیش ڕۆژانە نزیکەی ٢٠ بابەتی هەواڵیان هەیە.

## ئاژانسی تێلیگرافی سویسرا ATS

ئاژانسی تێلیگرافی سویسرا ATS لە ٢٥ی ئەیلوولی ١٨٩٤ لە بێرن لەدایک بووە و ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسی سویسرایە. ڕۆژی ٢٤ سات زانیاری بڵاو دەکاتەوە لە بارەی سیاسەت، ئابووری و هەواڵی کۆمەڵایەتی و وەرزش بەسێ زمانە سەرەکییەکەی وڵات فرانسەیی و ئەڵمانی و ئیتالی. لە ATSدا ٢٢٠ کەس کار دەکەن ١٧٥یان ڕۆژنامەوانن، زۆربەی میدیای سویسرا و ژمارەیەک دەروازەی بیانیی میدیا ئابوونەدەری ئاژانسەکەن. هەروەها کڕیارانی نزیکەی ٢٥٠ کەرتی تایبەت و گشتی خزمەتگوزارییەکانی بەکار دێنن. لە ١٩٨٣وە دەستبەرداری بەکارهێنانی کاغەز بوو بۆ گواستنەوەی هەواڵەکانی و بانکێکی ئێلیکترۆنیی زانیاریی بەناوی ELSA دامەزراند کە هەموو ئەو دەقانەی ATS بڵاوی کردوونەتەوە لەو بانکەدا کۆ کراونەتەوە.

له دەوروبەری ناوەڕاستی ١٩٥٠کاندا داهێنانێکی نوێی میدیا لەدایک بوو، کە تەلەفزیۆنە. لە ساڵی ١٩٥٧وە ATS بەلاڤۆکی تەلەفزیۆنیی بەرهەم هێنا. لە ١٩٥٣وە بەهاوکاریی دەسەلاتی پۆستە و گەیاندنی وڵات خزمەتگوزاریی گەیاندنی زانیاریی بەتەلەفۆن داهێنا. هەرچەندە ATS هەوڵی بەدیهێنانی ئامانجگەلی دارایی و قازانج نادا بەلام پابەندی بنەمای خۆپارەدارکردنە.

## ئازەر تاج

ئازەر تاج ئاژانسی دەنگوباسی کۆماری ئازەربایجانە و لە لایەن حکوومەتەوە بەڕێوە دەچێ و لە ئاداری ١٩٢٠دا دامەزراوە وەک ئاژانسی دەنگوباسی کۆماری دیموکراتی ئازەربایجان و ئەوەندەی پێ نەچوو بووە بەشێک لە تاسی سۆڤێت. لە ١٩٩١دا و دوای هەڵوەشانەوەی یەکیەتی سۆڤێت ئازەربایجان سەربەخۆیی بەدەست هێنایەوە و ئازەر تاج هەمان پێگەی پێشووی خۆی وەرگرتەوە. ئێستا نووسینگەکانی لە مۆسکۆ و ئەنکەرە و واشنتۆن و پاریس و بەرلین و کیێڤ و ئاسیای ناوەڕاست و ئێران و جۆرجیادا کار دەکەن. ئازەر تاج ڕۆژانە ٢٤ سات کار دەکا و ڕاپۆرت و وێنەکانی بەزمانی ئازەری و ڕووسی و ئینگلیزی بلاو دەکاتەوە.

## باختار

ئاژانسی باختار ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسی ئەفگانستانە و لە ١٩٣٩دا دامەزراوە. لە شوباتی ٢٠٠٢ یونسکۆ دەستی بەپرۆژەیەک کرد بۆ دابینکردنی کەلوپەل و مەشق بۆ ئاژانسەکە کە تەنیا چەند کۆنە ئامێرێکی تایپ و دوو کۆمپیوتەری فرە کۆنی هەبوو و بەشی هەواڵەکانی دەرەوە تەنیا دوو کەس بوون بەدیار دوو رادیۆوە دانیشتبوون و بەشەپۆلی کورت هەواڵیان لە ئێزگەکانی ولاتانی تر وەردەگرت و دەنووسییەوە. هەروەها پرۆژەکە ئەوەش لەخۆ دەگرێ کە ئەرشیڤێکی دیجیتاڵ بۆ هەواڵەکانی باختار لە ساڵی ١٩٥٠وە دروست بکا. باختار ئەندامە لە OANA.

## بێلگا

له ۲۰ی ئابی ۱۹۲۰دا پییێر-ماری ئۆلیڤێر و مۆریس تراڤەیلەر ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی تێلیگرافی بەلجیکایان دروست کرد، کە سەرمایەکەی پێنج ملیۆن فرانکی بەلجیکایی بوو و له لایەن ۲۳٤ کۆمپانیا و ۱۱ کەسەوە دابین کرابوو. له ۱ی کانوونی دووەمی ۱۹۲۱ دەستی بەکار کرد. ٤٥ ڕۆژنامە و ۱٦ بانک و ۹ کۆمپانیای بازرگانی و حکوومەت بوونە ئابوونەدەری ئاژانسەکە. له ۱۹٤۸ ڕۆژنامەکانی بەلجیکا بوونە زۆرینەی خاوەن پشکەکانی بێلگا. له ۱۹۷۰ بەشی نووسیاری بووە دوو بەش: فرانسەیی و ئەڵمانی. ۱۲۷ کەس له بێلگا کار دەکەن ۱۰٦یان له بەشی نووسیارین.

بێلگا ساڵانە زیاتر له ۲۰۰ هەزار بەلاڤۆک بەرهەم دێنێ بەهەردوو زمانی فرانسەیی و ئەڵمانی، زیاتر له پەنجا ملیۆن وشە بەهەردوو زمان. هەروەها ۲٥ هەزار وێنەی خۆی و ۷٥ هەزار وێنەی ئاژانسی پرێسفۆتۆ ئەورووپایی ساڵانە بڵاو دەکاتەوە.

## بەرناما

بەرناما، ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسی مالیزیا، بەبڕیارێکی پەرلەمان له ۱۹٦۷دا دامەزرا و له ئایاری ۱۹٦۸ کەوتە کار. دەستەیەکی سەرپەرشتیی پێنج کەسی دامەزرا بۆ ئەوەی بەردەوام ئاگەدار بێ کە بەرناما له بەندەکانی ئەو یاسایە لانادا و ئامانجەکانی دێنێتە دی. دەستەیەک بەڕێوەی دەبەن پێک هاتووە له بەڕێوەبەرێک و شەش نوێنەری حکوومەتی فیدراڵ و ئەو ڕۆژنامانەی ئابوونەدەری بەرنامان.

بەرناما نووسینگەی له هەرێمەکانی مالیزیا هەیە و هەواڵنێری له سینگاپوور و جاکارتا هەیە. هەروەها هاوکاری هەیە له واشنتۆن و لەندەن و مانیلا و نیو دێلهی و داکا و مێلبۆرن.

### بێتا

ئاژانسی دەنگوباسی بێتا خزمەتگوزارییەکی هەرێمیی تایبەت و سەربەخۆیە، ساڵی ١٩٩٢ بۆ داپۆشینی تەواوی ڕووداوەکانی کۆماری فیدراڵی یۆگۆسلاڤیا و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا دامەزرا. ئەمڕۆ خزمەتگوزارییە سەرەکییەکەی کە بەزمانی سربییە ڕۆژانە زیاتر لە ٣٠٠ بابەتی هەواڵی هەیە، ئابووریی ناوخۆیی و پرسە سیاسییەکان دادەپۆشن، هەروەها هەواڵەکانی وڵاتانی دراوسێ و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا و جیهانیش. خزمەتگوزاریی وێنەی بێتا وێنەی ڕووداوەکانی یۆگۆسلاڤیا و دەوروبەری و جیهان بڵاو دەکاتەوە و وێنەکان بەرهەمی وێنەگرانی خۆی و ئەسۆشییێتد پرێسن. خزمەتگوزارییەکانی بێتا بەزمانی ئەلبانی و ڕۆمانی و هەنگاری و ئینگلیزیش بڵاو دەبنەوە.

### بلوومبێرگ

میشێل ر بلوومبێرگ کە پێشتر هاوپشکی گشتی بوو لە سالۆمۆن برەدەرز، سەرۆکی بازرگانیی پشکەکان و فرۆشیاری و دواتر پێشخستنی سیستەمەکانە، لە ١٩٨١دا دامەزراوە. بەرهەمی بلوومبێرگ بریتییە لە هەواڵ و زانیاری و شیکردنەوە و پێشکێشی لایەنەکانی بازرگانیی جیهانیان دەکا. ڕۆژانە ٢٤ سات و لە کاتی خۆیاندا زانیاری پێشکێش دەکا.

خزمەتگوزاریی وایەری هەواڵی دارایی لە ١٦٠٠ هەواڵدەر لە ٩٤ نووسینگە پێک دێ و ئەمانە ڕۆژانە زیاتر لە ٤٠٠٠ چیرۆکی هەواڵ دەنووسن.

نزیکەی ٢٦٠ هەزار بەکارهێنەری بلوومبێرگ دەتوانن لە ڕێی کۆمپیوتەرەکانی خۆیانەوە سوود لە خزمەتگوزارییەکانی ببینن. کەناڵێکی هەواڵی بازرگانی و دارایی تەلەفزیۆنی بلوومبێرگ بەهۆی ١٠ تۆڕ و بەحەفت زمان ئامرازگەلی پێویست دەخاتە بەر دەستی خاوەن دەسەڵات و وەبەرهێنەکانەوە و ئەم خزمەتگوزارییە دەگاتە ٢٠٠ ملیۆن ماڵ لە سەرتاسەری جیهان.

## خزمەتگوزاریی هەواڵی بەلتیک BNS

خزمەتگوزاریی هەواڵی بەلتیک BNS لە نیسانی ١٩٩٠ لە مۆسکۆ لە گەرمەی کۆششی ولاتانی بەلتیک لە پێناو ئازادیدا دامەزرا. BNS لە هەرسێ ولاتی بەلتیکدا، ئیستۆنیا و لاتڤیا و لیتوانیا، چالاکە و بارەگای سەرەکیی لە تالینە و نووسینگەی هەرێمیی گەورەتری هەیە لە ریگا و ڤیلنیوس. ئاژانسەکە نووسینگەی هەواڵدانی هەیە لە مۆسکۆ و کالینینگراد و وارشۆ و ستۆکهۆلم. بە ستافێکی ١٦٠ کەسییەوە، BNS ڕۆژانە نزیکەی هەزار بابەتی هەواڵ بەپێنج زمان: ئیستۆنیایی و لاتیڤی و لیتوانیایی و ئینگلیزی و ڕووسی بڵاو دەکاتەوە و نزیکەی ٥٠٠ ئابوونەدەری هەیە برێتین لە دەزگای میدیا و دامەزراوەی دارایی و حکوومەتی و کۆمپانیاگەلی پیشەسازی. BNS ئەندامە لە گرووپی ئەلما میدیا، فینلاند.

## سانگباد سانگستای بەنگلادیش BSS

سانگباد سانگستای بەنگلادیش BSS، ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسی ولاتەکەیە و لە ١ی کانوونی دووەمی ١٩٧٢ لە ڕۆژانی لەدایکبوونی دەوڵەتی سەربەخۆی بەنگلادیشدا دامەزرا. نووسینگەی ئەسۆشیێتد پرێسی پاکستان APP لە داکا کرایە بارەگای ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسی ئەو ولاتە نوێیە.

سەرەتا تەنیا لە داکا و چیتاگۆنگ نووسینگەی هەبوو، بەلام ئێستا BSS نووسینگەی لە راجشاهی و رانگاماتی و سیلهیت هەیە. ئاژانسەکە هەواڵنێری لە هەر ٦٤ یەکە کارگێڕییەکەی ولاتدا هەیە. نزیکەی ٥٠ ئابوونەدەری لە سەرتاسەی ولاتدا هەیە، لەوانە: ڕۆژنامە گرینگەکانی ولات و رادیۆ و تەلەفزیۆنەکان و ئاژانسگەلی نێودەوڵەتیی دەنگوباس کە نووسینگەیان لە داکا هەیە و بانکەکان و وەزارەتەکانی حکوومەت.

ئاژانسی BSS ئابوونەدەری دوو ئاژانسی سەرەکیی نێودەوڵەتییە، ڕۆیتەرز و فرانس پرێس. هەواڵیش لەگەڵ پرێس ترەستی هیندستان و ئەسۆشیێتد پرێسی پاکستان و چینهوا و بەرناما و ترانسداتادا ئاڵوگۆڕ دەکا.

هەر لە سەرەتاوە هەواڵەکانی بەزمانی ئینگلیزی بوون و لە ساڵی ١٩٩٩وە

خزمەتگوزارییەکی بەزمانی بەنگلایی هەیە.

## ئاژانسی تێلیگرافی بولگاریا BTA

مێژووی ئاژانسی تێلیگرافی بولگاریا BTA لە سەد ساڵ تێپەڕی کردووە. لە سەردەمی کۆمۆنیزمدا بازاڕی فرۆشتنی هەواڵی قۆرخ کردبوو و لە ژێر کۆنترۆڵی حکوومەتدا دەستی بەسەر بڵاوکردنەوەی هەواڵەکانی ئاژانسە نێودەوڵەتییەکاندا گرتبوو. تا ئێستاش BTA هەواڵ بەگشت میدیا نیشتمانییەکان دەفرۆشێ لەگەڵ ٦٠٪ میدیاکانی ناوچەکە و ١٥٠ کڕیاری نامیدیایی. دوای ئەوەی حکوومەت ئەو هاوکارییەی بە ئاژانسەکەی دەدا لە ١٠٠٪وە بۆ ٢٥٪ کەم کردەوە، BTA ناچار بوو خەرجییەکانی کەم بکاتەوە و لەم پێناوەدا ٥٠ نووسینگەی هەواڵنێریی لە دەرەوە داخست و ئێستا بۆ هەواڵە نێودەوڵتییەکان بەزۆری پشت بەئاژانسە بیانییەکان دەبەستێ. ئێستا تەنیا لە ڕێی ئینتەرنێت و ئیمێڵەوە زانیاری دەگوێزێتەوە.

## ئاژانسی دەنگوباسی کاریبی CANA

ئاژانسی دەنگوباسی کاریبی CANA لە ساڵی ١٩٧٦دا دامەزراوە و موڵکی ژمارەیەک لەو دەزگایانەی میدیایە کە ئابوونەدەری ئاژانسەکەن. خزمەتگوزارییەکانی دەگەنە نزیکەی ١٠٠ کڕیار لە ڕێی وایەری رادیۆوە و خزمەتگوزاریی ئینتەرنێت و وێنەشی هەیە. ئەم ئاژانسە کاری نەریتیی ئاژانسی دەنگوباس دەکا، هەروەها ئینتەرنێت و کاری بیستراو و بینراویش و بەردەوام چالاکییە بازرگانییەکانی زیاد دەکا.

## ئاژانسی دەنگوباسی قوبرس CNA

ئاژانسی دەنگوباسی قوبرس CNA بەفەرمی لە ١٦ی شوباتی ١٩٧٦ دامەزرا بەدەسپێشخەریی بەڕێوەبەری گشتیی دەستەی وەشانی قوبرس، ئەندریاس کریستۆفیدس. پێشتر میلتیادس کریستۆدۆلۆ لە ساڵی ١٩٥٧دا ئاژانسێکی هەواڵی تایبەتی بەو ناوە دامەزراندبوو، بەڵام لە ١٩٦٧دا داخرا.

کەلوپەلی ئەم ئاژانسە لە لایەن بەڕێوەبەرایەتیی ڕۆژنامەوانی و زانیارییەوە دابین

کران و سەرەتا بەڵاڤۆکێکی ڕۆژانەی هەواڵ بەزمانی ئینگلیزی دەردەکرا و دەدرایە ڕۆیتەرز و پوولی ئاژانسەکانی دەنگوباسی وڵاتانی بێلایەن. لە ساڵی ۱۹۸٤وە CNA چالاکییەکانی خۆی فرەوان کرد و ڕۆژنامەوانی زیاتری دامەزراند و توانیی وەرگێڕان و بڵاوکردنەوەی بەڵاڤۆکەکانی بەزمانگەلی تر، جگە لە ئینگلیزی، مسۆگەر بکا.

لە ۱۹۸۹دا ئەنجوومەنی نوێنەرانی قوبرس یاسایەکی دەرکرد و بەپێی ئەو یاسایە ئاژانسی دەنگوباسی قوبرس CNA بووە دامەزراوەیەکی هەواڵی نیمچە حکوومەتیی خاوەن سەربەخۆییی تەواوی نووسیاری.

لە ۲۰۰۲دا CNA بەڵاڤۆکێکی تورکیی دەرکرد. ئەندامی هاوپەیمانیی ئاژانسەکانی دەنگوباسی دەریای ناوەڕاستە AMAN.

## ئاژانسی ناوەندیی دەنگوباس CNA (تایوان)

لە ۱ی نیسانی ۱۹۲٤ لە گوانگژوو لە باشووری چین دامەزراوە و ئاژانسی ناوەندیی دەنگوباس CNA دوای گواستنەوەی بۆ تایپێ لەگەڵ حکوومەتە نیشتمانییەکەدا لە تشرینی یەکەمی ۱۹٤۹وە ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسی تایوانە. بەپێی یاسایەک لە ۱۹۹٦ دەرچوو، CNA بووە کۆمپانیایەکی کەرتی گشتی کە بەسەربەخۆیی بەڕێوە دەبرێ. داپۆشینەکانی CNA هەموو جیهان دەگرنەوە و لە گشت شارەکانی تایواندا هەواڵنێری هەیە، هەروەها لە ۳٥ شاری ئەودیوی دەریاکانیشدا.

ئابوونەدەرانی CNA بریتین لە نزیکەی هەموو ڕۆژنامە و گۆوار و رادیۆ و تەلەفزیۆنەکانی وڵات، هەروەها خزمەتگوزاری پێشکێشی دەزگاکانی حکوومەت و دامەزراوە ئەکادیمیاییەکان و پیشەسازییەکانی کەرتی تایبەت دەکا. هەواڵەکانی بەزمانی چینی و ئینگلیزی و ئیسپانین.

لە نیسانی ۲۰۰۳دا خزمەتگوزاریی هەواڵی تەلەفزیۆنیی ڕۆژانەی بۆ چینییەکانی ئەودیوی دەریاکان دابین کرد.

## پرێسی کەنەدایی CP

پرێسی کەنەدایی CP لە ١٩١٧دا دامەزراوە و خزمەتگوزارییە فەرەنساییەکەی لە ١٩٥١دا دەستی پێ کردووە و هەواڵ پێشکێشی دەزگاکانی وەشان و ڕۆژنامەکان و ئینتەرنێت دەکا. هاوپشکەکان ٩٩ ڕۆژنامە و ٥٠٠ دەزگای وەشانن. لە بەشەکانی CP زیاتر لە ٣٠٠ ڕۆژنامەوان کار دەکەن. خزمەتگوزاریی وێنەی CP هەموو خزمەتگوزارییەکانی پێوەست بەوێنەوە پێشکێش دەکا و ئەرشیڤێکی وێنەی هەیە کە زیاتر لە ٤٠٠ هەزار وێنەی تێدایە.

## ئاژانسی دەنگوباسی چیک CTK

ئاژانسی دەنگوباسی چیک CTK لە ١٩٩٢ دامەزراوە. کۆمپانیایەکی گشتییە بۆ کۆکردنەوە و نووسیاری و کۆگەکردن و بڵاوکردنەوەی زانیاری بەدەق و بەوێنە. لە سەرەتای ١٩٩٦وە CTK هیچ هاوکارییەکی نە لە حکوومەت و نە لە هیچ لایەکی تر وەرنەگرتووە و، تەنیا بەچالاکییە بازرگانییەکانی خۆی پارەدار دەکا و لە ١٩٩٧وە بووەتە دەزگایەکی قازانج ویست. خزمەتگوزارییەکانی دەفرۆشرێنە زۆربەی میدیای چیک و میدیای سلۆڤاک و فەرمانگەکانی حکوومەت و دامەزراوە گشتییەکان و بانکە گرینگەکان و کۆمپانیاکانی وەبەرهێنان و کۆمپانیا پیشەسازییەکان و تاکەکانیش. جگە لە خزمەتگوزاریی گشتیی هەواڵ، CTK ئەم خزمەتگوزاریيانەشی هەیە: وەرزش، بازرگانی، دارایی، کورتکراوەی هەواڵ و باکگراوند بۆ ڕووداوەکانی داهاتوو.

## داو جۆنز

وایەرەکانی هەواڵی داو جۆنز لە ١٨٨٢ دامەزراون و مەزنترین پێشکێشکەری هەواڵەکانی بازرگانی و دراو و ئابووری و جووڵەی بازاڕ و سیاسەتە لە کاتی ڕووداویاندا. زیاتر لە ٣٩٠ هەزار شارەزای دارایی لە ٦٦ وڵات ئابوونەدەری ئەم خزمەتگوزارییەن. زیاتر لە ٩٠٠ نووسیار و هەواڵدەری هەواڵی خێرا و لە کاتی ڕوودانیدا بەشێکن لە تۆڕی هەواڵی داو جۆنز. داو جۆنز لە سەرتاسەری جیهاندا ٣٦٥٠ هەواڵنێری هەیە.

## dpa

ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی ئەڵمان dpa لە ١٩٤٩ دامەزراوە و ئێستا گەورەترین ئاژانسی دەنگوباسی ئەڵمانیا و یەکێکە لە گەورەترین دەزگاکانی هەواڵی جیهان. dpa کۆمپانیایەکی سنووردارە و نزیکەی ٢٠٠ خاوەن پشکی هەیە (بڵاوکەرەوەی ڕۆژنامە و کۆوار، دەزگای چاپ، دەزگای وەشانی گشتی و تایبەتی). هیچ خاوەن پشکێک بۆی نییە زیاتر لە ١,٥٪ی سەرمایەی دەزگاکەی هەبێ و کۆمپانیاکانی وەشان نابێ سنووری ٢٥٪ی خاوەن پشکەکان ببەزێنن. ئەمەش ڕێگرە لە باڵادەستیی هیچ خاوەن پشکێک بەسەر کۆمپانیاکەدا.

تۆڕی هەواڵنێران ڕۆژانە ٢٤ سات لە سەرتاسەری جیهانەوە چیرۆکی هەواڵ و وێنە و گرافیک و ڕاپۆرتی ڕادیۆیی بۆ ئاژانسەکە ئامادە دەکەن. نزیکەی هەزار ڕۆژنامەوان و ٥٠ وێنەگر کار لەو تۆڕەدا دەکەن.

## EFE

ئاژانسی EFE لە ساڵی ١٩٣٩دا لەدایک بووە و گەورەترین ئاژانسی ئیسپانی زمان و چوارەمین گەورە ئاژانسی جیهانە. بارەگای سەرەکیی لە مەدریدە و نووسینگەکانی لە ١٤٠ شاری زیاتر لە ١٠٠ وڵات کار دەکەن و هەواڵ لە کاتی ڕوودانی بڵاو دەکەنەوە. ١٠٠٠ ڕۆژنامەوان و ٢٠٠٠ هەواڵنێر لە سەرتاسەری جیهاندا کار دەکەن بۆ ئەوەی ئەم ئاژانسە ڕۆژانە ٢٤ سات بەردەوام بێ. بەرهەمی ساڵانەیان بریتییە لە یەک ملیۆن بابەتی هەواڵ و ١٠٠ هەزار وێنەی فۆتۆگراف و ٣٠٠٠ وتار و ٧٠٠٠ ڕاپۆرتی ڕادیۆ و ٤٠٠٠ ڤیدیۆ کلیپ.

هەروەها EFE بنکەیەکی زانیاریی هەیە کە بەبەردەوامی نوێ دەکرێتەوە و بەدرێژاییی ڕۆژ لەبەر دەستانە، لەو بنکەی زانیارییەدا دوو ملیۆن و نیو بەڵگەنامەی دە ساڵی دوایی دەست دەکەون و دەکرێ لە ڕێی ئینتەرنێتەوە ببینرێن. ١٣ ملیۆن نێگەتیڤی وێنەی هەیە ـ مێژوویەکی بینراوی سەدەی بیستەمە.

## ELTA

ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسی لیتوانیا ELTA لە ١ی نیسانی ١٩٢٠ دامەزراوە و تا ساڵی ١٩٤٠ پێوەندیی لەگەڵ گەورە ئاژانسەکانی جیهاندا هەبوو وەک ڕۆیتەرز و هاڤاس و ستیفانی و تاس. کاتێ هێزەکانی بۆلشەڤیک لە ١٩٤٠دا لیتوانیایان داگیر کرد، ELTA لە لایەن تاسەوە قووت درا و تا ١٩٩٠ هەواڵی لە مۆسکۆوە بۆ دەهات. لە دوای بەدەستهێنانەوەی سەربەخۆیی نیشتمانی لە ١٩٩٠ دووبارە ELTA دامەزرایەوە و پێوەندییەکانی لەگەڵ ئاژانسە جیهانییەکان زیندوو کردەوە. لە ١٩٩٢ بووە ئەندامی یەکیەتی ئاژانسەکانی ڕۆژنامەوانیی ئەوروپا. لە ساڵی ١٩٩٦ بەبڕیارێکی کۆماری لیتوانیا، ELTA بووە ئاژانسێکی نیشتمانیی سەربەخۆی دەنگوباس. ئێستا ئاژانسەکە کۆمپانیایەکە ١٢٧ پشکدار خاوەنین و ژمارەی پشکەکانی ٦٨٣٦٠ پشکە و دەستەیەکی هەڵبژێرراوی حەفت کەسی بەڕێوەبەری گشتی دادەمەزرێنێ بۆ بەڕێوەبردنی.

ڕۆژانە زیاتر لە ٣٥٠ دەق و وێنەی هەواڵ بەرهەم دێنێ.

## ئاژانسی دەنگوباسی ئەسیوپیا ENA

ئاژانسی دەنگوباسی ئەسیوپیا ENA لە ساڵی ١٩٤٢ دامەزرا و لە ١٩٤٧ بەهۆی کەمکردنەوەی بودجەوە داخرا. دوایی لە ١٩٥٤ دامەزرایەوە. لە ١٩٨٦ ژمارەی کارمەندانی گەیشتە ١٢٢ کارمەند. ئێستا لە ENAدا ١٢٥ ڕۆژنامەوان کار دەکەن.

## ئاژانسی پرێسفۆتۆی ئەوروپا epa

ئەم ئاژانسە لە ١٩٨٥دا دامەزراوە، لە لایەن ئاژانسە نیشتمانییە سەرەکییەکانی هەواڵی ئەوروپا و ئاژانسەکانی وێنەوە. خاوەن پشکەکانی سەرەتایی: APA، ANP، ANSA، Belga، dpa، EFE، Keystone و LUSA تا ئێستا لەگەڵ پشکدارە نوێکانیش: PAP (پۆڵەندا) و ANA (یۆنان) بەردەوامن لە پێشکێشکردنی داپۆشینی گشتگیری وێنەی ڕۆژئاوا و ناوەڕاستی ئەوروپا. ئێستا لە سەرتاسەری جیهاندا ٤٠٠ وێنەگری ئەم ئاژانسە کار دەکەن و ڕۆژانە ٦٥٠ وێنە بەرهەم دێنن.

## ئاژانسی باوەڕ

ئاژانسی باوەڕ Fides لە ١٩٢٦ دامەزراوە و پێشتر بەئاژانسی جیهانی باوەڕ ناسرابوو، ئاژانسی دەنگوباسی ڤاتیکانە. هەواڵ و وێنە و بابەتی میدیایی بڵاو دەکاتەوە. لە ئینتەرنێتدا بەزمانەکانی ئیتالی و ئیسپانی و ئینگلیزی و فرانسەیی و پۆرتۆگالی و ئەڵمانی و چینی بڵاو دەکاتەوە.

## ئاژانسی دەنگوباسی گانا GNA

ئاژانسی دەنگوباسی گانا GNA لە ١٩٥٧ دامەزراوە. ئەم ئاژانسە لەبەرئەوەی یەکەمین ئاژانس بوو لەو ناوچەیەدا گرفتی زۆری هاتنە پێش بەهۆی سیاسەتی وەزیرەکانی حکوومەتەوە و کاتی بووە ئاژانسێکی کەرتی تایبەت ئەو پێوەندییەی لەگەڵ حکوومەتدا هەیبوو گۆڕا. لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێستا ٩٠٪ خەرجییەکانی ئاژانسەکە حکوومەت دابینی دەکا. ساڵی ١٩٨٩ بەهاوکاریی یونسکۆ کۆمپیوتەرێنرا. ٢١٧ کەس لەم ئاژانسەدا کار دەکەن.

## HINA

ئاژانسی دەنگوباسی HINAی کرواتیایی لە ١٧ی ئابی ١٩٩٠ دەستی بەکار کرد و یەکەمین کاری داپۆشینی ڕووداوەکانی ناوچەی کرایینا بوو، کە پێشینەی ئەو شەڕە بوون لە ١٩٩١دا دژ بەکرواتیا هەڵگیرسا. ئاژانسی HINA ئاژانسێکی حکوومەتییە و نیوەی خەرجییەکانی لە بودجەی حکوومەت و نیوەکەی تری لە داهاتی خۆیەوە دابین دەکرا. ژمارەی کارمەندانی HINA بەتێکڕا ١٥٩ کەسە و نزیکەی ٧٥٪یان ڕۆژنامەوان و نووسیارن. بەشی هەواڵی لە بەلگراد و لوبیانا و مۆستار و سەرایێڤۆ و واشنتۆن هەیە. هەواڵنێریشی لە گشت شارە سەرەکییەکانی کرواتیا هەیە و بەرهەمەکانی بەزمانی کرواتیایی و ئینگلیزین.

ڕۆژانە ٢٠٠ هەواڵی جۆراوجۆری ناوخۆیی و نێودەوڵەتیی هەیە و زیاتر لە ٤٠٠ ئابوونەدەریشی هەیە. هەروەها خزمەتگوزاریی ڕۆژانەی دەقی کراوەی هەیە بۆ ڕاگەیاندنی ڕۆژنامەوانی و لێدوان و ڕاپۆرتی هەواڵ بەزمانەکانی کرواتیایی یان ئینگلیزی یان ئەڵمانی.

## ئینتەرفاکس

ئاژانسی دەنگوباسی ئنتەرفاکس لە لایەن کۆمەڵێ لە بەرپرسانی رادیۆی مۆسکۆوە لە ١٩٨٩ دامەزرا و ئێستا بەشێکە لە گرووپی ئینتەرفاکس ئینفۆرمەیشن سێرڤس. گرووپەکە ئێستا لە ٣٠ کۆمپانیا پێک هاتووە و چەندین لکی هەیە لە سەرتاسەری ڕووسیا و چین و چەند وڵاتێکی ناوەڕاست و ڕۆژهەڵاتی ئەوروپادا بەناوی ئینتەرفاکسەوە کار دەکەن. نزیکەی ١٠٠٠ کەس لە زیاتر لە ٧٠ بیرۆدا ڕۆژانە زیاتر لە ١٥٠٠ چیرۆک بەرهەم دێنن.

## ئینتەر پرێس سێرڤس IPS

ئینتەر پرێس سێرڤس IPS لە ١٩٦٤دا دامەزراوە وەک کۆمپانیایەکی هاوبەشی قازانج نەویستی ڕۆژنامەوانان. لە سەرەتادا ئامانجی سەرەکیی ئاژانسەکە پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییی زانیارییەی نێوان ئەوروپا و ئەمەریکای لاتین کە بەهۆی بشێویی سیاسیی دوای شۆڕشی ١٩٥٩ی کووباوە دروست بووبوو. تۆڕی ئەم ئاژانسە بەرێکی فرەوان بووەوە تا ئاسیا و ئەفریقاشی گرتەوە. بۆیە ئامانجەکانیش فرەوان بوونەوە بەرەو داپۆشینی "جیهانی سێیەم" و بوونە دەنگ بۆ بێدەنگان و بەهێزکردنی زانیاری لە بارەی پرسەکانی پێشکەوتنەوە و دروستکردنی هاوسەنگییەک لە ئاڵوگۆڕی هەواڵە نێودەوڵەتییەکاندا.

ئێستا IPS بەخۆی دەڵێ "ئاژانسی دەنگوباسی پێشەنگی کۆمەڵگەی مەدەنی". خزمەتگوزاریی وۆرڵد سێرڤسەکەی زیاتر لە ١٢٠ وڵات دادەپۆشێ و بەهەردوو زمانی ئینگلیزی و ئیسپانییە و وەردەگێڕێتە زمانەکانی فرانسەیی و ئەڵمانی و فینلەندی و هۆڵەندی و سویدی و ژاپۆنی و پۆرتوگالی و تایلاندی و مەندەرین و نیپالی و کیسواحیلی. بەرهەمی ڕۆژانەی ئێستا دەگاتە نزیکەی ١١٢ هەزار وشە.

## ئیتار-تاس

ئاژانسی تێلیگرافی زانیاریی ڕووسیا (ئیتار-تاس) کە لە ساڵی ١٩٠٤وە هەیە، یەکێکە لە گەورەترین ئاژانسەکانی جیهان و میراتگری ئاژانسی تاسی سۆڤێتە و لە

سالّی ١٩٩٢ ئەم ناوەی لێ نرا کاتێ ڕووسیا دوای هەرەسی یەکیەتیی سۆڤێت سەربەخۆیی خۆی وەرگرتەوە. ئیتار-تاس لە ٢٠٠٤دا سەد ساڵ تەمەنی تەواو کرد.

سەرچاوەکانی ئەم ئاژانسە کە پێشتر لەبەر دەستی کەمێکدا بوو، ئێستا ئەوەی ئارەزوو بکا، لە میدیاکان و دامەزراوە ئەکادیمیاییەکان و ڕێکخراو و تاکەکان، پێیان دەگا چ لە ناوەوەی ڕووسیا بێ یان لە دەرەوە.

ئیتار-تاس زیاتر لە ١٣٠ نووسینگەی لە ڕووسیا و دەرەوەدا هەیە. هەروەها هاوکاری ٨٠ ئاژانسی دەنگوباسی بیانییە و دەستەی نووسیاری و بەشەکانی تری زانیاری لە هەواڵنێرانەوە وەردەگرن و ڕاستییەکان پشتڕاست دەکەنەوە و شییان دەکەنەوە و وەریان دەگێڕنە پێنج زمانی بیانی.

## ئاژانسی دەنگوباسی کۆماریەتی JANA

ئاژانسی دەنگوباسی کۆماریەتی JANA ئاژانسی فەرمیی دەنگوباسی لیبیایە، لە ١٩٦٤دا بەبڕیارێکی حکوومەت دامەزراوە و ئەو بڕیارە لە ساڵی ١٩٧٠ دوای شۆڕش هەموار کرا. ژمارەی کارمەندانی ئاژانسەکە زیاتر لە ٣٠٠ کەسە و دە نووسینگەی لە دەرەوەی وڵاتدا هەیە لە لەندەن و پاریس و ڕۆما و قاهیرە و تونس و دیمەشق و ریبات، جگە لەو نووسینگانەش لە چەند وڵاتێکدا هەواڵنێری هەیە و لە ناو وڵاتیشدا ژمارەیەکی زۆر نووسینگەی هەیە کە بەستراون بەبارەگای سەرەکییەوە لە تەرابلوس.

جگە لە خزمەتگوزارییە سەرەکییەکەی کە بەعارەبییە، JANA خزمەتگوزاریی بەهەردوو زمانی ئینگلیزی و فرانسەیی هەیە. هەروەها JANA ئەندامە لە فیدراسیۆنی ئاژانسە عارەبەکانی دەنگوباس و پوولی ئاژانسەکانی دەنگوباسی مەغریبی عارەب (کە لیبیا و تونس و جەزائیر و مەراکش لەخۆ دەگرێ) و ئەندامیشە لە هاوپەیمانیی ئاژانسەکانی دەنگوباسی دەریای ناوەڕاست.

## ژیژی پرێس

ژیژی پرێس لیمتد، وایەرێکی هەواڵی ژاپۆنییە لە تشرینی دووەمی ١٩٤٥ دامەزرا، ئەویش بەهۆی تواندنەوەی ئاژانسی دەنگوباسی دۆمای کە مولّکی دەوڵەت بوو لە

کۆتایی شەڕی دووەمی جیهاندا. ئەم ئاژانسە بەڕێوەبردنەکەی سەربەخۆیە و ١٠٠٪ مـوڵکی ئەو کـەسـانـەیە کـە کـاری تێـدا دەکـەن. جگـە لە پێـشکێـشکردنی هـەواڵی جـۆراوجـۆر بەمـیـدیاکـانی ژاپۆن و دەرەوە، هەواڵی دارایی و ئابووری پێـشکێـشی کۆمپانیاکان و دەزگاکانی حکوومەت و ئەوانی تر دەکا. هەروەها کتێب و هەواڵنامە چاپ دەکا و بڵاویان دەکاتەوە، لەگەڵ ئەنجامدانی ڕاپرسی و سازکردنی سیمینار لە ناوەوە و دەرەوەی ژاپۆندا. ئەم ئاژانسـە ١٤٠٠ کارمەندی هەیە لەگەڵ ٨٢ نووسـینگە و لق لە ناو ژاپۆن و ٢٩ی تر لە دەرەوە.

## کازئینفۆرم

کازئینفۆرم ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسی کازاخستانە و میراتگری ئاژانسی کازتاگە کە یەکێک بوو لە لقەکانی ئاژانسی تاسی سۆڤێت. ئێستا کۆمپانیایەکی هـاوبەشـی کـراوەیە و هـەمـوو پشکەکـانی هـی حکوومـەتن. گـەورەترین تۆڕی هەواڵنێرانی لە کازاخستاندا هەیە کە هەموو کونجێکی ئەو وڵاتە دادەپۆشن.

## ئاژانسی ناوەندیی دەنگوباسی کۆریا KCNA

ئاژانسی ناوەندیی دەنگوباسی کۆریا ئاژانسی حکوومەتیی کۆماری دیموکراتی گەلی کۆرییایە. لە ٥ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٦ دامەزراوە. ئەم ئاژانسە قسەکەری پارتی کرێکارانی کۆریا و حکوومەتەکەیەتی و بارەگای سەرەکیی لە پیۆنگیانگە. هەڵوێست و بۆچوونی حیزب و حکوومەت بەکۆریا و دەرەوەی وڵات ڕادەگەیەنێ، لە ڕێیی راپۆرت و ڕاگـەیاندنی فـەرمـیـیـەوە لەگـەڵ زانیـاری لەسـەر سـیـاسـەتە نیـشـتـمـانیـیـەکـان و باری ئابووری و کـولتـووری. هەواڵەکـانی بۆ وڵاتانی دەرەوە بەزمانەکانی ئینگلیزی و ڕووسی و ئیسپانی بڵاو دەکاتەوە.

## ئاژانسی دەنگوباسی کوێت KUNA

ئاژانسی دەنگوباسی کـوێت KUNA بەفـەرمـانێکی ئەمـیری کـە لە ٦ی تشـرینی یەکـەمی ١٩٧٩دا دەرچوو دامـەزراوە. ئامـانجـەکـانی ئـەم ئاژانسـە بریتی بوون لە کۆکردنەوەی هەواڵ و بڵاوکردنەوەی بەسـەر تاکەکان و دەزگاکانی میدیادا بۆ ئەوەی

خزمەتگوزارییەکی بابەتییانەی هەواڵیان پێ بگا و جەخت بکاتە سەر پرسە ڕەواکانی کوێت لە ناوچەکە و لە جیهاندا. هەرچەندە لە کاتی داگیرکردنی کوێت لە لایەن عێراقەوە کەلوپەل و ئەرشیفی ئاژانسەکە بەتاڵان بران، بەڵام زوو توانیی دووبارە لەسەر پێی خۆی بوەستێتەوە.

لە کاتی داگیرکردنی کوێت ئاژانسی دەنگوباسی کوێت لە ١٣ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٠ لە لەندەنەوە دەستی بەکار کردەوە. لەو ڕۆژەوە تا تشرینی دووەمی ١٩٩١ توانیی ١٦١١٠ بابەتی هەواڵ بگوێزێتەوە و لە ١٥ی تشرینی دووەمی ١٩٩١دا دووبارە لە کوێتەوە دەستی بەچالاکییەکانی خۆی کردەوە و ڕۆژانە تەنیا ٤٠ هەواڵی هەبوو و ئەم ژمارەیە لە ١٩٩٩دا بووە ٤٢٠٠٠ , ژمارەی کارمەندانی لە ساڵی ١٩٧٨دا تەنیا ٧٥ کەس بوو و لە ١٩٩٩ بوون بە٣٦٥ کەس. KUNA لە ١٧ وڵاتدا نووسینگەی هەیە و ئەندامە لە فیدراسیۆنی ئاژانسەکانی دەنگوباسی عارەبدا.

## کیۆدۆ

ئاژانسی کیۆدۆ لە تشرینی دووەمی ١٩٤٥ لەدایک بووە و کۆمپانیایەکی قازانج نەویستە بەبودجەیەکی ساڵانە بەڕێوە دەچێ کە بەئابوونەی ئەندامان و ئەو پارەیەی لە بەرامبەر خزمەتگوزارییەکانی لە نائەندامەکان دەست دەکەوێ دابین دەکرێ.

نزیکەی ١٠٠٠ ڕۆژنامەوان و وێنەگر کار بۆ کیۆدۆ دەکەن، زیاتر لە نیوەی ئەمانە لە بارەگای سەرەکی لە تۆکیۆن و دابەش کراون بەسەر بەشەکانی سیاسەت، دارایی، شار، وەرزش، زانست و کولتووردا، ئەوانەی تریش لە پێنج نووسینگەی هەرێمی و ٤٨ نووسینگەی ناوخۆییدا لە سەرتاسەری وڵات کار دەکەن. بۆ دابینکردنی هەواڵەکانی دەرەوەش نزیکەی ٧٠ هەواڵنێر و ٤٠ هاوکاری لە ٥٠ شوێنی دەرەوەی ژاپۆندا هەیە. بەزۆری هەواڵەکانی جەخت لەسەر ناوچەی ئاسیا- پاسیفیک دەکا و لە ١٩ شوێنی ئەو ناوچەیەدا نزیکەی ٥٠ کارمەندی هەیە. دووەمین گەورەترین کۆبوونەوەی هەواڵنێرانی لە ئەمەریکای باکورە و دوای ئەوێ لە ئەورووپایە و ئینجا ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەمەریکای لاتین و ئەفریقا دێن. کیۆدۆ لە کاتی دامەزراندنیەوە لە ساڵی ١٩٦١، ئەندامە لە ڕێکخراوی ئاژانسەکانی دەنگوباسی ئاسیا-پاسیفیک.

## لانکاپوڤات

لانکاپوڤات لیمیتد، ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسی سری لانکایە و لە ١٩٧٨ وەک کۆمپانیایەکی سنووردار بۆ هەردوو مەبەستی وەرگرتنی هەواڵی دەرەوە و بڵاوکردنەوەی بەناو وڵاتدا و گەیاندنی هەواڵەکانی سریلانکا بەجیهانی دەرەوە دامەزرا.

هەرچەندە لە ساڵی ١٩٩٧دا وەزیری ڕاگەیاندنی سری لانکا مانگالا ساماراویرا ڕای گەیاند کە لانکاپوڤات هەڵدەوەشێتەوە، بەڵام تا ٢٠٠٥یش هەر لە چالاکیی بەردەوامدا بوو.

## LETA

ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسی لاتڤیا LETA لە ساڵی ١٩١٩ دامەزراوە و زانیاریی تەواو و چارەسەر پێشکێشی کۆمپانیاکانی لاتڤیا و کۆمپانیا بیانییەکان و ئەو ڕێکخراوانەی لە لاتڤیا کار دەکەن، دەکا. ئەو ناوبانگە مێژووییە و شارەزاییە زۆر و نەرێت و وەبەرهێنانی سەرمایە هەموویان بوونەتە هۆی مسۆگەرکردنی پێگەیەکی جێگیر بۆ LETA لە بازاڕی زانیاریی بەڵتیکدا.

ئاژانسەکە ڕۆژانە بەڵاڤۆکێکی هەواڵ دەردەکا کە ٤-٥ لاپەڕە و لە ڕێی ئیمێڵ یان فاکس یان تۆڕی جیهانییەوە دەگاتە کڕیارەکانی. هەروەها هەموو هەواڵەکانی LETA بەزمانی ئینگلیزی دەست دەکەون. مانگانەش بەڵاڤۆکێک بەناوی ئابووریی لاتڤیا دەردەچێ.

## LUSA

ئاژانسی دەنگوباسی پۆرتۆگال LUSA کە خاوەنداریی هاوبەشە لە نێوان حکوومەت و هاوبەشەکانیدا لە ساڵی ١٩٨٦ دامەزراوە. ئەم ئاژانسە زیاتر لە ٢٠٠ ڕۆژنامەوان و هەواڵنێر و وێنەگر و هەواڵدەری هەیە کە لە هەموو پایەتەختە هەرێمییەکانی پۆرتۆگال و میترۆکانی لیشبۆن و پۆرتۆدا کار دەکەن، لەگەڵ ٨٠ ڕۆژنامەوان لە ناوچە جیاجیاکانی جیهان. ڕۆژانە ٨٠٠ چیرۆکی هەواڵ و ٢٥٠ وێنە

له بارەی پۆرتۆگـال و جـیـهـان بڵاودەکـاتەوە. هـەواڵنێـری هـەیە لە: پاریس، لەندەن، جنێڤ، رۆمـا، بەرلـین، مـۆسکۆ، واسـنتـۆن، برازیلیـا، س پـاولۆ و ریۆ دی جـانێـرۆ، ریبات و تەل ئەبیب و سیدنی و نووسینگەی لە مەدرید و برۆکسل هـەیە.

## ماکفاکس

ئاژانسی تـایبـەتی دەنگوبـاسـی مـاکـفـاکس (لە ۱۹۹۲ دامـەزراوە) لە ئایاری ۱۹۹۳ دەستی بەکار کرد و یەکێکە لـە دەزگا میدیاییە یەکەمەکانی مـەکەدۆنیا. ئاژانسـەکە خـۆی بەئاژانسـێکی ناوچـەیی دەژمـێرێ کە داپـۆشـینی تەواو بۆ وڵاتانی مـەکـەدۆنیـا، ئەلبـانیا، بولگاریا، یۆنان، تورکیا و وڵاتانی یەکیـەتیی یۆگۆسلاڤیای پێشوو دەکا و ڕۆژانە ۹۰ تا ۱۰۰ هـەواڵی هـەیە. مـاکفاکس تەنیـا هـەفت کـارمەندی هـەیە کـە دەوامی تەواو بکەن.

## ئاژانسی مەغریب عارەبی MAP

شا محـەمەدی پێنجەم لە ۱۸ی تشرینی دووەمی ۱۹٥۹ ئاژانسـی مـەغریب عارەبیی MAP کردەوە کە ئـاژانسـی نیشتمـانیی مەراکشە. لە سـەرەتادا کۆمپانیـایەکی کەرتی تایبـەت بوو و لە سـاڵی ۱۹۷۳دا کـرایە ئاژانسـێکی سـەر بەدەوڵەت. بەرهـەمـەکـانی بەچوار زمان بڵاو دەکرێنەوە: عارەبی و فرانسەیی و ئینگلیزی و ئیسپانی.

ژمارەی کـارمەندانی ئاژانسەکە لە ٦۰۰ کەس زیاترە کە تیـایاندا ۲۷۰ ڕۆژنامەوان هـەیە و، ڕۆژانە ٥٥۰ تا ٦۰۰ کۆمەڵە هـەواڵ بەرهـەم دێنن.

## میدیافاکس

ئاژانسی دەنگوبـاسـی مـیدیافـاکسی رۆمـانیـا لە ۱۹۹۱ دامـەزراوە و یەکەمین کـاری گـرووپی مـیدیاپرۆ بوو. ڕۆژانە مـیدیافـاکس ٤٥۰ چیرۆک بـەرهـەم دێنێ کە بوارەکـانی کۆمەڵگە، ڕووداوی تایبـەت، ئابووری، کولتوور، سیاسـەت، وەرزش و کات بەسەربردن دادەپۆشن. مـیدیافـاکس نزیکەی ۱٥۰ هـەواڵدەری لە زیاتر لە ٤۰ شـاری رۆمـانیـا و لە ئەمەریکا، فرانسە، بەلجیکا، ڕووسیا، هـەنگاریا، بولگاریا و مۆڵدۆڤادا هـەیە.

### ئاژانسی دەنگوباسی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست MENA

ئاژانسی دەنگوباسی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست MENA لە ١٥ی کانوونی یەکەمی ١٩٥٥ وەک کۆمپانیایەکی هاوبەش دامەزرا و خاوەنەکانی بریتی بوون لە دامەزراوە ڕۆژنامەوانییەکانی میسر. لە ساڵی ١٩٦٠ لەگەڵ دامەزراوە ڕۆژنامەوانییەکانی تردا خۆماڵی کرا و درایە وەزارەتی ڕاگەیاندن. لە ١٩٧٨ بووە دەزگایەکی نیشتمانیی ڕۆژنامەوانی و درایە ئەنجوومەنی شوورا. ئێستا MENA یەکێکە لە بەهێزترین ئاژانسەکانی دەنگوباسی ناوچەکە و گەورەترین ئاژانسی عارەب و ئەفریقاییە و لە ڕیزبەندیی ئاژانسە نێودەوڵەتییەکاندا پلەی یازدەیەمی هەیە. تۆڕی نووسینگەکانی MENA لە دەرەوە لە ٣٨ نووسینگە و هەواڵنێر پێک هاتووە، ١٦یان لە وڵاتانی عارەب و ١١ لە ئەورووپا و ئەمەریکا و ٤ لە ئەفریقا و ٥ لە ئاسیا.

لە ساڵی ١٩٨١دا گوێزرایەوە باڵەخانەیەکی سەربەخۆی ١٣ نهۆم و ئێستا زیاتر لە ١٢٠٠ کارمەندی هەیە و ٢٥٠ هەزار وشە بڵاو دەکاتەوە بەزمانەکانی عارەبی و ئینگلیزی و فرانسەیی. هەروەها MENA دە بەڵاڤۆکی تایبەتمەند بەزمانی عارەبی لە بوارەکانی تێکتۆلۆجیا، کشتوکاڵ، ژینگە، دەرمانسازی، پیشەسازی، وزە، زانست، کۆمپیوتەر، کولتوور و هونەر، ئافرەت و منداڵ بڵاو دەکاتەوە.

### ئاژانسی زانیاریی مەکەدۆنیا MIA

ئاژانسی MIA بەبڕیارێکی پەرلەمانی مەکەدۆنیا دامەزرا و بەبڕیارێکی حکوومەتی کۆماری مەکەدۆنیا لە ١٩٨٨دا کرا بەدامەزراوەیەکی گشتی و لە ٣٠ی ئەیلوولی ١٩٩٨دا کەوتە کار. ئەندامی کۆمەڵەی ئاژانسەکانی دەنگوباسی بەلکانە و هاوکاری dpaی ئەڵمانیا و چینهوای چین و بی بی سی وۆرڵد و دۆیچە ڤێللا و ڕادیۆی ئەورووپای ئازاد دەنگی ئەمەریکایە. پەنجا ڕۆژنامەوانی هەیە و لە ڕۆژێکدا ٢٤ سات کار دەکا. بەرهەمەکانی بەزمانی ئەلبانی و ئینگلیزین.

### مۆنتسیم

ئاژانسی دەنگوباسی مۆنگۆلیا لە ١٩٢١دا لە لایەن حکوومەتەوە بەناوی مۆنتا، ئاژانسی تێلیگرافی مۆنگۆلیا، دامەزرا. تا ساڵی ١٩٥٧ لە پاڵ ئاژانسەکانی

دەنگوباسی ڕووسیادا کاری دەکرد و لە نێوان ١٩٥٧ و ١٩٩٠ هاوکاری تۆڕەکانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی مۆنگۆلیا بوو و لە ١٩٩٠ سەربەخۆیی تەواوی بەدەست هێنا. ئێستا مۆنتسیم زیاتر لە ١٢٠ کارمەندی هەیە.

## ماگیار تاڤیاتی ئیرۆدا MTI

ئاژانسی MTI لە ساڵی ١٨٨٠ دامەزراوە و کۆنترین ئاژانسی نیشتمانییە. پێشتر مۆنۆپۆل بوو و ئێستاش باڵادەستە لە بازاڕی ئاژانسەکانی دەنگوباسی هەنگاریا. لە ١ی کانوونی دووەمی ١٩٩٧وە MTI لە کۆمپانیایەکی حکوومەتەوە بوو بەکۆمپانیایەکی گشتی دەستەیەک لە بڕواپێکراوان کە نوێنەری حیزبەکانی ناو پەرلەمانن بەڕێوە دەچێ.

## ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی نامیبیا NAMPA

ئاژانسی NAMPA لە ١٩٩١دا وەک ئاژانسی نیشتمانیی نامیبیا دامەزرا بۆ بڵاوکردنەوەی هەواڵی ناوخۆیی و ناوچەیی و نێودەوڵەتی و خزمەتگوزارییەکی وێنە.

خزمەتگوزارییەکانی بریتین لە هەواڵ، ڕووداوی وەرزشی، هەواڵی بازرگانی و ئابووری و وێنە لە هەموو شوێنێکی وڵاتەوە.

## ئاژانسی دەنگوباسی نایجیریا NAN

ئاژانسی دەنگوباسی نایجیریا NAN لە ئایاری ١٩٧٦ دروست کرا وەک ئاژانسێکی نیشتمانی وەی حکوومەتی نایجیریایە و خۆی کۆنترۆڵی دەکا. لە ١٩٨١ هەواڵنێری ناردە لەندەن و نیویۆرک و هاراری و لە ١٩٨٢ بۆ ئەبیجان و نایرۆبی و لە ١٩٨٤ بۆ بەلگراد و قاهیرە و نیو دێلهی و واشنتۆن و لە ١٩٨٥ بۆ مۆسکۆ.

## نێتنیوز

نێتنیوز ساڵی ١٩٩٨ لە لایەن تیمێکی ڕۆژنامەوانان بەسەرۆکایەتیی سۆفیا جۆردایدۆ وەک ئاژانسێکی دەنگوباسی تەلەفزیۆن دامەزرا و بارەگای لە ئەتینایە.

ناوچەی سەرەکیی داپۆشین بۆ نێتنیوز یۆنان و قوبرس و وڵاتانی بەلکان و

ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاستە. نێتنیوز توانیویەتی پێویستیی بازاڕی میدیا لەو ناوچانەدا پڕ بکاتەوە.

## نیوسیس

نیوسیس ئاژانسێکی کەرتی تایبەتە لە کۆریای باشوور و لە لایەن چۆی های-ئونەوە لە ١ی نیسانی ٢٠٠٢ دامەزراوە، سەرەتا هەواڵەکانی دەرەوەی بەسەر کۆمپانیاکانی میدیای ناوخۆییدا دابەش دەکرد. ئەم ئاژانسە هەواڵەکانی ڕۆیتەرز و سەندیکای نیویۆرک تایمز کە هاوپەیمانە لەگەڵیاندا بڵاو دەکاتەوە لەبەرئەوەی یاسای میدیای کۆریا ڕێ نادا ئاژانسە بیانییەکان ڕاستەوخۆ بەرهەمی خۆیان لەو وڵاتەدا بڵاو بکەنەوە.

## نۆردیک نیوس

نۆردیک نیوس خزمەتگوزارییەکی هەواڵی ئینگلیزی زمانی چوار نووسینگە سەرەکییەکەی هەواڵی نۆردیکە: STT لە فینلاند، TT لە سوید، NTB لە نەرویج و ریتساوز بیرۆ لە دانیمارک.

ئەم ئاژانسە ڕۆژانە نزیکەی ٦٠ چیرۆک دەگەیەنێ، هەر نووسینگەیەکی نیشتمانی ١٥ دانەیان دەگەیەنێ.

## نۆتیمەکس

نۆتیسیاس مەکسیکانۆس (نۆتیمەکس) ئاژانسێکی دەنگوباسی حکوومەتە و لە ١٩٦٨ دامەزراوە. نزیکەی ٨٠٠ کڕیاری هەیە و ٧٤٠ کارمەند، تیایاندا زیاتر لە ١٠٠ هەواڵنێر لە مەکسیک و ١٠٠ی تر لە دەرەوە.

هەواڵەکانی نۆتیمەکس بە سێ زمان بڵاو دەکرێنەوە: ئیسپانی و پۆرتۆگالی و ئینگلیزی. لە مەکسیکدا پێنج نووسینگەی هەرێمیی هەیە و نووسینگەی هەیە لە واشنتۆن و سانتیاگۆ دی چیلی و سان خۆزێ دی کۆستاریکا و مەدرید. ڕۆژانە نزیکەی ٥٠٠ بابەتی هەواڵ بڵاو دەکاتەوە لەگەڵ نزیکەی ١٠٠ وێنە.

## نۆرسک تێلیگرامبیرا NTB

ئاژانسی NTB له ساڵی ١٨٦٧دا وەک ئاژانسێکی کەرتی تایبەت دامەزرا. ئەمڕۆش NTB گەورە ئاژانسی دەنگوباسی نەرویجە. ئەم ئاژانسە خزمەتی زیاتر لە ٤٠ ڕۆژنامە و هەموو ئێزگە سەرەکییەکانی رادیۆ و تەلەفزۆن و سایتەکانی ئینتەرنێت دەکا.

## کۆمەڵەی ڕۆژنامەوانیی نیو زیلاند NZPA

کۆمەڵەی ڕۆژنامەوانیی نیو زیلاند NZPA لە ١٨٧٩دا دروست کراوە و گەورەترین ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسی نیو زیلاندە و مۆڵکی ڕۆژنامە ڕۆژانەکانی ئەو وڵاتەیە ڕۆژانە بۆ ماوەی ٢٤ سات هەواڵی ناوخۆیی و جیهانییان پێشکێش دەکا.

ئاژانسی NZPA نزیکەی ٤٠ هەواڵنێری هەیە لە سیدنی و ئۆوکلاند و پەرلەمانی نیو زیلاند و بارەگای سەرەکیی ئاژانسەکە لە ویلینگتۆن.

## ئاژانسی دەنگوباسی عومان ONA

ئاژانسی دەنگوباسی عومان ONA لە ١٩٨٦دا بەبڕیارێکی شایانە دامەزرا و بەشێکە لە دامەزراوەی عومان بۆ ڕۆژنامەوانی و هەواڵ و بڵاوکراوە و ریکلام و کەناڵی فەرمیی سەرەکیی هەواڵەکانی عومانە.

ئاژانسی دەنگوباسی عومان ئەندامە لە فیدراسیۆنی ئاژانسەکانی دەنگوباسی عارەب و ڕێکخراوی ئاژانسەکانی دەنگوباسی ئاسیا-پاسیفیک و ئەندامێکی دامەزرێنەری ئاسیا پەڵسە. هەروەها لە کۆبوونەوە ساڵانەکانی ئاژانسەکانی دەنگوباسی وڵاتانی ئەنجوومەنی هاوکاریی کەنداودا بەشدار دەبێ.

## PA

پرێس ئەسۆشیەیشن PA لە ١٨٦٨ دامەزراوە و ئاژانسی نیشتمانیی بریتانیا و ئێرلاندە، کۆمپانیایەکی تایبەتە و ٢٧ خاوەن پشکی هەیە زۆربەیان بڵاوکەرەوەی ڕۆژنامەی نیشتمانی و ناوچەیین.

تۆڕێکی ڕۆژنامەوانان ڕۆژانە ١٥٠ هەزار وشە و زیاتر لە ١٠٠ وێنە بەرهەم دێنن.

## پانا و پاناپرێس لیمیتد

لە ١٩٦١ لە کۆبوونەوەیەکی شارەزایانی میدیا ڕێک کەوتن لەسەر دروستکردنی ئاژانسێکی دەنگوباس بۆ پارزەوینی ئەفریقا. لە ١٩٧٧دا یەکەمین کۆبوونەوەی وەزیرانی ڕاگەیاندنی ڕێکخراوی یەکیەتی ئەفریقا لە ئۆگەندا ئەنجام درا. لەو کۆبوونەوەیەدا بڕیار درا ئاژانسێکی سەرتاسەریی ئەفریقایی دروست بکرێ. لە کۆبوونەوەی دووەمیاندا لە ١٩٧٩، بەفەرمی دامەزراندنی ئاژانسەکە ڕاگەیەنرا. بەڵام بەهۆی بارودۆخی دارایی و ئاستەنگە تەکنیکیەکانەوە پانا تەنیا لە ١٩٨٣دا بەشێوەیەکی ئەزموونی دەستی بەکار کرد.

تۆڕی کۆکردنەوەی هەواڵ لە پێنج هەواڵنێرەوە بووە زیاتر لە ١٢٠ هەواڵنێر کە نوێنەرایەتیی ٥١ وڵاتی ئەفریقا دەکەن. بەرهەمەکەشی لە ٢٠ هەزارەوە گەیشتە سەد هەزار وشە بەزمانەکانی فرانسەیی و عارەبی و ئینگلیزی و پۆرتۆگالی.

دەستەیەکی کارگێڕی کە پێک هاتووە لە خاوەن پشکە سەرەکییەکان (باشووری ئەفریقا، کامیرۆن، میسر، لیبیا و، سەنیگال) و بەڕێوەبەرێکی گشتی ئاژانسەکە بەڕێوە دەبەن.

## ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی پۆڵەندا PAP

ئاژانسی PAP ئاژانسی نیشتمانیی ڕۆژنامەوانیی پۆڵەندایە، لە ئاداری ١٩٤٤ لە مۆسکۆ لە لایەن کۆمەڵەی نیشتمانپەروەرانی پۆڵەنداوە ڕێک خرا و بەفەرمی لە وارشۆ وەک دامەزراوەیەکی حکوومەتی لە ٢٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٥ دامەزرا. لە ١٩٩٧ پەرلەمان یاسایەکی دەرکرد کە ئاژانسەکەی کردە کۆمپانیایەکی هاوبەش کە لەو کاتەدا تەنیا حکوومەت خاوەن پشک بوو تیایدا.

## بەترا

ئاژانسی دەنگوباسی ئوردن (بەترا) لە ١٩٦٩ دامەزراوە و تا ئێستا بەتەواوی لە لایەن حکوومەتەوە پارەدار دەکرێ.

سایتی بەترا مانگانە ٥٠٠ هەزار خوێنەر بەکێش دەکا، زۆربەیان خەڵکی ئەمەریکان. توانای پێوەندیی کۆمپیوتەریی نێوان ناوەند و نووسینگەکانی تری ئاژانسەکە بەهێزتر بووە. ئێستا ئاژانسەکە زیاتر لە ٢٥ هەواڵنێری هەیە لە پایەتەختە گرینگەکانی عارەب و جیهاندا.

## پرینسا لاتینا PL

پرینسا لاتینا PL ئاژانسی دەنگوباسی کووبا لە ١٦ی حوزەیرانی ١٩٥٩دا لە لایەن سەرکردە ئێرنستۆ چی گیڤارا و ڕۆژنامەوانی ئەرجەنتینی جۆرج ریکاردۆ ماسیتییەوە دامەزرا. ئامانجی سەرەکیی دامەزراندنی ئەم ئاژانسە، کە دەسپێشخەریی فیدل کاسترۆ بوو، پێشکێشکردنی وێنەیەکی ئەمەریکای لاتین بوو کە تەواو پێچەوانەی ئەو وێنەیە بێ میدیا ڕۆژئاوا پێشانی دەدا. بەشەکانی پرینسا لاتینا بەپێی شوێنی جوگرافی و بابەت دابەش کراون.

## ئاژانسی دەنگوباسی فیلیپین PNA

ئاژانسی دەنگوباسی فیلیپین PNA لە ١ی ئاداری ١٩٧٣ لەدایک بوو، نزیکەی شەش مانگ دوای ڕاگەیاندنی حوکمڕانیی سەربازی لە لایەن فێردیناند مارکۆس و داخستنی هەموو دەزگاکانی میدیای کەرتی تایبەت. ئاژانسی PNA لە لایەن وەزیری ئەو کاتەی ڕاگەیاندنی فیلیپین فرانسیسکۆ تاتادەوە دروست کرا. لە ماوەی ١٣ ساڵی حوکمڕانیی سەربازیدا ژمارەی نووسیار و هەواڵدەرانی PNA لە ١٣وە بوو بەزیاتر لە٢٠٠

## رۆیتەرز

رۆیتەرز لە تشرینی یەکەمی ١٨٥١ دامەزراوە و ئێستا کۆمپانیایەکی جیهانیی زانیارییە. جگە لە دۆقی هەواڵ و وێنە و گرافیک و ڤیدیۆ، هەموو جۆرە زانیارییەکی دارایی و ئابووری بەپێی خواست پێشکێشی کڕیارەکانی دەکا.

رۆیتەرز لە ٢٠٠ شاری ٩٤ وڵاتدا چالاکیی خۆی بەڕێوە دەبا. تێکستەکانیشی بە ١٩ زمان پێشکێش دەکرێن و ٩٠٪ی داهاتی رۆیتەرز لە خزمەتگوزارییە دارایی و

بازرگانییەکانیەوە دێ.

رۆیتەرز ١٤٥٠٠ کارمەندی لە ٩١ وڵاتدا هەیە، ٢٣٠٠یان کاری نووسیاری دەکەن لە ١٩٦ نووسینگەدا کە خزمەتی ١٢٩ وڵات دەکەن. بەمەش رۆیتەرز دەبێتە گەورەترین ئاژانسی دەنگوباسی مەڵتی میدیا. لەساڵی ٢٠٠٤دا داهاتی گرووپی رۆیتەرز دوو ملیار و نۆسەد ملیۆن پاوەنی ستەرلینی بوو.

## RIA نۆڤۆستی

ئاژانسی هەواڵ و زانیاریی رووسیایی RIA نۆڤۆستی میراتگری بیرۆی زانیاریی سۆڤیێتە کە لە ٢٤ی حوزەیرانی ١٩٤١ دامەزرا و لە ١٩٦١دا بووە ئاژانسی دەنگوباسی نۆڤۆستی و ئەمیش لە تەمووزی ١٩٩٠ بووە ئاژانسی زانیاریی نۆڤۆستی کە نووسینگەی لە ١٢٠ وڵاتدا هەیە و ١٣ کۆوار و رۆژنامەی وێنەداری چاپ کردووە. بەشی وەرگێرانی ئاژانسەکە زیاتر لە ٩٠ باشترین وەرگێری پرۆفشناڵی هەیە کە بە ١٢ زمان کاری وەرگێران دەکەن.

## ریتساو

ریتساو گەورەترین ئاژانسی دەنگوباسی سەربەخۆ دانیمارکە. ناوی ریتساو دەگەرێتەوە بۆ ئیریک نیکۆلای ریتساوی دامەزرێنی. دوای ئەوەی لە ساڵی ١٨٦٤ لە شەری دژی ئەڵمانیادا بەشداریی کرد، ریتساو دەستی دایە کاری رۆژنامەوانی. دوای دوو ساڵ نووسینگەی ریتساوی دامەزراند.

جگە لە هەواڵی نووسراو، ئاژانسی ریتساو خزمەتگوزاریی هەواڵی ئامادە بۆ بەکارهێنان پێشکێشی رادیۆ و تەلەفزیۆنەکان دەکا. هەروەها گرافیک و هەواڵی بەزمانی ئینگلیزی هەیە.

## رۆمپرێس

رۆمپرێس ئاژانسی دەنگوباسی حکوومەتی رۆمانیایە، کە پێش ساڵی ١٩٩٠ بەئاگرپرێس دەناسرا. ئەم ئاژانسە رۆژانە ٢٢٠ چیرۆک لە بارەی رومانیاوە بڵاو دەکاتەوە لەگەڵ ١٧٥ تا ٢٠٠ چیرۆکی نێودەوڵەتی. رۆمپرێس ١٤ رۆژنامە و

هەفتەنامە و مانگنامە لە هەموو بوارەکاندا ئامادە دەکا.

ڕۆژانە دە هەزار وشەشی بەئینگلیزی و فرانسەیی لەسەر ڕۆمانیا هەیە. هەروەها ٢٥ تا ٣٠ وێنەی ڕۆژانەی ڕۆمانیاشی هەیە.

## راستریبیا ساماچار سامیتی RSS

راستریبیا ساماچار سامیتی RSS لە ١٩٦٢ دامەزراوە و ئاژانسێکی نیشتمانیی هەواڵی نیپالە کە لە لایەن حکوومەتەوە پارەدار دەکرێ. هەروەها تەنیا ئاژانسی دەنگوباسیشە لە شانشینی نیپالدا. نووسینگە و هەواڵنێرەکانی لە ١٠٤ شوێنی ولاتەکەدا بلاوبوونەتەوە و خزمەگوزارییەکانی بەئینگلیزی و نیپالین.

## ئاژانسی دەنگوباسی عارەبیی سووریا SANA

ئاژانسی دەنگوباسی عارەبیی سووریا SANA لە ٢٤ی حوزەیرانی ١٩٦٥ دامەزراوە دامەزراوەیەکی هاوکارانەیە، خاوەن ئەنجوومەنێکی کارگێڕییە وەزیری ڕاگەیاندن سەرۆکایەتیی دەکا و لە ڕووی دارایی و کارگێڕییەوە سەربەخۆیە.

سانا خاوەنی ٣٧٠ کارمەندە کە ٢٠٠یان ڕۆژنامەوانن و ١٦ نووسینگەی لە دەرەوەی ولاتدا هەیە ١٠یان لە ولاتە عارەبەکانن و ١٨ هەواڵنێری تریشی لە دەرەوەدا هەیە.

ئاژانسەکە ڕۆژانە ٤٠٠ هەواڵی ناوخۆیی و ١٦٠ی دەرەوە بەزمانی عارەبی بلاو دەکاتەوە و ٤٠ هەواڵیش بەئینگلیزی و ٤٠ی تریش بەفرانسەیی. هەروەها سەد وێنەی ناوخۆیی و شەست وێنەی دەرەوەش بلاو دەکاتەوە.

## کۆمەڵەی ڕۆژنامەوانیی باشووری ئەفریقا SAPA

کۆمەڵەی ڕۆژنامەوانیی باشووری ئەفریقا SAPA لە ١٩٣٨دا لە لایەن ڕۆژنامە سەرەکییەکانی باشووری ئەفریقاوە دامەزرا بۆ ڕێکخستنی هاوبەشی لە هەواڵەکاندا. ئێستا هەموو جۆرە بەرهەمە میدیاییەکان پێشکێش دەکا. نووسینگەی لە جۆهانسبێرگ و کەیپ تاون و دوربان و بلومفۆنتاین هەیە.

## ئاژانسی دەنگوباسی سویسرا

ئاژانسی دەنگوباسی سویسرا ئاژانسێکی نیشتمانیی ئەو وڵاتەیە لە ١٨٩٤دا دامەزراوە. هەواڵە گشتییەکان بە هەر سێ زمانی ئەڵمانی و فرانسەیی و ئیتالی بڵاو دەکاتەوە. ساڵانە زیاتر لە ١٨٠ هەزار پەیام ئاراستەی کڕیارەکانی دەکا. گەورەترین ئاژانسی دەنگوباسە لە سویسرا و ٢٢٧ کەس کاری تێدا دەکەن، ١٧٥یان ڕۆژنامەوانن. بارەگاکەی لە بێرنە. ١٤ نووسینگەی هەرێمیشی هەیە.

## ئاژانسی دەنگوباسی سعوودیە SPA

ئاژانسی دەنگوباسی سعوودیە SPA ئاژانسی نیشتمانیی ئەو وڵاتەیە و لە ساڵی ١٩٧١ بۆ کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی هەواڵی ناوخۆیی و جیهانی لە سعوودیە و جیهاندا دامەزرا. ئاژانسەکە لقێکی وەزارەتی ڕاگەیاندنە و نزیکەی ٥٠٠ کارمەندی هەیە. نووسینگەی سەرەکیی لە ریازە و نووسینگەی لە جدە و دەمام و شارە سەرەکی و بچووکەکانی سعوودیەدا هەیە. هەروەها نووسینگەی لە بەیرووت، قاهیرە، سەنعا، لەندەن، واشنتۆن، نیویۆرک، دیمەشق، مەراکش، مۆریتانیا، فەلەستین، بەرلین، تونس، تاران، ئیسلام ئاباد، ئوردون، برۆکسل، پاریس، مۆسکۆ، بەکین و ڤیەننا هەیە.

ڕۆژانە ٤٠٠ بابەتی هەواڵ، زیاتر لە ٢٠٠ هەزار وشە، بەسێ زمان، لەگەڵ ١٥٠ وێنە بەرهەم دێنێ.

لەم دواییانە بڕیارێکی شایانە دەرچوو بۆ ئەوەی ئاژانسەکە بکرێ بەڕێکخراوێکی گشتیی سەربەخۆ. ئەم بڕیارەش لە کاتی جێبەجێکردنیدا هاوکاری SPA دەبێ بۆ هەوڵدان بۆ زیادکردنی داهاتەکانی لە ڕێی فرەوانکردنی چالاکی و جۆری بەرهەمەکانی.

## ئاژانسی دەنگوباسی سلۆڤینیا STA

ئاژانسی دەنگوباسی سلۆڤینیا STA لە ٢٠ی حوزەیرانی ١٩٩١ دامەزراوە، واتە پێنج ڕۆژ پێش ئەوەی سلۆڤینیا سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیەنێ و ببێ بەئامانجی

هێرشی سوپای یۆگۆسلاڤی. لەو کاتەوە STA بوو بەئاژانسی نیشتمانی و هەواڵەکانی ناوەوە و دەرەوەی وڵات دادەپۆشێ.

ئەم ئاژانسە ئەندامە لە کۆمەڵەی ئەوروپایی ئاژانسەکانی دەنگوباس. ئەمە و STA نزیکەی سەد کارمەندی هەیە، نووسینگەشی لە برۆکسل و نیویۆرک و رۆما و ڤیەننا و زەگریب و بەلگراد هەیە. رۆژانەش نزیکەی ۲٥۰ هەواڵی بەزمانی سلۆڤینی هەیە و ٤۰یشی بەئینگلیزی هەیە.

## سۆمین تیتۆتۆمیستۆ STT

ئاژانسی STT کە ئاژانسی دەنگوباسی فینلەندایە، وەک ئاژانسی تێلیگرامی فینلەندا لە ساڵی ۱۸۸۷ دەستی پێ کرد و ئەم ناوەی لە ساڵی ۱۹۱٥وە هەیە. ئاژانسێکی سەربەخۆیە و موڵکی هاوبەشی گەورە دامەزراوە میدیاییەکانی فینلەندایە.

لە فینلەندا نزیکەی ۱۰۰ رۆژنامە و کۆمپانیای وەشانی فینلەندا و هەموو تەلەفزیۆنەکان و نزیکەی سی رادیۆی بازرگانی ئابوونەدەری خزمەتگوزارییەکانی STTن کە ژمارەیەکی زۆر بەرهەمی هەواڵ پێشکێشی کۆمپانیاکان و بەڕێوەبەرایەتییە گشتییەکان دەکا.

## تانیوگ

ئاژانسی تێلیگرافی یۆگۆسلاڤیای نوێ (تانیوگ) کە لە ٥ی تشرینی دووەمی ۱۹٤۳ دامەزراوە، لە ساڵانی تەمەنیدا بەچەند قۆناخێکی گەشەکردن و پووکانەوەدا تێ پەڕیوە. لە سەردەمە زێڕینەکانیدا ٤۸ هەواڵنێری لە جیهاندا بڵاو بووبوونەوە و یەکێک بوو لە ۱۰ گەورە ئاژانسی جیهان و ڕۆڵی پێشەنگی لە پوولی ئاژانسەکانی وڵاتانی بێلایەندا دەگێڕا. ئەم ئاژانسە ژمارەیەکی زۆر دیمانەی لەگەڵ چەندین پێشەوای جیهاندا کردووە و ژمارەیەکی زۆری وێنەی مێژوویی هەیە (چوار ملیۆن نێگەتیڤی فیلم). لە کۆتایی ۱۹۸۰کاندا تانیوگ ۱۲۰۰ کارمەندی هەبوو.

خزمەتگوزارییە گشتییەکەی ساڵانە نزیکەی ۸۰ هەزار هەواڵ دەگوێزێتەوە. خزمەتگوزاریی ئابووری و وێنەشی هەیە. خزمەتگوزارییە گشتییەکەی بەئینگلیزییە.

بەلاڤۆکێکی ڕۆژانەی هەواڵی بەئینگلیزی هەیە و بەزمانی سربیش هەڵبژاردەیەکی ڕۆژنامەوانیی بیانی و بلاوکراوەی تر بەپێی خواست بلاو دەکاتەوە. بەلاڤۆکی ڕۆژانەی هەواڵەکەی هەفتەی پێنج ڕۆژ بلاو دەبێتەوە.

تانیوگ خزمەتگوزاریی گشتیی هەواڵ بەزمانەکانی سربی و ئینگلیزی و فرانسەیی لە ئینتەرنێت بلاو دەکاتەوە. ئێستا ئاژانسەکە ٣٧٥ کارمەندی هەیە و نزیکەی ١٧٠ لەوانە هەواڵدەر و وەرگێڕ و وێنەگری ڕۆژنامەوانین.

## ئاژانسی دەنگوباسی کۆماری سلۆڤاک TASR

ئاژانسی دەنگوباسی کۆماری سلۆڤاک TASR لە ٣٠ی کانوونی دووەمی ١٩٩٢ دامەزراوە و بارەگای سەرەکیی لە براتیسلاڤایە. لە ٢٨ی نیسانی ١٩٩٩ بەڕێوەبەری گشتی پێڕۆی ئاژانسی دەنگوباسی کۆماری سلۆڤاکی دەرکرد و ئەو پێڕۆیەی هەڵوەشاندەوە کە لە ١١ی نیسانی ١٩٩٥وە کاری پێ دەکرا. حکوومەت بەشداری لە بەشێکی پارەدارکردنی TASR دەکا. بەڕێوەبەری گشتیی ئاژانسەکە لە لایەن حکوومەتەوە دادەمەزرێ و لەسەر کار لادەبرێ.

## تیلام

ئاژانسی تیلام کە لە ١٩٤٥دا دامەزراوە ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسی ئەرجەنتینە. لە ١٩٥٩ تیلام بووە کۆمپانیایەکی هاوبەش. لە ٣٠ی ئایاری ١٩٦٣ ئاژانسەکە بەبڕیارێک داخرا و، لە ١٩٦٨ بووە موڵکی حکوومەت. لە شوباتی ٢٠٠٢ دووبارە بووەوە ئاژانسێکی سەربەخۆ و تەنیا سکرتارییەتی ڕاگەیاندن خاوەن پشکە تیایدا. لەو ٤٥٠ کەسەی لە تیلام کار دەکەن نزیکەی نیوەیان ڕۆژنامەوانن.

## تیدنینگارناس تێلیگرامبیرا TT

ئاژانسی تیدنینگارناس تێلیگرامبیرا TT گەورەترین ئاژانسی دەنگوباسە لە وڵاتانی سکاندیناڤیا و تەنیا ئاژانسی سەرتاسەریی وڵاتی سویدە و لە تێکەڵبوونی سێ ئاژانسی دەنگوباس لە ١٩٢٢دا دروست بوو. لە سەرەتادا هەواڵەکانی بەپۆستە و تەلەفۆن دەگەیشتنە ڕۆژنامەکان. یەکەمین وەشانی ڕادیۆیی ئاژانسەکەش لە

١٩٢٤دا بوو.

ژمارەی کارمەندانی TT نزیکەی ١٤٠ کەسە و زۆربەیان هەواڵدەر و نووسیارن و لە لقەکەی TT کە TT سپێکترایە ٤٠ کەسی تر کار دەکەن.

## ئوکرئینفۆرم

ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسی ئۆکرانیا (ئوکرئینفۆرم) میراتگری UTA و BUP و UkTa و RATAUە بەزیاتر لە ٨٥ ساڵی مێژوویانەوە و تۆڕێکی هەواڵنێر و وێنەگری خۆی هەیە لە سەرتاسەری وڵاتەکەدا، هەروەها هەواڵنێری لە ئەڵمانیا و چین و پۆڵەندا و ڕووسیا و سربیا و مۆنتنیگرۆ و ڕۆمانیا و هەنگاریا و ئۆزبەکستان و وڵاتانی بەلتیک هەیە.

ڕۆژانە نزیکەی ٥٠٠ چیرۆکی بەزمانەکانی ئۆکرانیایی و ڕووسی و ئینگلیزی و ئەڵمانی هەیە لەگەڵ نزیکەی ٥٠ وێنەدا.

## یونایتد نیوزی بەنگلادیش UNB

یونایتد نیوزی بەنگلادیش UNB ئاژانسێکی نیشتمانیی بەنگلادیشە کە خاوەندارییەکەی هی کەرتی تایبەتە و لە ساڵی ١٩٨٨دا پێک هێنراوە. زیاتر لە ١٢٠ ڕۆژنامەوان لەو ئاژانسەدا کار دەکەن. ژووری هەواڵی ڕۆژانە نزیکەی ٢٥٠ هەزار وشە بەرهەم دێنێ کە تۆڕێکی هەواڵنێر و هەواڵدەر لە ٥٤ هەرێمی وڵاتدا کۆیان دەکەنەوە.

## یونایتد پرێس ئینتەرناشناڵ UPI

یونایتد پرێس ئینتەرناشناڵ UPI لە ٢١ی حوزەیرانی ١٩٠٧ لەدایک بوو وەک یونایتد پرێس ئەسۆشیەیشنز، لەبەرئەوەی دامەزرێنەرەکەی ئی و سکریپس بڕوای وا بوو کە نابێ هیچ ڕێگرێک هەبێ لەبەر ئەو کەسەدا کە دەیەوێ هەواڵ بکڕێ. لەو کاتەوە ئاژانسەکە بە UPI ناسرا کە یونایتد پرێس لەگەڵ ئینتەرناشناڵ نیوس سێرڤس لە ١٩٥٨دا تێکەڵ کران، کە ئەمەی دووەم لە ساڵی ١٩٠٩ لە لایەن ویلیەم ڕاندۆڵف هێرستەوە دامەزراوە. لە ١٩٧٨دا زیاتر لە ٧٠٠٠ ئابوونەدەری لە

سەرتاسەری جیهاندا هەبوو. ئێستا ئەم ئاژانسە بووەتە موڵکی نیوس وۆرڵد کۆمیونیکەیشنز کە کۆمپانیایەکی جیهانیی مەڵتی میدیایە و خاوەنی واشنتۆن تایمزە.

## ئاژانسی دەنگوباسی ڤێتنام VNA

ئاژانسی دەنگوباسی ڤێتنام VNA لە ساڵی ١٩٤٥ دامەزراوە و خزمەتگوزاریی فەرمیی کۆماری سۆشیالیستی ڤێتنامە. خزمەتگوزاری لە ڕێی ئینتەرنێتەوە پێشکێش دەکا بەزمانەکانی ڤێتنامی، ئینگلیزی، فرانسەیی و ئیسپانی و هەواڵی بوارەکانی سیاسەت و ئابووری و کۆمەڵایەتی و زانستی و تێکنۆلۆجیایی لە ڤێتنام و جیهان لەخۆ دەگرن. چیرۆکی هەواڵەکانی VNA بەگشتی دەربڕینی بۆچوون و دیتنی پارتی کۆمۆنیستی ڤێتنامن و ئاژانسەکە لە لایەن حکوومەتەوە بەڕێوە دەبرێ.

ئاژانسەکە دوو نووسینگەی سەرەکیی لە شاری هۆ چی مین (باشووری ڤێتنام) و شاری دا نانگ (ناوەڕاستی ڤێتنام) هەیە، لەگەڵ تۆڕێک لە ٦١ نووسینگەی ناوخۆیی لە ٦١ پارێزگاکەی ئەو وڵاتەدا، هەروەها ٢٥ نووسینگەی لە دەرەوەی وڵاتدا هەیە لە ئاسیا و ئەورووپا و ئەفریقا و ئەمەریکا و ئۆقیانووسیا.

ئاژانسی VNA زیاتر لە ٣٠ بەڵاڤۆکی هەیە بەزمانە جیاجیاکان، هەروەها وێنەی ڕۆژانەی هەیە بۆ هەموو بابەتەکان و وێنە لەگەڵ ئاژانسە جیهانییەکاندا ئاڵوگۆڕ دەکا و ساڵانە زیاتر لە یەک ملیۆن وێنە بڵاو دەکاتەوە.

## ئاژانسی دەنگوباسی فەلەستین WAFA

ئاژانسی دەنگوباسی فەلەستین WAFA لە ساڵی ١٩٧٢ لە بارودۆخێکی بێ هاوتادا دامەزراوە- ئەم ئاژانسە ئاژانسی دەوڵەتێکە هێشتا دروست نەبووە. لە لایەن هەواڵنێرانی شەڕکەرەوە دامەزرا و زۆربەی ئەندامە دامەزرێنەرەکانی کوژراون. ئاژانسەکە سایتێکی هەیە تیایدا هەواڵەکانی بەخۆڕایی بەزمانەکانی ئینگلیزی و عارەبی و عیبری بڵاو دەکاتەوە.

## ئاژانسی دەنگوباسی ئیمارات WAM

ئاژانسی دەنگوباسی ئیمارات WAM لە تشرینی دووەمی ١٩٧٦ بەبڕیارێکی وەزیری ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی میرنشینە یەکگرتووەکانی عارەب دامەزرا. بەشە عارەبییەکەی لە ١٨ی حوزەیرانی ١٩٧٧ دەستی پێ کرد و بەشە ئینگلیزییەکەی لە کانوونی یەکەمی ,١٩٧٨ بارەگای سەرەکیی لە ئەبوزەبیی پایەتەختی ولاتەکەیە و نووسینگەی لە دوبەی و شارجە و عەجمان و ئوملقیوین و ڕەئسلخەیمە و فوجەیرە و ئەلعێن و مەدینەت زاید هەیە. لە ناو ئیمارات ١٨٠ کارمەندی هەیە و لە دەرەوە ٢٥ هەواڵنێری هەیە. لە شارەکانی قاهیرە و بەیرووت و ریباگ و ڕیاز و دیمەشق و سەنعا و جەزائیر و قودس و غەزە و خەرتووم و عەممان و بەغدا و تونس نووسینگەی هەیە. نووسینگە و هەواڵدەرەکانی تریشیان لە لەندەن و پاریس و برۆکسل و جنێڤ و مۆسکۆ و واشنتۆن و نیویۆرک و تاران و ئیسلام ئاباد و ئیتانبوڵ و کانبێران. ٢٢٠ دامەزراوە خزمەتگوزارییەکانی WAMیان پێ دەگا.

ئاژانسی WAM ئەندامە لە گرووپی ئاژانسەکانی دەنگوباسی ئەنجوومەنی هاوکاریی کەنداو و فیدراسیۆنی ئاژانسەکانی دەنگوباسی عارەب و یەکیەتیی ئاژانسەکانی دەنگوباسی ئیسلامی و پوولی ئاژانسەکانی دەنگوباسی ولاتانی بێلایەن. هەروەها ڕێککەوتنی ئاڵوگۆڕی لەگەڵ ٢٠ ئاژانسی عارەب و ئاسیایی و نێودەوڵەتی هەیە.

## خزمەتگوزاریی تایبەتی ئافرەتان WFS

ئەم خزمەتگوزارییە لە ١٩٧٨دا دەستی پێ کرد وەک دەستپێشخەرییەکی یونسکۆ و UNFPA لە دەیەی ئافرەتانی نەتەوە یەکگرتووەکاندا. تا ساڵی ١٩٩١ پرۆژەیەکی ئینتەرپرێس سێرڤس IPS بوو کە بنکەکەی لە ڕۆمایە. دوای ئەوە، WFS بووە ئاژانسێکی سەربەخۆی دەنگوباس و بارەگاکەی لە نیو دێلهی دامەزراند و لەوێ بەرهەمەکانی ئامادە دەکران و بەجیهاندا بڵاو دەکرانەوە.

ئاژانسەکە حەفتانە هەواڵ بەرهەم دێنێ، لەگەڵ بابەت و بۆچوونی پێوەست بەپرسی جێندەر. ٨٠ ڕۆژنامەوان لە ٣٥ ولاتەوە کار بۆ ئەم ئاژانسە دەکەن و

بەرهەمەکانی بەبلاوکراوەی ١١ ولات دەفرۆشرێن. ئەو هەواڵنێرانە سالانە نزیکەی ٤٠٠ بابەت بەرهەم دێنن لەگەڵ ٥٠٠ کورتەی هەواڵ.

ئاژانسی WFS پێی وایە میدیا و گەیاندن ئامرازی سەرەکین بۆ بەدیهێنانی یەکسانیی ئافرەت. لە ساڵی ١٩٩٢شەوە دەستبەرداری بلاوکردنەوە لە رێی IPS وە بوو و رووی لە ئیمێڵ کرد، بەمەش بەرهەمەکانی گەیشتنە خەڵکێکی زۆرتر.

## چینهوا

ئاژانسی دەنگوباسی چینهوا، یاخۆ ئاژانسی دەنگوباسی چینی نوێ NCNA، ئاژانسی دەنگوباسی فەرمیی حکوومەتی کۆماری گەلیی چینە. لە تشرینی دووەمی ١٩٣١ بەناوی ئاژانسی دەنگوباسی چینی سوورەوە دەستی پێ کرد و لە ساڵی ١٩٣٧دا ئەم ناوەی ئێستای بەدەست هێنا. ئەم ئاژانسە گەورەترین سەنتەری کۆکردنەوەی زانیاری و کۆنفرانسەکانی رۆژنامەوانییە لە کۆماری چیندا. دامەزراوەیەکە سەر بەئەنجوومەنی دەوڵەت. نووسراوەکانی چینهوا راستەوخۆ ئاراستەی بەشی پرۆپاگاندای حیزب دەکرێن و نزیکەی دە هەزار کەس کاری تێدا دەکەن و ١٠٧ نووسینگەی لە هەموو جیهاندا هەیە بۆ کۆکردنەوەی هەواڵ و زانیاری لەسەر ولاتانی تر و بلاوکردنەوەی زانیاری لە بارەی چینەوە، هەروەها ٣١ نووسینگەی لە چین هەیە لە هەر پارێزگایەکدا یەکێک لەگەڵ یەک نووسینگەی سەربازی. پیپلز دەیلی بابەتەکانی چینهوا بۆ نزیکەی ٢٥٪ی چیرۆکەکانی بەکار دێنێ. جگە لەوەی ئاژانسی دەنگوباسە، چینهوا بلاوکەرەوەشە و بەچینی و ئینگلیزی و چوار زمانی تر چاپ دەکا.

چینهوا تۆرگەلێکی جیهانیی بۆ کۆکردنەوەی هەواڵ و زانیاری و نووسینەوە و بازاراندن و گواستنەوەیان دروست کردووە، ئەم تۆرانە تێکنۆلۆجیای نوێی گەیاندن بەکار دێنن. بارەگای سەرەکیی ئاژانسەکە لە بەکینە و نووسینگە سەرەکییەکانی لە هۆنگ کۆنگ و نیویۆرک و پاریس و لەندەنن و زانیاری و هەواڵی زیاتر لە سەد ولات و هەرێم دادەپۆشێ.

بەکین لە ماوەی سێ ساڵی دواییدا، سالانە ٧٪ی ئەو پارانەی بۆ ئاژانسەکانی

دەنگوباس تەرخان کرابوون کەم دەکردەوە و ئەو پارەیەی ئێستا چینهوا لە حکوومەتەوە وەری دەگرێ تەنیا ٤٠٪ی خەرجییەکانی دادەپۆشێ، بۆیە ئاژانسەکە بۆ بەدەستهێنانی داهات پەنا دەباتە بەر پرۆژەگەلی پێوەندیی گشتی و بیناسازی و بازرگانیی خزمەتگوزاریی زانیاری. لە ساڵی ٢٠٠١دا کۆمپانیای گلۆبەڵ چاینا تێکنۆلۆجی گرووپی هۆنگ کۆنگ کارێکی هاوبەشی وەبەرهێنانی لەگەڵ چینهوا کرد بۆ دامەزراندنی سایتێکی زانیاری و پێشکێشکردنی پلان و ڕاوێژی خزمەتگوزاریی بیستراو و بینراو.

## یۆنهاپ

ئاژانسی دەنگوباسی یۆنهاپ ئاژانسی نیشتمانیی کۆماری کۆریایە و لە ١٩ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٠ دامەزرا لە ڕێی تێکەڵکردنی ئاژانسی دەنگوباسی هاپدۆنگ (لە ٢٠ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥ پێک هێنرا) لەگەڵ ئۆریێنت پرێس (٢٠ی نیسانی ١٩٥٢)- بەمەش هەردوو ئاژانسەکەی دەنگوباسی کۆریا لە ژێر یەک چەتردا کۆ کرانەوە و لە ١ی کانوونی دووەمی ١٩٨١دا کەوتە کار.

کڕیارەکانی یۆنهاپ بریتین لە ئاژانسەکانی حکوومەت و کۆمپانیا گشتی و تایبەتەکان و سایتەکانی دەروازە و هەروەها ڕۆژنامە و ئێزگەکانی وەشانی کۆریا. لە ١٩٨٨دا یۆنهاپ سیستمێکی نووسینەوە و دەرهێنانی ئێلیکترۆنیی هەواڵی دامەزراند. یانهۆپ لەگەڵ ٤٧ ئاژانسی دەنگوباسی بیانیدا وەک ئەسۆشیێتد پرێس و فرانس پرێس و چینهوا و کیۆدۆ و ئیتار-تاس و dpa کۆنتراکت و بۆندی گۆڕینەوەی هەواڵ و هاوکاریی هەیە. خاوەن پشکەکانی یۆنهاپ دەسەڵاتیان بەسەر هەموو تۆڕەکانی وەشان و ڕۆژنامەکانی کۆریای باشووردا هەیە.

ئێستا یۆنهاپ ١٩ هەواڵنێری دەرەوەی هەیە و زیاتر لە سەد هەواڵنێریشی لە شارەکانی وڵاتدا هەیە. ئەنجوومەنی نیشتمانیش لە سەرەتای ٢٠٠٣دا یاسایەکی داڕشت بۆ پێشکێشکردنی پشتگیریی دارایی و گشتی بەیۆنهاپ لە پێناو بەهێزکردنی ستاف و کەلوپەلەکانیدا. بەپێی یاسای بەهێزکردنی ئاژانسەکانی دەنگوباسی کۆریای باشوور حکوومەت دەبێ هاوکاریی دارایی پێویست پێشکێشی

یۆنهاپ بکا له پێناو هێشتنەوە زیاتر له ٧٠ هەواڵنێری دەرەوە و زیاتر له ١٠٠ هەواڵنێری تر بۆ نووسینەوەی بابەت بەزمانەکانی ئینگلیزی و چینی و ژاپۆنی و ئیسپانی و فرانسەیی و عارەبی لەگەڵ هاتنی ساڵی ٢٠٠٦دا.

## ئاژانسی دەنگوباسی زامبیا ZANA

ئاژانسی دەنگوباسی زامبیا کە له ١٩٦٩دا لەدایک بووە، تەنیا دەزگای میدیایە بەرفرەوانترین داپۆشینی هەواڵ له ڕێی ئەو ڕۆژنامەوانانەوە پێشکێش دەکا کە له نووسینگە هەرێمییەکان و پارێزگاکانی ولاتدا بلاوبوونەتەوە. بارەگای سەرەکیی ئاژانسەکە له لوساکایە و نووسینگە هەرێمییەکانی لەم شارانەن: کابوی (پارێزگای ناوەند) و ندۆلا (پارێزگای کۆپەربێلت) و مانسا (پارێزگای لواپولا) و کاساما (پارێزگای باکور) و چیپاتا (پارێزگای ڕۆژهەلات) و لیڤینگستۆن (پارێزگای باشوور) و مۆنگو (پارێزگای ڕۆئاوا) و سۆلویزی (پارێزگای باکوری ڕۆئاوا). هەواڵەکانی رۆیتەرز و چینهوا و dpa و ئاژانسی پاناپرێس بلاو دەکاتەوە و هاوکاریی ئاژانسە هەرێمییەکانی باشووری ئەفریقا دەکا وەک ئاژانسی دەنگوباسی مۆزامبیق AIM و کۆمەڵەی وەشانی باشووری ئەفریقا SABA.

کرپارەکانی برێتین له رادیۆ و تەلەفزیۆنی نیشتمانی کە له لایەن دەزگای نیشتمانیی وەشانی زامبیاوە بەڕێوە دەبرێن و تایمزی زامبیا و زامبیا دەیلی مێڵ. هەواڵ و بابەت له دیدێکی ئەفریقاییییەوە له ڕێی ئینتەرنێت و پاناپرێسەوە، کە نووسینگەی له ئەمەریکا و ئەوروپا هەیە، پێشکێشی زامبیاییەکانی دەرەوە و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دەکا.

# هەشتەم

## هاوپەیمانی و کۆمەڵە و ئەنجوومەنەکان

وەک هەر پیشەیەکی تر، ئاژانسەکانی دەنگوباسیش ڕێکخراوی خۆیان هەیە. یەکەمینی ئەم ڕێکخراوانە AA (ئاژانسە هاوپەیمانەکان) بوو، کە لە حوزەیرانی ١٩٢٤ لە بێرن لە سویسرا لەدایک بوو. دوای ماوەیەک ئاژانسی دەنگوباسی ئیسپانیا EFE SA لە کانوونی دووەمی ١٩٣٩ دروست کرا و ژمارەی ئەندامانی یانەی ئاژانسە هاوپەیمانەکان گەیشتە ٣٠ ئاژانس. پێڕۆی ئەم ڕێکخراوە دەیگوت کە لە هەر وڵاتێکەوە تەنیا یەک ئاژانس بۆی هەیە ببێتە ئەندام، بۆیە EFE جێی FA-BRAی گرتەوە کە پێشتر ئەندامی هاوپەیمانییەکە بوو.

### هاوپەیمانیی ئەورووپا بۆ ئاژانسەکانی دەنگوباس EANA

ئەم هاوپەیمانییەی ئێستای ئەورووپا لە ١٩٥٦دا بەناوی هاوپەیمانیی ئەورووپا بۆ ئاژانسەکانی ڕۆژنامەوانییەوە دامەزرا. لە ساڵی ٢٠٠٢ ناوەکەی گۆڕا و بووە هاوپەیمانیی ئەورووپا بۆ ئاژانسەکانی دەنگوباس. ئەم ناوە نوێیە گونجاو و پێوەندیدارتر بوو، لەبەرئەوەی ئاژانسەکانی دەنگوباس خزمەتگوزارییەکانیان دەفرۆشن بەژمارەیەکی زۆری کڕیار لە میدیا و لە دەرەوەی میدیاش. وەک قەوارەیەکی یاسایی، هاوپەیمانیی ئەورووپا بۆ ئاژانسەکانی دەنگوباس EANA کۆمەڵەیەکی قازانج نەویستە و دەرگای بەئەندامبوونی کراوەیە و لە تۆماری

بازرگانی لە بێرن - سویسرا تۆمار کراوە و لەوێ حیسابی لە بانکدا هەیە و کتێبەکانی لەوێ وردبینییان بۆ دەکرێ.

ئەمڕۆ EANA سی ئاژانسی دەنگوباسی ئەوروپایی لەخۆ دەگرێ، کە نوێنەرایەتیی سی دەوڵەت و نزیکەی ٧٥٠ ملیۆن هاووڵاتیی ئەو دەوڵەتانە دەکەن. EANA وەک یانەیەکی پیشەییی پان ئەوروپایی کار دەکات بۆ هێنانەدیی ڕێککەوتن و هاوکاری و ئاڵوگۆڕی زانیاری و شارەزایی لە نێوان ئەندامەکانیدا. هەروەها EANA سیمینار لە بارەی بابەتگەلی جێی بایەخی گشتیی ئەندامەکانی ڕێک دەخا. ئەو سیمینارانە -کە لە دۆخی ئاساییدا یەکێک لە بەهار و یەکێک لە پایزدا ڕێک دەخرێ- بابەتگەلی وەک پێشخستنی ناوەڕۆکی خزمەتگوزاریی هەواڵ و بەبازاڕی کرد و تێکنۆلۆجیای زانیاری و مافی دانان و بابەتگەلی تری یاسایی پێوەست بەمیدیا و سیاسەتی باج، دەخەنە بەر باس و لێکۆڵینەوە.

چالاکییەکانی EANA ڕووپێوی جۆراوجۆریش لەخۆ دەگرن. یەکێ لەوانە ڕووپێوی ساڵانەی بازاڕە کە بەڕاپۆرتگەلی وڵاتان ناو دەبرێ، لەگەڵ وەرگرتنی زانیاری لە وڵاتی هەر ئەندامێک لە بارەی پێشکەوتنی بازاڕی میدیا لە وڵاتەکەدا.

ئامانجە سەرەکییەکانی EANA وەک لە وتاری ناساندنیدا هاتووە، ئەمانەن:

- دابینکردنی کەشێکی پیشەیی کە تیایدا ئاژانسەکانی دەنگوباس بتوانن کاری خۆیان لە گەیاندنی هەواڵ بەسەربەخۆیی و دادپوروەری. ئەمەش چەندین بوار لەخۆ دەگرێ وەک چاودێریی مافی دانان و مافە پێوەندارەکانی ئاژانسەکان و گەیشتن بەسەرچاوەکانی زانیاری.
- مسۆگەرکردنی هاوکاری و گۆڕینەوەی زانیاری لە نێوان ئەندامانداا، لە ڕێی سیمینارەکانمان و هەواڵنامەکەی EANA کە مانگانە دەردەچێ و تەنیا بەسەر ئەندامانی EANAدا دابەش دەکرێ.
- دابینکردنی یانەیەکی پان ئەوروپاییی پیشەیی بۆ ئاژانسەکانی ئەندام، کە تیایدا لە ڕێی سیمینار و وۆرکشۆپەوە بتوانن گفتوگۆ بکەن و شارەزایی بگۆڕنەوە.

چالاکییەکانی EANA بەئابوونەی ئەندامیەتی پارەدار دەکرێ، مەبەستیش لەمە مسۆگرکردنی ڕزگاربوونە لە دەستێوەردانی بەرژەوەندییە دەرەکییەکان. لە ڕووی

فەرمییەوە EANA لە بێرنی سویسرا تۆمار کراوە و تەنیا یەک کارمەندی هەیە دەوامی تەواو دەکا وەک سکرتێری گشتی لە بارەگای سکرتارییەت لە ستۆکهۆلمی سوید. هاورێ سویسرایییەکان لە SDA-ATS هاوکاریی EANA دەکەن بەرێکخستنی کتێبەکانی و پێوەندیی بانکی لە سویسرا و ماڵپەڕەکەشی لە میوانداریی ANAیە لە ئەسینای یۆنان.

کۆنگرەی گشتیی ساڵانەی EANA دەستەیەکی پێنج کەسی هەڵدەبژێرێ بۆ سەرپەرشتیکردنی چالاکییەکانی ڕێکخراوەکە. سەرۆکی EANA بۆ ماوەی دوو ساڵ هەڵدەبژێردرێ و مەرجە سەرۆکی جێبەجێکاری ئاژانسەکەی خۆی بێ. چوار ئەندامەکەی تری دەستەکە بۆ ماوەی سێ ساڵ هەڵدەبژێردرێن و هەنگاو بەهەنگاو دەگۆڕێن، واتە هەر چواریان بەیەکەوە ناگۆڕێن، مەبەستیش لەمە مسۆگەرکردنی دانەبڕانە. زۆر لە ئاژانسەکانی ئەندام لە EANA ئەندامن لە ڕێکخراوگەلی تری ئاژانسەکانی دەنگوباس، بۆ نموونە ڕێکخراوی ئاژانسەکانی دەریای ناوەڕاست و ئاژانسەکانی بەلکان و ڕێکخراوی ئاژانسەکانی دەنگوباسی ئاسیا OANA. لە ٢٠٠٤دا EANA ڕێککەوتنێکی هاوکاریی لەگەڵ ئەمەی دواییاندا مۆر کردووە.

پێڕۆی ڕێکخراوەکە دەڵێ کۆنگرەی گشتیی ساڵانە دەبێ بەشێوەیەکی ئاسایی لە سویسرا بکرێ. بەڵام لە ساڵی ٢٠٠٤دا ڕێکخراوەکە داوەتی ئیتارتاسی قبووڵ کرد و کۆنگرەی گشتیی خۆی و سیمینارێکی بەناونیشانی ڕۆڵی ئاژانسەکانی دەنگوباس و قازانجداری شانبەشانی کۆنگرەی ئیتارتاس لە مۆسکۆ بەست.

وتاری ناساندنی EANA دەڵێ لە بەرژەوەندیی EANAدایە ئاژانسگەلێکی هەبن لە دۆخی گواستنەوەدا وەک ئەندام و هاوکاریی ئەم ئەندامانە بکا بۆ بەدیهێنانی ویستەکانیان لە پێناو دروستکردنی خزمەتگوزاریی دادوەرانەی هەواڵ لەسەر بنەمای پرنسیپەکانی ئازادیی ڕۆژنامەوانی.

## پێڕۆ

مادەی یەکەم _ پێناسە

ڕێکخراوی EANA کۆمەڵەیەکی قازانج نەویستی ئاژانسەکانی دەنگوباسی

ئەوروپایە بەپێی مادەی ژمارە ٦٦ فف لە یاسای مەدەنیی سویسرا دامەزراوە. EANA لەو شوێنەی بارەگای خۆی لێیە لە تۆماری بازرگانیی شاری بێرندا تۆمار کراوە.

مادەی دووەم _ ئامانج

٢-١ ئامانجی EANA پاراستن و بەهێزکردنی بەرژەوەندییەکانی گشتیی ئەندامانیەتی لە هەموو ئەو بوارانەی بنەڕەتین لە کار و چالاکییەکانیاندا.

٢-٢ EANA وەک یانەیەکی پان ئەوروپایی پرۆفیشینالْ کار بۆ بەستنی گرێبەست و هاوکاری و ئاڵوگۆڕی زانیاری و شارەزایی و کارکردن لە نێوان ئەندامەکانی خۆیدا دەکا. EANA ئاگەداری بەرژەوەندیی گشتیی ئەندامانی لە یەکیەتی ئەوروپا و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانی تردا دەبێ. EANA سیمینار ڕێک دەخا لەسەر بابەتگەلێک کە بچنە نێو بازنەی بەرژەوەندیی گشتیی ئەندامانیەوە. ئەو سیمینارانە بابەتی وەک پێشخستنی ناوەڕۆکی خزمەتگوزاریی هەواڵ و بەبازاڕیکردن و تێکنۆلۆجیای زانیاری و مافی نووسیار و بابەتگەلی تری پێوەست بەمیدیاوە دەخەنە بەر باس و لێکۆڵینەوە.

٢- ٣ EANA دەتوانێ بەناوی ئەندامانیەوە قسە و کار بکا، ئەویش لە ڕێی سەرۆک یاخۆ سکرتێری گشتی یاخۆ هەر نوێنەرێکی کە ئەو کارانەی پێ بسپێردرێ، لە گفتوگۆ و شتی تری سەبارەت بابەتی جێی بایەخی ئەندامەکانی.

مادەی سێیەم _ ئەندامیەتی

٣-١ تەنیا یەک ئاژانسی دەنگوباسی دیاری هەر وڵاتێکی ئەوروپایی دان پیانراو لەلایەن کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە دەتوانێ ببێ بەئەندام لە EANA. بەڵام کۆنگرەی گشتی دەتوانێ چاوپۆشی لەم مەرجە بکا بۆیە هەندێ جار زیاتر لە یەک ئاژانسی وڵاتێک وەک ئەندام لە EANA وەرگیراوە. ئەگەر ئاژانسێک داوای ئەندامیی پێشکێشی نووسینگەی ڕێکخراوەکە کرد، جگە لەو ئاژانسەی ئەو وڵاتە کە ئەندامی ڕێکخراوەکەیە، ئەو داوایە تەنیا کاتێ بۆ کۆنگرەی گشتی بەرز دەکرێتەوە ئەگەر بیرۆکە پەسەندی کرد و ئەوەی ئاشکرا کرد کە ئاژانسەکەی تری هەمان وڵات لاریی نییە لە وەرگرتنی ئەم ئاژانسەش لە ڕێکخراوەکەدا. بەڵام ئەگەر ئەم ئاژانسەی ئەندامە داواکەی ڕەتکردەوە، ئەوە نووسینگە کۆنگرەی

گشتی ئاگەدار دەکاتەوە و بڕیارەکە بۆ ماوەی یەک ساڵ دوا دەخرێ و لەو ماوەیەدا بەزۆرینەی سێ چارەکی ئەندامانی کۆنگرەی گشتی، بڕیار لەسەر ئەو داوایە دەدرێ.

٣-٢ پێویستە ئەندامان پشتگیریی پرنسیپەکانی ئازادیی ڕۆژنامەوانی و بێلایەنیی دەنگوباس بکەن.

٣-٣ ئابوونەی ئەندامیەتی و هەر بەخشینێکی تری نائاسایی لە لایەن ئاژانسەکانی ئەندامەوە دەبنە سەرچاوەی سەرەکیی دارایی بۆ چالاکییەکانی EANA.

٣-٤ بڕی ئابوونەی ئەندامیەتی لەلایەن کۆنگرەی گشتی و بەپێی پێشنیازی بیرۆ و بودجەی پێشکێکراو دیاری دەکرێ. تەنیا بەکەلوپەلی بنەڕەتیی خۆی بەرامبەر بەهەر پابەندییەک بەرپرس دەبێ. بۆ ئەندامانیش جگە لە بەخشینی ئاساییی ئەندامیەتی بەهیچ شێوەیەک بەرپرسیاری بێ سنوور نییە.

٣-٥ هەر ئاژانسێکی ئەندام ئابوونەی ساڵانە نەدا، دوای تێپەڕینی ١٢ مانگ بەسەر یەکەمین داواکاری کە بۆ دانی ئابوونەکە ئاراستەی دەکرێ، بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیک لە ئەندامێتی دەخرێ، تا ئەو کاتەی بیرۆی EANA بڕیار دەدا بەلەبەرچاوگرتنی بارودۆخی تایبەتی ئاژانسەکە، لێی خۆش بێ.

٣-٦ هەر ئەندامێک ئازادە لە هەر کاتێکدا خۆی لە EANA بکێشێتەوە بەمەرجێک هەموو ئەو ئابوونەیەی دابێ کە پێشتر لەسەری بووە بەئابوونەی ئەو ساڵەشەوە کە خۆی تێدا دەکێشێتەوە.

٣-٧ هیچ ئاژانسێکی ئەندام بەتەنیا بەرپرسیاری لە جیاتی EANA هەڵناگرێ و EANA لە جیاتی هیچ ئەندامێک بەرپرسیاری هەڵناگرێ.

### مادەی چوارەم _ کۆنگرەی گشتی

٤-١ ساڵانە EANA بەشێوەیەکی ئاسایی کۆنگرەی گشتیی خۆی ساز دەدا. کۆنگرەی گشتیش باڵاترین دەستەی EANAیە. هەموو ئەندامەکان بۆیان هەیە لەو کۆبوونەوە ساڵانەیەدا ئامادە بن و دەنگ بدەن. لە بنەڕەتدا دەبێ کۆنگرە گشتییەکان لە سویسرا کۆ ببنەوە و لە مێژوویێک کە ئەندامان لە کۆنگرەی گشتیدا بۆ کۆبوونەوەی ساڵی داهاتوو دیاریی دەکەن.

٤-٢ کۆنگرەی گشتی:

- بڕیار لەسەر ئامانجە درێژخایەنەکانی EANA دەدا.
- سەرۆک و ئەندامانی بیرۆ و سکرتێری گشتی هەڵدەبژێرێ.
- ڕاپۆرتی ساڵانەی سکرتێری گشتی پەسەند دەکا.
- بودجە و باری دارایی EANA پەسەند دەکا.
- بڕیار لەسەر ئابوونەی ئەندامیەتی و وەرگرتنی ئەندامی نوێ دەدا.
- بڕیاری دەرکردنی ئەندامان دەدا.
- بڕیار لەسەر هەر گۆڕانێک لە پێڕۆی EANAدا دەدا.
- بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی EANA دەدا.

کۆنگرەی گشتی بۆی هەیە لەگەڵ هەر بابەتێکی تریشدا مامەڵەت بکا کە پێوەندیی بەئامانجەکانی EANAوە هەبێ.

٤-٣ ئاژانسە ئەندامەکان پێویستە لە لایەن بەڕێوەبەرانی کارگێڕییانەوە نوێنەرایەتییان بکرێ. ئەگەر لەبەر هەر هۆیەک ئەو بەڕێوەبەرانە نەتوانن ئامادە بن دەبێ بەنووسین یەکێ لە ئەندامانی دەستەی کارگێڕی بەنوێنەری خۆیان دانێن، کە دەبێتە نوێنەری ئاژانسەکەی. هەر نوێنەرێکی فەرمیش بۆی هەیە تەنیا دوو کەس لە ئەندامانی دەستەی کارگێڕیی ئاژانسەکەی لەگەڵ خۆیدا بەشداری پێ بکا، واتە بەرزترین ژمارەی ئەندامانی هەر شاندێک نابێ لە سێ زیاتر بێ.

٤-٤ لە کاتی دەنگدان لە کۆنگرەی گشتیدا هەر ئەندامێک تەنیا یەک دەنگی هەیە. بڕیارەکان بەدەست هەڵبڕین بڕیاریان لەسەر دەدرێ مەگەر لایەنی کەم پێنج لە ئەندامان داوا بکەن دەنگدانەکە بەنهێنی بێ. بۆ هەڵبژاردنی سەرۆکیش دەنگدان نهێنییە.

٤-٥ هەر پرۆژە بڕیارێک، هەروەها هەر پالاوتنێک بۆ وەرگرتنی یەکێ لە پۆستەکان پێویستە بەنووسین و لایەنی کەم پێش کۆبوونەوەی کۆنگرەی گشتی بەدوو مانگ پێشکێشی سکرتێری گشتی بکرێ.

هەروەها پێویستە سکرتارییەت هەموو ئەو دۆکیومێنتانەی تایبەتن بەکۆنگرەی گشتییەوە بۆ ئاژانسەکانی ئەندام بنێرێ و پێویستە پێش دوو هەفتە لە گرێدانی

کۆنگرەی گشتی بگەنە دەستی هەموو ئەندامەکانەوە. هەر ئەندامێکیش ئازادە لە پێشنیازکردنی کاندید بۆ سەرۆکایەتی و ئەندامیەتیی بیرۆ. هەر پێشنیازێکی لەم جۆرەش پێویستە لایەنی کەم پشتگیریی نووسراوی دوو ئەندامی تری لەگەڵدا بێ. ئەرکی بیرۆیە لەوە بپێچێتەوە ئایا کاندید بۆ پۆستی سەرۆک و ئەندامیەتیی بیرۆ هەیە. هەر کاندیدێکیش پێویستی بەلای کەمەوە دوو ساڵ نوێنەرایەتیی ئاژانسەکەی خۆی لە EANAدا کردبێ. پێویستە کاندیدی سەرۆکایەتی، لە ئاژانسەکەی خۆیدا پلەی بەڕێوەبەری کارگێڕیی هەبێ. کاندیدەکانی سەرۆکایەتیش دەبێ لایەنی کەم یەک ساڵ ئەندامی بیرۆ بووبێ، چ ڕاستەوخۆ پێش هەڵبژاردن یاخۆ لە پێشتردا.

٤-٦ بڕیارەکان بەزۆرینەی سادەی ئامادەبووان وەردەگیرێن ئەگەر لەو بڕیارانە نەبوون کە پێویستە سێ چارەکی ئامادەبووان دەنگی بۆ بدەن، ئەو بڕیارانەش ئەمانەن:

- داماڵینی ئەندامیەتی لە هەر ئاژانسێک
- هەر گۆڕانکارییەک لە دەستووری EANA
- هەڵوەشاندنەوەی EANA
- وەرگرتنی ئەندامی نوێ پێویستی بەدەنگی سێ چارەکی ژمارەی گشتیی ئەندامان هەیە.

ڕەتکردنەوەی داوای ئەندامـــیـــەتی و وەدەرنانی ئەندام بەبێ ئاشکراکـــردنی هۆکارەکان دەکرێن.

٤-٧ ئەگەر بەپێویست زانرا، بیرۆ دەسەڵاتی هەیە داوای کۆبوونەوەیەکی نائاسایی کۆنگرەی گشتی بکا. هەروەها پێویستە بیرۆ ئەم جۆرە کۆبوونەوە نائاساییەی کۆنگرەی گشتی ساز بکا ئەگەر بەلای کەمەوە پێنجیەکی ئەندامان داوایان کرد.

مادەی پێنجەم- بیرۆ

٥-١ بیرۆ یەکەی بەڕێوەبردنی EANAیە. بیرۆ پێشنیازەکان ئامادە دەکا بۆ ئەوەی بدرێنە کۆمیتە پێوەندارەکان و کۆنگرەی گشتی و بەرپرسە لە جێبەجێکردنی بڕیارەکانی کۆنگرەی گشتی و ئەو بڕیارانە دەدا کە لە چوارچێوەی بەرپرسیاریی کۆنگرەی گشتیدا نین. بیرۆ کۆنگرەی گشتی ئامادە دەکا و ناوی پێشنیازکراو بۆ

پۆستەکان دەداتە کۆنگرەی گشتی. هەروەها بیرۆ بودجەیەک کە ئابوونەی ئەندامانیش لەخۆ دەگرێ پێشکێشی کۆنگرەی گشتی دەکا.

دەبێ بیرۆ چاودێرێک دامەزرێنێ بۆ پێداچوونەوەی کارە ژمێریارییەکانی EANA و راپۆرتی ئەو چاودێرە دەبێتە بەشێک لەو راپۆرتی داراییەی پێشکێشی کۆنگرەی گشتیی ساڵانە دەکرێ. هەروەها دەبێ بیرۆ مووچە و مەرجەکانی کارکردنی سکرتێری گشتی دیاری بکا.

٥-٢ بیرۆ لە پێنج کەس پێک دێ، سەرۆک و سکرتێری گشتی و سێ ئەندامی بیرۆ.

ماوەی مانەوە لە بیرۆدا پێویستە جێبەجێ بکرێ لە پێناو نوێبوونەوەی هەنگاو بەهەنگاوی بیرۆدا. ئەو ئەندامانەی بیرۆ کە پێش پەسەندکردنی ئەم یاسایانە هەڵبژێردراون لە پۆستی خۆیاندا دەمێننەوە تا ئەو کاتەی ماوەی پێشتر بڕیاردراوی خۆیان تەواو دەکەن. سەرۆک بۆ ماوەی دوو ساڵ هەڵبژێرراوە و سێ ئەندامەکەی بیرۆ و سکرتێری گشتی بۆ ماوەی سێ ساڵ هەڵبژێردراون.

٥-٣ جگە لە سکرتێری گشتی، هیچ یەکێ لە ئەندامانی بیرۆ بۆیان نییە هەڵبژێردرێنەوە پێش ئەوەی سێ ساڵ بەسەر کۆتایی ماوەی کاریاندا تێ نەپەڕێ. سکرتێری گشتی بۆی هەیە بۆ ماوەگەلی سێ ساڵیی تر هەڵبژێردرێتەوە.

٥-٤ بڕیار یان پێشنیاز لە ناو بیرۆدا دەبێ بەزۆرینەی سادەی ئامادەبووان وەرگیرێن. لە کاتی یەکسانبوونی دەنگەکانی ئەرێ و نەرێدا دەنگی سەرۆک یەکلاکەرەوەیە. ژمارەی یاسایی بۆ بەڕێوەچوونی کار لە بیرۆدا دەبێ سێ بێ بەسەرۆکەوە. ئەگەر ژمارەی یاسایی تەواو نەبوو، کۆبوونەوەکە دوا دەخرێ بەهەمان بەرنامەی کارەوە و لەو کاتەدا دوو ئەندامی بیرۆ دەبنە ژمارەی یاسایی. هەروەها بیرۆ دەتوانێ بڕیار بدا لەو کۆبوونەوانەی بۆ یەک بابەت دەبەسترێن بەمەرجێک ئەندامان بەم کارە قایل بن.

٥-٥ ئەگەر لە نێوان دوو کۆنگرەی گشتیدا پۆستێکی ئەندامی بیرۆ چۆڵ بوو، بیرۆ دەسەڵاتی هەیە ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە بەدانانی هەر ئەندامێکی شیاو بۆ ئەو پۆستە. بەڵام ماوەی کاری ئەم ئەندامە دانراوە تەنیا تا بەستنی کۆنگرەی گشتی

درێژەی هەیە. ئەندامی دانراو بۆی هەیە لە کۆنگرەی گشتیدا خۆی بپاڵێوێ بۆ ماوەی سێ ساڵی تەواوی ئەندامیەتیی بیرۆ.

مادەی شەشەم- سەرۆک

٦-١ دەبێ سەرۆک نوێنەری فەرمیی EANA بێ و دەسەڵاتی ڕێکخراوەکەی بەدەستە. ئەویش سەرۆکایەتیی کۆنگرەی گشتی و کۆبوونەوەکانی بیرۆ دەکا.

٦-٢ ئەگەر لە نێوان دوو کۆنگرەی گشتیدا پۆستی سەرۆک چۆڵ بوو، بیرۆ یەکێ لە ئەندامانی خۆی بەسەرۆک هەڵدەبژێرێ تا کۆنگرەی گشتی.

مادەی هەفتەم- سکرتێری گشتی

٧-١ دەبێ سکرتێری گشتی بەرپرس بێ لە ڕێکخستنی چالاکییەکان و بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی EANA. هەروەها سکرتێری گشتی کاروباری ڕۆژانەی EANA لە ژێر چاودێریی بیرۆدا بەڕێوە دەبا. ئەو لە حیساباتی EANA بەرپرسیارە. ئەو بەرپرسە لە سازدانی کۆبوونەوەکانی بیرۆ و ئامادەکردنی هەموو بەڵگەنامەکانی تایبەت بەکۆنگرەی گشتی. دەبێ ساڵانە راپۆرتێک پێشکێشی کۆنگرەی گشتی بکا سەبارەت بەچالاکییەکان و باری دارایی EANA.

٧-٢ ئەگەر لە نێوان دوو کۆنگرەی گشتیدا پۆستی سکرتێری گشتی چۆڵ بوو، بیرۆ بۆی هەیە بەو شێوەیەی بەباشی دەزانێ و تا کۆنگرەی گشتی شوێنەکە پڕ بکاتەوە.

٧-٣ سکرتێری گشتی مووچەخۆری EANAیە.

٧-٤ ئەو ئەدرێسەی EANA بەکاری دێنێ دەبێ ئەدرێسی سکرتێری گشتی بێ.

مادەی هەشتەم- لیژنەکان

٨-١ بیرۆ بڕیاری دروستکردنی گرووپگەلی کار دەدا و لەسەر بنەمای پێوەنداری و بەو شێوەیەی کاری EANA دەیخوازێ.

٨-٢ بەپێشنیازی بیرۆ، کۆنگرەی گشتی بۆی هەیە بڕیاری دروستکردنی کۆمیتەگەلی تایبەت بدا و سەرۆک بۆ ئەو کۆمیتانە دەستنیشان بکا. سەرۆکی

هەر کۆمیتەیەک دەبێ ساڵانە راپۆرتی خۆی لەسەر چالاکییەکانی کۆمیتەکەی بدا بەکۆنگرەی گشتی. ئەگەر پێویست بێ دەبێ سەرۆکی کۆمیتە وەک ڕاوێژکارێک ئامادەی کۆبوونەوەی بیرۆ بێ و لێرەدا دەبێ راپۆرتی کاتی پێشکێش بە بیرۆ بکا.

مادەی نۆیەم- دارایی

٩-١ بودجەی هەر ساڵێک لە لایەن کۆنگرەی گشتییەوە و بەپێی پێشنیازی بیرۆ، کە ڕەشنووسی بودجە بۆ ئەم مەبەستە پێشکێش بەکۆنگرەی گشتی دەکا، بڕیار دەدرێ.

مادەی دەیەم- زمان

زمانی کار لە EANAدا ئینگلیزییە.

ئەندامانی EANA:

ئاژانسی ئەنادۆڵ- تورکیا، ئاژانسی فرانس پرێس، ئاژانسی دەنگوباسی ئەتینا، ئاژانسی تێلیگرافی ئەلبانیا، ئاژانسی ANP هۆڵەندا، ئاژانسی نیشتمانیی ستامپا ئەسۆسیاتا- ئیتالیا، ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی نەمسا، ئاژانسی تێلیگرافی سویسرا، خزمەتگوزاریی دەنگوباسی بەلتیق، ئاژانسی دەنگوباسی بولگاریا، ئاژانسی تێلیگرافی بیلگا، ئاژانسی دەنگوباسی قبرس، ئاژانسی دەنگوباسی چیک، ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی ئەڵمانیا، ئاژانسی EFE ئیسپانیا، ئاژانسی دەنگوباسی کرواتیا، ئیتار-تاس ڕووسیا، ئاژانسی دەنگوباسی پۆرتۆگال، ئاژانسی دەنگوباسی هەنگاریا، ئاژانسی تێلیگرافی نۆرسک، کۆمەڵەی سنووورداری ڕۆژنامەوانی- بریتانیا، ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی پۆڵەندا، ریتزاو، ئاژانسی نیشتمانیی ڕۆژنامەوانی- ڕۆمانیا، ئاژانسی دەنگوباسی سلۆڤینیا، ئاژانسی دەنگوباسی فینلەندا، ئاژانسی دەنگوباسی سربیا- مۆنتنیگرۆ، ئاژانسی دەنگوباسی کۆماری سلۆڤاک، ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسی ئۆکرانیا. ڕێکخراوی ئاژانسەکانی دەنگوباسی ئاسیا-پاسیفیک OANA.

ڕێکخراوی ئاژانسەکانی دەنگوباسی ئاسیا-پاسیفیک OANA ساڵی ١٩٦١ وەک دەسپێشخەرییەکی یونسکۆ دروست کرا، بەمەبەستی مسۆگەرکردنی ئاڵوگۆڕی ڕاستەوخۆ و ئازادانەی دەنگوباس لە نێوان ئاژانسەکانی دەنگوباس لە ناوچەیەکدا

کە زیاتر لە نیوەی دانیشتووانی سەر زەویی تێدا نیشتەجێن. OANA چل ئاژانسی دەنگوباسی ٣٣ وڵات بەیەکەوە کۆ دەکاتەوە. دوو سێیەکی ئەو زانیاریانەی بەجیهاندا بڵاو دەبنەوە لە لایەن ئەندامانی OANAیەوە بڵاو دەکرێنەوە.

دوازدەمین کۆنگرەی گشتیی OANA لە ساڵی ٢٠٠٤ ڕاگەیاندنی کوالا لامپووری لێ کەوتەوە، کە هێڵە ڕێشاندەرەکانی کارە سەرکەوتووەکانی ئاژانسەکانی دەنگوباس دیاری دەکات. ئەو ئاژانسە ئەندامانەی لەوێ کۆ بووبوونەوە جەختیان لەسەر پابەندی بەهاوئاهەنگیی کاریگەر و پشتگیریی نێوانیان کردەوە لە کۆکردنەوەی هەواڵ و زانیاری لەو دیوی سنوورەکانەوە و گۆڕینەوەی ئەو جۆرە هەواڵ و زانیارییانە.

## پێڕۆ

پێشەکی

حەفتەمین کۆنگرەی گشتیی ڕێکخراوی ئاژانسەکانی دەنگوباسی ئاسیا-پاسیفیک لە جاکارتا قایل بوو بەپابەندبوون بەم پێڕۆیەوە (کە لێرەوە بەپێڕۆ ئاماژەی بۆ دەکرێ) کە بریتییە لە هەموارکردنی ئەو ڕەشنووسەی لە پێنجەمین کۆنگرەی گشتی لە کوالا لامپور لە تشرینی دووەمی ١٩٨١دا پێشکێش کرا و لە کاتی بڕیار لەسەر دانیەوە کاری پێ دەکرێ.

### بەشی یەکەم- ئامانجەکانی ڕێکخراوەکە

مادەی ١: ئامانجەکانی ڕێکخراوەکە بریتین لە:

- زیادکردن و ئاسانکردنی گەیشتنی ئازادانەتری هەواڵ و زانیاری لە ئاسیا و لە پاسیفیکدا.
- هاندانی نەهێشتنی کرداری جیاکەرەوە و کۆتوبەندی ناپێویست کە لە لایەن حکوومەتەکانەوە دادەنرێن و کار دەکەنە سەر کاری ئاژانسەکانی دەنگوباس لە گواستنەوە و بڵاوکردنەوەی هەواڵ، مەبەستیش لەمە مسۆگەرکردنی گەیشتنی زانیارییەکانی هەواڵ بەخەڵکی ئەم جیهانە بەبێ جیاکردنەوە، ڕێگری لەبەر

هۆکاری ئەمنی خۆی لە خۆیدا جیاکاری نییە ئەگەر ئەو ڕێگرانە بۆ ئەوە نەبن کە ڕێ لە گەیشتنی ئازادانەی زانیارییەکانی دەنگوباسی نێودەوڵەتی و گواستنەوەیان یاخۆ بڵاوکردنەوەیان نەگرن.

ج- دابینکردنی میکانیزمی هاوکاری لە نێوان ئاژانسەکانی دەنگوباس یاخۆ گرووپەکانی ئاژانسەکانی دەنگوباس لە ئاسیا و پاسیفیک بۆ ئەوەی وەک تۆڕێکی هەواڵ گۆڕینەوە کار بکەن یان کاری ئاڵوگۆڕی هەواڵ ئاسان بکا لە ڕێی سەنتەرێک یا زیاتر کە کارەکەی گواستنەوەی هەواڵ بێ نەک نووسینەوەی ئەو هەواڵانەی لە تۆڕی ئاژانسگەلی تر و هاندانی پابەندبوون بەبەرزترین ستاندارەکانی گۆڕینەوە و بڵاوکردنەوەی هەواڵ.

د- بەشداریی چالاکانە لە ڕاستکردنەوەی نەبوونی هاوسەنگی لە زانیاری و باشکردنی ئاڵوگۆڕی هەواڵ لە نێوان وڵاتانی پێشکەوتوو و وڵاتانی پێگەیشتوودا.

هـ- بەشداریکردن لەو هەوڵە نیشتمانی و ناوچەیی و نیوەناوچەییانەی پێوەستن بەچارەسەرکردنی گرفتەکانی هەژاری و برسییەتی و بێکاری و نەخۆشی و لە مۆدێرنیزەکردنیشدا.

و- پابەندبوون بەئاشتی و لەیەک تێگەیشتنی نەتەوەکان و بەرەنگاربوونەوەی هەموو جۆرەکانی ڕەگەزپەرستی و داگیرکاری و کۆلۆنیالیزمی نوێ.

ز- بەهێزکردنی پێوەندییەکانی هاوکاریی نێوان ئاژانسەکانی دەنگوباسی ئاسیا-پاسیفیک و لە نێوان ئەوان و ئاژانسەکانی بەشەکانی تری جیهان لە پێناو بەرژەوەندیی هەردوو لادا.

ح- لە کاتی پێویستدا تۆژینەوە و کاری هاوبەش هەبێ بۆ ئەنجامدانی هەنگاوی هاوبەش بۆ باشترکردنی نووسیاری و ڕاهێنان و گەیاندن و تەکنیک لە پێناو جێبەجێکردنی ئەو ئامانجانەی سەرەوە.

**بەشی دووەم- ئەندامیەتی**

مادەی ٢: دەبێ دەرگەی ئەندامیەتی لە ڕێکخراوەکەدا بەڕووی هەموو ئاژانسەکانی وڵاتانی ئاسیای پاسیفیکی ئەندام لە یونسکۆدا کراوە بێ، بەمەرجێ ئەو مەرجانەیان تێدا بن کە لەم بەشی دووەمەدا هەن.

مادەی ٣:

أ- ئاژانسەکانی دەنگوباس لە وڵاتانی ئاسیا و پاسیفیک کە ئەندامن لە یونسکۆدا بۆیان هەیە داوای ئەندامیەتی لەم ڕێکخراوەدا بکەن و بەداوایەکی نووسراو ئاراستەی ئەنجوومەنی کارگێڕیی ڕێکخراوەکەی بکەن.

ب- ئەنجوومەنی کارگێڕی بۆی هەیە شایانبوونی ئاژانسێکی دەنگوباس بۆ ئەندامیەتی دیاری بکا بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی ئاژانسەکە لە ئاستی نێودەوڵەتیدا دانی پێدا نرابێ.

ج- هەر داواکارێک پێویستە هەوڵ بۆ بەدەستهێنانی پشتگیریی ئەو ئاژانسە یاخۆ ئاژانسگەلەی وڵاتەکەی کە ئەندامی ڕێکخراوەکەن بدا.

د- ئەنجوومەنی کارگێڕی بۆی هەیە ئەو داواکارییە پەسەند بکا یاخۆ ڕەتی بکاتەوە.

مادەی ٤: هەر ئەندامێک نەتوانێ پابەندی ئەم پێڕۆیە بێ، یاخۆ هەر یاسا و ڕێنوێنییەکی بەپێی ئەم پێڕۆیە دەرچووبێ، لەوانەیە ئەندامیەتی لەدەست بدا، ئەویش بەبڕیاری دوو سێیی ئەندامان.

مادەی ٥

- گرووپگەلی ڕۆژنامە، یان ئاژانسی زانیاری، ئان ئاژانسەکانی دەنگوباس یا هەر ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتیی تر، یا ئەوانەی میوانداریی نووسینگەکانیان کردووە یا هەر دەستەیەکی پیشەیی ڕۆژنامەوانیی نیشتمانی یا نێودەوڵەتی، دەشێ لە لایەن دەستەی کارگێڕییەوە پلەی چاودێریان لە کۆنگرەی گشتیدا بدرێتێ.
- چاودێران بۆیان هەیە لە گفتوگۆکانی کۆنگرەی گشتیدا بەشدار بن بەبێ ئەوەی مافی دەنگدانیان هەبێ.

ج- ژمارەی ئەم چاودێرانە لە هەر وڵاتێکەوە لە هیچ کاتێکدا نابێ لە شەش کەس تێ پەڕێ.

## بەشی سێیەم- ئۆرگانەکان

مادەی ٦: دەبێ ڕێکخراوەکە لە کۆنگرەی گشتی و دەستەی کارگێڕی پێک بێ، لەگەڵ ئۆرگانی تری لاوەکی کە ڕێکخراوەکە لە کاتی خۆیدا بەپێویستیان بزانێ.

## بەشی چوارەم- کۆنگرەی گشتی

مادەی ٧: پێویستە دەسەڵاتی باڵا لە ڕێکخراوەکەدا لە لای کۆنگرەی گشتی بێ.

مادەی ٨:

- دەبێ کۆنگرەی گشتی سێ ساڵ جارێک ببەسترێ لە کات و شوێنێکی وا کە دەستەی کارگێڕی بۆ ماوەی جارێک دیاریی دەکا.
- دەبێ کۆنگرەی گشتیی نائاسایی ببەسترێ، دوای ٦٠ ڕۆژ لە پێشکێشکردنی داوایەک لە لایەن زۆرینەی ئەندامانەوە بەدەستەی کارگێڕی، تیایدا پێشانی بدەن کە ئەوان داوای کۆبوونەوە دەکەن، یاخۆ لە هەر کاتێکدا دەستەی کارگێڕی دوای ئەو مۆڵەتی ٦٠ ڕۆژە بەپێویستی بزانێ.

مادەی ٩: زۆرینەی ئەندامان دەبێ ژمارەی یاسایی بۆ دانیشتنەکانی کۆنگرەی گشتی پێک بێنن.

مادەی ١٠: کارەکانی کۆنگرەی گشتی بریتین لە:

- لە کۆبوونەوەی ئاساییدا، هەڵبژاردنی سەرۆک و چوار جێگری سەرۆک و شەش ئەندامی دەستەی کارگێڕی، کە هەموویان لە ئەندامانن، ئەمانە پۆستەکانیان تا کۆبوونەوەی ئاسایی داهاتوو بەردەوام دەبن.
- یاسای تایبەت بەخۆی بۆ ئەنجامدانی کارەکان دەرکا، بەمەرجێ ئەو یاسایانە لە پێڕۆی ڕێکخراوەکەدا نەبن.

ج- دامەزراندنی هەر لقێکی کاتی یاخۆ بەردەوامی ڕێکخراوەکە ئەگەر بەپێویست زانرا و لەسەر پێشنیازی دەستەی کارگێڕی.

د- وەرگرتن و پێداچوونەوەی راپۆرتگەلی دەستەی کارگێڕی و بڕیاردان لە هەر پرسێک کە دەستەکە لە راپۆرتەکەیدا باسی کردبێ.

هـ- بڕیاردانی بابەتە داراییەکانی ڕێکخراوەکە بەپێی بەشی چوارەم.

و- پێداچوونەوەی خەرجییەکان و بڕیاردان لەسەر حیساباتی ڕێکخراوەکە.

مادەی ١١: دەبێ کۆنگرەی گشتی دەسەڵاتی هەبێ لە هەڵە و کەمتەرخەمی و

نارێکییەکان بەرامبەر پێڕۆ خۆش بێ تەنیا ئەگەر نارێکییەکە لە هەڵبژاردنی ئەندامێک بوو بۆ دەستەی کارگێڕی.

## بەشی پێنجەم- دەستەی کارگێڕی

مادەی ١٢: دەستەی کارگێڕی دەبێ لە ١١ ئەندام پێک هاتبێ کە لەلایەن کۆنگرەی گشتییەوە هەڵبژێردرابن و ئەوانیش بریتین لە سەرۆک و چوار جێگری سەرۆک و شەش ئەندامی ئاسایی دەستەکە. لە کاتی هەڵبژاردنی ئەندامانی دەستەی کارگێڕیشدا پێویستە کۆنگرەی گشتی چاودێریی ئەوە بکا ئەو ئەندامانە نوێنەرایەتیی هەموو شوێنێکی ناوچەی ئاسیا و پاسیفیک دەکەن.

مادەی ١٣:

- ئەو ئەندامانەی لە دەستەی کارگێڕیدا بەپێی مادەی ١٧ نوێنەرایەتی دەکرێن، پێویستە تا کاتی کۆبوونەوەی ئاسایی داهاتوو لە پۆستەکانیان بن، ئەندامانیش دەبێ بۆیان هەبێ دووبارە هەڵبژێردرێنەوە.
- هیچ ئاژانسێک بۆی نییە لە دوو جاری دوابەدوای یەک زیاتر پۆستی سەرۆک وەرگرێ.

مادەی ١٤:

- سەرۆک (یاخۆ ئەگەر نەبوو یان نەیتوانی وەک ئەندامێکی دەستەی کارگێڕی کار بکا، جێگرێکی سەرۆک کە سێ جێگرەکەی تر دەستنیشانی بکەن یان ئەگەر توانی دەستیشانکردنەکە نەبوو با بەتیروپشک هەڵی بژێرن) پێویستە لە ماوەی وەرگرتنی پۆستەکەیدا سەرپەرشتیی هەموو کۆبوونەوەکانی دەستەی کارگێڕی و دانیشتنەکانی کۆنگرەی گشتی بکا و دەبێ بەرپرسیار بێ لە باش بەڕێوەچوونی هەموو ئەو دانیشتنانە. ئەگەر هیچ یەکێک لە جێگرانی سەرۆک ئامادە نەبوو یاخۆ توانای نەبوو ئەو کارە ئەنجام بدا، ئەندامێکی دەستەی کارگێڕی کە لە لایەن ئەندامانی دەستەکەوە هەڵبژێردرێ سەرۆکایەتییان دەکا.
- دەستەی کارگێڕی دەبێ خۆی یاسا و ڕێساکانی خۆی دەر بکا بەمەرجێک یاسا و ڕێسا بۆ ئەو بابەتانە لە پێڕۆدا نەبن.

ج- زۆرینه له دەستەی کارگێڕیدا دەبێ ژمارەی یاسایی پێک بهێنن.

د- بڕیارەکانی دەستەی کارگێڕی دەبێ بەزۆرینەی ئەندامانی دەنگدەری دەستەی کارگێڕی بن.

ه- پێویسته دەستەی کارگێڕی به لایەنی کەم ساڵی جارێک کۆ ببێتەوە. پێوسته کۆبوونەوەکانیشی له شوێنگەلێکی گونجاودا بن.

مادەی ١٥: ئەنجوومەنی کارگێڕی بۆی هەیە هەر ئاژانسێکی ئەندام بانگهێشتن بکا بۆ بەشداربوون له کۆبوونەوەکانیدا بەبێ ئەوەی ئەو ئەندامە مافی دەنگدانی له گفتوگۆکان یا هەر بابەتێکی تردا هەبێ.

مادەی ١٦:

- پێویسته سکرتێرێکی گشتی هەبێ که بۆ هاوکاریی سەرۆک دامەزرابێ.

- دەستەی کارگێڕی ئەو سکرتێره گشتییه، بەڕاوێژ لەگەڵ سەرۆکدا، دەستنیشان دەکا.

مادەی ١٧: پێویسته دەستەی کارگێڕی هەموو حیساباتی دارایی ڕێکخراوەکه و تێبینی و پێشنیازەکانی خۆی له بارەیانەوە بداته کۆنگرەی گشتی.

مادەی ١٨: دەبێ دەستەی کارگێڕی راپۆرتێک له بارەی کاری ڕێکخراوەکه له دانیشتنی ئاسایی پێشووەوە بۆ هەر دانیشتنێکی ئاسایی کۆنگرەی گشتی ئامادە بکا.

مادەی ١٩: دەستەی کارگێڕی بۆی هەیە بچێته نێو ڕێککەوتنگەلی تایبەت بەپێوەندی لەگەڵ ڕێکخراوی تردا، وەک له بەشی یەکەمدا هاتووە.

مادەی ٢٠: هەر کاتێ پێویست بکا، دەستەی کارگێڕی بۆی هەیە لەسەر کاروباری ڕێکخراوەکه، بەشێوەی نووسراو یا هەر شێوازێکی تر، ڕاوێژ بەئەندامانی ڕێکخراوەکه بکا. هەر پێشنیازێکیش بەم شێوەیه باس بکرێ و بەنووسین لەلایەن زۆرینەی ئەندامانەوە پەسەند بکرێ بەبڕیار لەسەردراو دەژمێرێ.

مادەی ٢١: دەستەی کارگێڕی بۆی هەیە پێشنیاز بۆ کۆنگرەی گشتی بکا، کەی پێویستە ئابوونەی ئەندامان چاوی پێدا بخشێنرێتەوە.

مادەی ٢٢: دەبێ دەستەی کارگێڕی دەسەڵاتی دامەزراندنی کۆمیتە و دەستنیشانکردنی هەرکەسێکی هەبێ بۆ جێبەجێکردنی کاری پێویست بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجانەی ڕێکخراوەکە کە لە بەشی یەکەمدا هاتوون.

مادەی ٢٣: دەبێ سکرتێری گشتی خشتەیەکی کاری کاتی بۆ هەر دانیشتنێکی کۆنگرەی گشتی دارێژێ و بەسەر هەموو ئەندامانـدا، لایەنی کەم دوو مانگ پێش دانیشتنەکە، دابەش بکرێ. هەر ئەندامێکیش بۆی هەیە بەنووسین سکرتێری گشتی ئاگەدار بکاتەوە لەو بابەتانەی پێویستە بخرێنە سەر ئەو خشتەی کارە، ئەمە دەبێ لایەنی کەم یەک مانگ پێش دانیشتنەکە بکرێ. دەبێ دەستەی کارگێڕی بڕیار لەسەر خشتەی کاری هەر دانیشتنێک بدا.

مادەی ٢٤: دەبێ سکرتێری گشتی ئەندامان لە چالاکییەکانی ڕێکخراوەکە ئاگەدار بکاتەوە.

مادەی ٢٥: دەبێ سکرتێری گشتی ئەو ئەرکانەش بەجێ بگەیەنێ کە جاربەجار لە لایەن سەرۆکەوە بۆی دیاری دەکرێن.

**بەشی شەشەم- دارایی**

مادەی ٢٦: خەرجیی گشتیی ڕێکخراوەکە دەبێ بەو ئابوونانە دابین بکرێ کە لە ئەندامان وەردەگیرێ، هەروەها بەو بەخشین و هاوکاریانەی ڕێکخراوەکە وەرگرتنیان بەگونجاو دەزانێ.

مادەی ٢٧: هەر ئەندامێک لە ماوەی یەک ساڵی دوای هاتنی کاتی خۆی نەتوانێ ئەرکە داراییەکانی خۆی بەرامبەر ڕێکخراوەکە بەئەنجام بگەیەنێ، مافی دەنگدانی لە کۆنگرەی گشتی و دەستەی کارگێڕیدا نامێنێ، تەنیا لەو کاتەدا نەبێ کە کۆنگرەی گشتی بەپێی دەسەڵاتی خۆی لەم سزایە خۆش بێ.

مادەی ٢٨: دەبێ سکرتێری گشتی کەشفی حیساباتی هەر ساڵێک ئامادە بکا و پێشکێشی دەستەی کارگێڕیی بکا.

## بەشی حەفتەم- دەنگدان

مادەی ٢٩: پێویستە لە دەنگدان لە کۆنگرەی گشتی و دەستەی کارگێڕیدا ئەم خاڵانە لەبەر چاو بگیرێن:

- هەر ئەندامێک تەنیا یەک دەنگی هەبێ.
- تەنیا ئەگەر لەم پێڕۆیەدا پێوانەکەی هاتبێ، دەبێ بڕیارەکانی دەستەی کارگێڕی و کۆنگرەی گشتی بەزۆرینەی دەنگی ئەو ئەندامانە بن کە ئامادەن و دەنگ دەدەن. لەو کاتانەشدا کە بارەکە دەگاتە گرێکوێرە دەنگی سەرۆک یاخۆ ئەو کەسەی سەرۆکایەتیی دانیشتنەکە دەکا یەکلاکەرەوەیە.

## بەشی هەشتەم- هەموارکردنەکان

مادەی ٣٠: دەقی هەموارکردنە پێشنیازکراوەکان، پێویستە لە لایەن سکرتێری گشتییەوە شەش مانگ پێش گرێدانی ئەو کۆنگرە گشتییەی بڕیاریان لەسەر دەدا، بگەیەنرێ بەئەندامان. پێویستیشە هەموارکردنەکە لە لایەن دوو سێیەکی ئەندامانی ئامادەبوو و دەنگدەری کۆنگرەی گشتی یاخۆ بەڕاپرسیی پۆستەیی پەسەند بکرێ و دەبێ هەر لەگەڵ پەسەندکردنیدا کاری پێ بکرێ.

مادەی ٣١: هەر هەموارکردنێک بەپێی مادەی ٣١ پەسەند بکرێ، دەبێ بەزووترین کات لە دوای دانیشتنەکە و لە لایەن سکرتێری گشتییە بدرێ بەگشت ئەندامان.

## بەشی نۆیەم- کشانەوە

مادەی ٣٢:

- هەر ئەندامێک بۆی هەیە لە ڕێکخراوەکە بکشێتەوە، بۆ ئەمەش نووسراوێک ئاگادارکەرەوە دەدرێتە سکرتێری گشتیی ڕێکخراوەکە و ئەویس یەکسەر ئەندامانی تری ڕێکخراوەکە لەو نووسراوە ئاگادار دەکاتەوە.

- کشانەوەکە دەبێ لە ماوەی سێ مانگی دوای ئەو مێژووەی بێ کە تیایدا سکرتێری گشتی نووسراوەکە وەردەگرێ.

**بەشی دەیەم- بابەتگەلی جۆراوجۆر**

مادەی ٣٣- زمان: زمانی فەرمیی ڕێکخراوەکە بۆ هەموو کاروبارێکی زمانی ئینگلیزییە، یاخۆ هەر زمانێک یا زمانگەلێکی کە کۆنگرەی گشتی دیاریی بکا.

مادەی ٣٤- ڕوونکردنەوە: هەر پرسیارێک یاخۆ جیاوازییەک لە لێکدانەوە یان جێبەجێکردنی پێڕۆکەدا پێویستە بخرێتە بەر دەستی دەستەی کارگێڕی و بڕیاری ئەویش بڕیاری کۆتایی دەبێ.

داتوک سەید جەمیل جەعفەر، بەڕێوەبەری گشتیی بەرناما (مالیزیا) بەنوێنەرایەتیی OANA لە WCNA لە مۆسکۆ بەشدار بوو و وتی:

ئەم کاتانە کاتی ناجێگیر و بگرە جێی سەرسامیشن، ئێمە ڕۆژانە لە پاڵ شتانی تردا توندوتیژی و ململانێ و کارەسات و نەهامەتیی دەستکردی سروشت و مرۆڤ دادەپۆشین. ئەمانە ڕووی ناشیرینی ئەرکی ئاژانسەکانی دەنگوباس و میدیان بەگشتی، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا بەشێکی پێویستی کاری ئێمەن.

کات و وزە و هەوڵی زۆر بۆ داپۆشینی ڕووداوەکانی عێراق و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و بەشە جیاجیاکانی ئەفریقا و شوێنانی تر تەرخان کراون، لەبەرئەوەی ئەم ڕووداوانە پێوەندییان بەژیانی مرۆڤایەتییەوە بەگشتی هەیە. لەم سەردەمی گەیاندنی یەکسەرەدا ئەو ڕووداوانەی لە دووریی هەزاران میل ڕوو دەدەن لە ماوەن چەند خولەکێکدا پێمان دەگەن. بۆیە ئەرکی ئێمەیە بڵاوکردنەوەی ڕاست و وردی هەواڵ و زانیارییەکان لەسەر ئەو ڕووداوانە بەگشت جیهان مسۆگەر بکەین. بەرناما سایتی OANA لە تۆڕی ئینتەرنێتدا بەڕێوە دەبا. بەرهەمی زانیاری ئامێزی OANA نیوس وایەر بابەتەکانی ئاژانسەکانی دەنگوباسی ئاسیا-پاسیفیکی لەخۆ دەگرت و بەخۆڕایی لەو سایتەدا دەست دەکەوتن، بەڵام لە ١٥ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٢وە ئەوەی بیەوێ سوود لەو بابەتانە وەرگرێ پێویستە فۆرمی تایبەت پڕ بکاتەوە و بۆ سکرتارییەتی بنێرێ بۆ ئەوەی مەرجەکانی بەشداربوونی لا ڕوون ببێتەوە.

ئەندامانی OANA: ئاژانسی دەنگوباسی باختار (ئەفگانستان)، خزمەت گوزاریی زانیاریی ئەسۆشیێتد پرێسی ئوستراليا (ئوستراليا)، ئاژانسی تێلیگرافی حکوومەتیی ئازەربایجان، بەنگلادیش سانگباد سانگستا، یونایتد نیوسی بەنگلادیش، ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی خمێر (کەمبۆدیا)، ئاژانسی دەنگوباسی چینهوا (چین)، ئاژانسی ناوەندیی دەنگوباسی کۆریا (کۆریای باکور)، ئاژانسی دەنگوباسی ئیمارات، ئاسیان نیوس ئینتەرناشناڵ و پرێس ترەستی هیندستان (هیندستان)، ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسی ئەنتارا (ئیندۆنیسی)، ئاژانسی دەنگوباسی کۆماری ئیسلامی (ئێران)، ژیژی پرێس لیمیتد و کیۆدۆ نیوس (ژاپۆن)، کۆمپانیای نیشتمانی "کازئینفۆرم" و ئاژانسی خەبەر (کازاخستان)، ئاژانسی دەنگوباسی کوەیت، ئاژانسی دەنگوباسی قیرغیز، ئاژانسی لاو نیوس، ئاژانسی دەنگوباسی بەرناما (مالیزیا)، مۆنتسام (مۆنگۆلیا)، راستریا ساماچار ساماتی (نیپال)، ئاژانسی دەنگوباسی عومان، ئەسۆشیێتد پرێسی پاکستان، پاکستان پرێس ئینتەرناشناڵ، ئاژانسی دەنگوباسی فیلیپین، ئاژانسی دەنگوباسی قەتەر، ئاژانسی دەنگوباسی یۆنهاپ (کۆریای باشوور)، ئیتار-تاس، ئاژانسی زانیاریی رووسیا "نۆڤۆستی"، ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی سعوودیە، لانکاپوڤات لیمیتد (سری لانکا)، ئاژانسی دەنگوباسی عارەبیی سووریایی، ئاژانسی دەنگوباسی تایلاند، ئاژانسی دەنگوباسی ئەنادۆڵو (تورکیا)، ئاژانسی دەنگوباسی ڤێتنام، ئاژانسی دەنگوباسی یەمەن.

هاوپەیمانیی ئاژانسەکانی دەنگوباسی دەریای ناوەڕاست AMAN

هاوپەیمانیی ئاژانسەکانی دەنگوباسی دەریای ناوەڕاست ڕێکخراوی ئاژانسەکانی دەنگوباسی وڵاتانی سەر دەریای ناوەڕاستە و ٢٠ ئاژانسی نیشتمانیی ئەو وڵاتانە تیایدا ئەندامن. ئەم هاوپەیمانییە لە ناو خۆیدا ئاژانسگەلێکی وڵاتانی پارزەوینی ئەورووپا و وڵاتانی عارەب و وڵاتانی باکوری ئەفریقا و نیمچە دورگەی بالکان کۆ دەکاتەوە. لە ڕێی ئەم ڕێکخراوەوە ئاژانسەکانی ئەم ناوچەیە شارەزایی لە بواری زانیاریدا دەگۆڕنەوە.

ماوەی دە ساڵە ئەم ڕێکخراوە دامەزراوە AMAN شارەزاییی گشتی کۆ دەکاتەوە

و بڵاوی دەکاتەوە و زانیاری ئاڵوگۆڕ دەکا و کێبەرکێش بۆ باشترین بابەتی وێنە و هەواڵ ڕێک دەخا. ئەندامانی AMAN لە فرانسەوە بۆ مۆریتانیا و لە میسرەوە بۆ ئیسپانیا و لە ئیتاڵیاوە بۆ لبنانن. لە ساڵی ٢٠٠٤ ئەلبانیا شەرەفی میوانداریکردنی سێزدەمین کۆنگرەی گشتیی AMANی پێ برا.

ڕاگەیاندنی ١٩٩١ی تونس بۆ پێکهێنانی هاوپەیمانییەک بۆ ئاژانسەکانی دەنگوباسی دەریای ناوەڕاست AMAN

## پێڕۆ

پێشەکی: ڕاگەیاندنی تونس لە ٢١ی تشرینی دووەمی ١٩٩١ "بەڕێوەبەرانی گشتیی ئاژانسەکانی دەنگوباس لە وڵاتانی دەریای ناوەڕاست کە لە کۆڕێکی نێودەوڵەتیدا بەشدارن". گەیاندن لە دەریای ناوەڕاست و داهاتوو "لە تونس لە نێوان ١٩ و ٢١ی تشرینی دووەمی ١٩٩١ وەک بەشێک لەو کۆبوونەوەیەی بەبۆنەی یادی ٣٠ ساڵەی ئاژانسی دەنگوباسی تونس ڕێک خرا: لە ڕوانگەی لەبەرچاوگرتنی ئەو پێوەندییە دێرین و فرەلایەنانەی نێوان هەردوو بەری دەریای ناوەڕاست،

لەو باوەڕەشەوە کە لە داهاتوودا زانیاریی نزیکتر لە نێوان ئاژانسەکانی دەنگوباسی وڵاتانی ئەمبەر و ئەوبەری دەریای ناوەڕاست دەبێ،

بەجەخت کردن لەسەر ئەوەی زانیاری و گەیاندن دەتوانن ڕۆڵی بنەڕەتی بگێڕن لە دەرخستنی هەستکردن بەپێویستیی بەهێزکردنی پێوەندییەکانی نێوان وڵاتانی دەریای ناوەڕاست، بەو باوەڕەی کە پرسی وەک بەدیموکرات بوون و ژینگە و کۆچ و ئاشتی و ئاسایش لە دەریای ناوەڕاستدا دەشێن ببنە بابەتی گفتوگۆی نێوان ئەم ئاژانسانە، ڕای دەگەیەنن کە پێویستە ئەم پێوەندییە هەبێ لە پاڵ ویستی بەشداربوون لە زانیارییەکانی دەریای ناوەڕاست و لە چوارچێوەی گواستنەوەی ئازادانەی زانیاریدا، بەو بۆچوونەش کە کۆبوونەوەکانی نێوان ئاژانسەکانی دەنگوباسی وڵاتانی دەریای ناوەڕاست لە کاتی دیاریکراودا گفتوگۆ و هاوکاریی نێوانیان بەهێز دەکا و هانیان دەدا لە بواری تریشدا بەیەکەوە کار بکەن، بۆیە ڕای دەگەیەنن کە دەیانەوێ گرووپێکی کار پێک بهێنن لە ئاژانسەکانی LUSA (پۆرتۆگال)

و AA (تورکیا) و SANA(سووریا) و له لایەن TAP (تونس) ڕێک بخرێ بەمەبەستی بەهێزکردنی هاوکاریی نێوان ئاژانسەکان.

ئەم کۆمیتەیە بەرپرس دەبێ لە گەڕان بەدوای هەل و ئەگەرەکانی هێنانەدیی ئامانجە گشتییەکانی لە کۆڕەکەی تونسدا باس کران وەک دامەزراندنی یەکیەتیەک یاخۆ یانەیەک بۆ بلاوکراوەی هەواڵەکانی دەریای ناوەڕاست و دروستکردنی ئەنجوومەنێک بۆ ئاژانسەکانی دەنگوباسی دەریای ناوەڕاست و پێشخستنی پێوەندییە تێکنیکییەکانیان". بەلەبەرچاوگرتنی ئەم هێڵە سەرەکییانە، ئەم ئاژانسانەی ڕاگەیاندنی تونسیان مۆر کردووە لە ئەنجوومەنێکی دامەزرێنەردا لە ئیستانبوڵ لە ۲ی تشرینی یەکەمی ۱۹۹۲ کۆ بوونەوە و ئەم پێڕۆیەیان پەسەند کرد. لە ۷ و ۸ی تەمموزی ۱۹۹۳ و لەو ئەنجوومەنە گشتییەی لە دیمەشق سازکرا، کۆمیتەی بەدواداچوون سەرپشک کرا بۆ پێداچوونەوە و دەوڵەمەندکردنی پێڕۆکە بەهاوکاریی تایبەتی MAP. کۆمیتەکەش لە ۷ی نیسانی ۱۹۹٤دا گفتوگۆی لەسەر ڕەشنووسێک کرد. سێیەمین کۆنگرەی گشتیی هاوپەیمانییەکە لە ڕۆما لە ۲٦ و ۲۷ی حوزەیرانی ۱۹۹٤ برگەکانی پێڕۆکەی بەم شێوەیە ڕێک خست:

## بەشی یەکەم: ناساندن و ئامانجەکانی هاوپەیمانییەکە

مادەی ۱: ناساندن

کۆمەڵەیەک بەناوی "هاوپەیمانیی ئاژانسەکانی دەنگوباسی دەریای ناوەڕاست" بەم شێوەیە دامەزرا و ناوی نرا AMAN.

مادەی ۲: ئامانجەکان

ئامانجەکانی ئەم هاوپەیمانییە لە ڕاگەیاندنی تونسدا هاتوون. هاوپەیمانییەکە ناسیاسی دەبێ.

## بەشی دووەم: ئەندامیەتی

مادەی ۳: ئەندامان

۳-۱ ئەندامانی دامەزرێنەر ئەو ئەندامانەن ڕاگەیاندنی تونسیان مۆر کردووە و

ئەمـــانـەن: ئاژانسی ئەنادۆڵ، ئاژانسی فـــرانس پرێس، ئاژانسی زانیـــاریـی مـۆریتـانیـا، ئاژانسی نیـشـتـمـانیی کـۆمـەڵەی سـتـامـپـا ANSA، ئاژانسی ڕۆژنامـەوانیی جـەزائیر، ئاژانسی EFE، ئاژانسی دەنگوباسی ئەلجـەماهیـرییە، ئاژانسی مـەغـریب عـەرەبی پرێس، ئاژانسـی ڕۆژهەڵاتی نـاوەڕاست، ئاژانسـی دەنگوباسی عـــارەبیی ســـووریا، ئاژانسـی تونس ئەفـــرک پرێس، ئاژانسـی دەنگوباسی فەلەستین.

٣-٢ ئەو ئاژانسانەی دەریای ناوەڕاست کە لە کۆبوونەوەکەی تونسدا ئامادە نەبوون و بەو پێیە ڕاگەیاندنی تونسیشیان مۆر نەکردووە، بۆ ئەندامیەتی دەبێ داواکاری ئاراستەی کۆنگرەی گشتی بکەن.

٣-٣ ئاژانسی کاندیدکراو پێویستە سەرەتا ئەم مەرجانەی تێدا هەبن:

أ- دەبێ بەفـەرمی ڕاگـەیاندنی تونس و پێـڕۆی هاوپـەیمانیـیـەکـەی لا پەســەند بێ و ئیمزای بکا.

ب- دەبێ دانی پێدا نرابێ وەک ئاژانسی نوێنەری وڵاتی جێی باس.

ج- دەبێ نوێنەرایەتیی وڵاتێکی ناوچەی دەریای ناوەڕاست بکا یاخـۆ هی وڵاتێک کە پێوەندیی بەردەوام و نایابی لەگەڵ ئەستێلّی دەریای ناوەڕاستدا هەبێ.

د- پێـــڕۆی ئەو ئاژانســـــە و چالاکـــیی، نابێ هیـچ ناوەڕکـــێکی ئاینی یان ڕەگەزپەرستانەی تێدا هەبێ.

٣-٤ هاوپەیمانییـەکـە بۆی هەیە ڕێ بەچاودێر بدا. لە کـاتی پەســەنکردنی پێـڕۆدا چاودێران برێتی لە فیدراسیۆنی ئاژانسەکانی دەنگوباسی عارەب و ئینتەر پرێس سێرڤس بوون. دەشتوانرێ بەبڕیاری کۆنگرەی گشتی چاودێری تر دانرێ. ئەم چاودێرانە لە کۆبوونەوەکانی کۆنگرەی گشتیدا بەشدار دەبن بەبێ ئەوەی مافی دەنگدانیان هەبێ و بۆ کۆمیتەی بەدواداچوون هەڵنابژێردرێن.

٣-٥ داوای ئەندامیەتی دەبێ ئاراستەی کۆمیتەی بەدواداچوون بکرێ و ئەویش کار دەکا بۆ ئەوەی بەکۆنگرەی گشتیی داهاتوو بگا.

٣-٦ بڕیاری کـۆنگرەی گـشـتی بۆ وەرگـرتنی ئەندام یان بـۆ دانانی چاودێری نوێ پێویستی بەدەنگی سێ چارەکی ئەندامانی ئامادەبووی کۆنگرەکە هەیە.

مادەی ٤: لەدەستدانی سیفەتی ئەندامیەتی

هەر ئەندامێک بۆی هەیە لە هاوپەیمانییەکە بکشێتەوە، ئەمەش لە ڕێی نووسراوێکەوە دەبێ کە ئاراستەی کۆمیتەی بەدواداچوون دەکرێ. هەروەها کۆنگرەی گشتی بەداوای کۆمیتەی بەدواداچوون، دەتوانی بڕیاری دەرکردن یاخۆ هەڵپەساردنی مافەکانی ئەندامان بدا ئەگەر ئەندامەکە: ئەو مەرجانەی تیادا نەما کە بۆ ئەندامیەتی داواکراون، ئەگەر بەشێوەیەکی زەق و کاریگەر سەرپێچیی پێڕۆی کرد، ئەگەر دانی ئابوونەی ئەندامیەتیی دواخست. بڕیاری لەم جۆرەی کۆنگرەی گشتیش پێویستی بەدەنگی سێ چارەکی ئامادەبوان هەیە.

مادەی ٥: ئابوونەی ئەندامیەتی

٥-١ کۆنگرەی گشتی بۆی هەیە بڕی ئابوونەی ساڵانە بەپێی جۆرەکانی ئەندامان، وەک لە مادەی ٣-١دا ڕوون کراوەتەوە، دیاری بکا.

٥-٢ ئەگەر کۆنگرەی گشتی پەسەندی کرد، هاوپەیمانییەکە دەتوانی بەخشین لە ئاژانسەکانی ئەندام یاخۆ لە ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان وەرگرێ.

٥-٣ ئابوونەی ئەندامیەتی و بەخشینەکان لە وڵاتی سکرتێری گشتی لە بانکدا بەناوی هاوپەیمانییەکە حیسابی بۆ دەکرێتەوە و بەپارەیەکی باوەڕ پێکراو.

**بەشی سێیەم: پێکهاتەی هاوپەیمانییەکە**

مادەی ٦: پێکهاتە

پێکهاتەی هاوپەیمانییەکە بەم شێوەیەیە:

کۆنگرەی گشتی

سەرۆک

دوو جێگری سەرۆک

سکرتێری گشتی

کۆمیتەی بەدواداچوون

مادەی ٧: کۆنگرەی گشتی

٧-١ کۆنگرەی گشتی لە گشت ئەندامانی هاوپەیمانییەکە پێک دێ، ئەم کۆنگرەیە بالاترین دەسەلاتی بڕیاردان و دیاریکردنی ئەرکەکانە.

٧-٢ هاوپەیمانییەکە لایەنی کەم سالّی جارێک کۆنگرەی گشتیی ئاسایی ساز دەکا، هەر جارە و لە بەرێکی دەریای سپی، جارێک لە بەری باکور و جاری دوای ئەوە لە بەری باشوور. بەگوێرەی ئەم ڕێشاندەرە، دانیشتنی هەر سالێک لە ولاتی ئەو ئاژانسە ئەندامە دەبێ کە خۆبەخشانە و بەپەسەندکردنی کۆنگرەی گشتی میوانداریی کۆبوونەوەکە دەکا.

٧-٣ دەشێ کۆنگرەی گشتی لەسەر داوای سەرۆک یان بەلایەنی کەمەوە سێ ئاژانسی ئەندام بۆ کۆبوونەوەی نائاسایی کۆبێتەوە.

٧-٤ بانگهێشتن بۆ هەردوو کۆبوونەوەی ئاسایی و نائاسایی لە لایەن سەرۆکەوە دەکرێ و خۆشی سەرۆکایەتییان دەکا، ئەگەر سەرۆک نەیتوانی یاخۆ ڕێی نەبوو ئەوە یەکێ لە جێگرەکانی کاری ئەو دەکا و بەئامادەبوونی دوو سێیەکی ئاژانسە ئەندامەکان بەلای کەمەوە.

٧-٥ هەر ئەندامێک، دامەزرێن بێ یان ئاسایی، تەنیا یەک دەنگی هەیە.

٧-٦ دانیشتنەکانی کۆنگرەی گشتی کراوەن. ئەگەر زۆرینەی ئامادەبووان قایل بوون دەکرێ بەکامیراوە کۆ ببنەوە و دەشکرێ بەبێ ئامادەبوونی چاودێران بێ.

مادەی ٨: کۆبوونەوەی ئاساییی کۆنگرەی گشتی

٨-١ کۆبوونەوەی ئاساییی کۆنگرەی گشتی:

سەرۆکی هاوپەیمانی و هەردوو جێگرەکەی دەستنیشان دەکا و سکرتێری گشتی هەلدەبژێرێ،

بڕیاری وەرگرتن و دەرکردن و هەلپەساردنی ئەندامان دەدا،

بودجەی سالانە پەسەند دەکا،

ئەو ڕاپۆرتانەی لە لایەن کۆمیتەی بەدواداچوونەوە پێشکێشی دەکرێن هەلدەسەنگێنێ، هەروەها هەر کارێکی تریش دەکا کە بەپێویستی بزانێ،

ئەگەر پێویست بوو، کۆمیتەیەکی تایبەت دادەمەزرێنێ بۆ بەدواداچوونی ئەو کێشانەی لەسەر لێکدانەوە یان جێبەجێکردنی پێڕۆدا هەن.

٨-٢ بڕیارەکانی کۆنگرەی گشتی لە کۆبوونەوەی ئاساییدا بەزۆرینەی دەنگی ئەندامانی ئامادەبوو دەبن.

٨-٣ لەگەڵ ئەوەشدا بڕیاری کۆنگرەی گشتی لەمەڕ:

دەستنیشانکردنی سەرۆک و جێگرەکانی سەرۆک و هەڵبژاردنی سکرتێری گشتی دەبێ بەزۆرینەی دوو سێیەکی ئەندامانی ئامادەبوو بێ.

لە کاتێکدا کە:

وەرگرتنی ئەندامی نوێ لە هاوپەیمانییەکەدا پێویستی بەزۆرینە سێ چارەک ئامەبووان هەیە.

مادەی ٩: دانیشتنی نائاساییی کۆنگرەی گشتی

٩-١ لە دانیشتنە نائاساییەکانیدا، کۆنگرەی گشتی بڕیار دەدا لەسەر:

- هەموارکردنی پێڕۆ.
- هەڵوەشاندنەوە کۆمەڵەکە.
- هەر پرسێکی تر کە ناکەوێتە ناو بازنەی کارەکانی کۆنگرەی گشتیی ئاساییەوە.

٩-٢ بڕیارەکانی کۆنگرەی گشتی لە دانیشتنی نائاساییدا بەزۆرینەی سێ چارەکی ئامادەبووان دەبن.

مادەی ١٠: سەرۆک و دوو جێگرەکەی سەرۆک

١٠-١ دەبێ سەرۆک بۆ ماوەی یەک ساڵ دەستنیشان بکرێ. ئەو پێویستە بەڕێوەبەری کارگێریی ئەو ئاژانسە ئەندامە بێ کە میوانداریی ئەو کۆنگرە گشتییە دەکا. تا کردنەوەی کۆنگرەی گشتیی ئاساییی داهاتوو لەو پۆستەیدا دەمێنێ.

١٠-٢ سەرۆک نوێنەرایەتیی هاوپەیمانییەکە دەکا و بانگهێشتن بۆ کۆبوونەوەکانی کۆنگرەی گشتی و کۆمیتەی بەدواداچوون دەکا و سەرۆکایەتیشیان دەکا.

هەروەها دەسەڵاتی تریشی هەیە کە لە لای کۆنگرەی گشتییە.

١٠-٣ دوو جێگری سەرۆکەکە بۆ ماوەی یەک ساڵ دەسنیشان دەکرێن. ئەمان دەبێ بەڕێوەبەری کارگێڕیی ئەو دوو ئاژانسە ئەندامە بن کە: (١) جاری پێشتر سەرۆک بووە (جێگری یەکەمی سەرۆک) و (٢) ئەوەی پێشنیازی میوانداریکردنی کۆبوونەوەی داهاتووی کۆنگرەی گشتیی کردووە (جێگری دووەمی سەرۆک).

١٠-٤ سەرۆک و هەردوو جێگری سەرۆک بۆیان هەیە دەسەڵاتەکانی خۆیان ببەخشن بەنوێنەرێکی هەمان ئاژانسی خۆیان.

مادەی ١١: کۆمیتەی بەدواداچوون

١١-١ کۆمیتەی بەدواداچوون دەستەی کارگێڕیی هاوپەیمانییەکەیە. ئەم کۆمیتەیە بەرپرسە لە بەڕێوەبردنی چالاکییە کارگێڕییەکانی هاوپەیمانییەکە.

١١-٢ کۆمیتەی بەدواداچوون لە سەرۆک و دوو جێگری سەرۆک و سکرتێری گشتی پێک دێ.

١١-٣ ئەرکەکانی کۆمیتەی بەدواداچوون برێتین لە:

جێبەجێکردنی بڕیارەکانی کۆنگرەی گشتی،

دیاری کردنی مێژوو و شوێنی کۆبوونەوەکانی کۆنگرەی گشتی بەهاوکاریی ئاژانسی خانەخوێ،

داڕشتنی ڕەشنووسی کارنامەی کۆبوونەوەکە و ناردنی بۆ ئەندامان پێش کۆبوونەوەی کۆنگرەی گشتی بەسێ هەفتە بەلای کەمەوە،

ئامادەکردنی ڕاپۆرتەکانی چالاکیی هاوپەیمانییەکە بۆ ئەوەی لە لایەن سەرۆکەوە پێشکێشی کۆنگرەی گشتی بکرێن،

پێشکێشکردنی داواکانی بەئەندامبوون و کشانەوەی ئەندامان لە هاوپەیمانییەکە بەکۆنگرەی گشتی.

١١-٤ بڕیارەکانی کۆمیتەی بەدواداچوون دەبێ بەزۆرینەی سادەی ئەندامانی ئامادەبوو بن. لە کاتی تەنگژەشدا دەنگی سەرۆک یەکلاکەرەوەیە.

١١-٥ ئەگەر لە نێوان دوو کۆنگرەدا یەکێ لە ئەندامانی کۆمیتەی بەدواداچوون

دەستی لە کار کێشایەوە، جێی ئەو ئەندامە بەم شێوەیەی خوارەوە پڕ دەکرێتەوە:

ئەگەر بۆشاییەکە پۆستی سەرۆک بوو، جێگری یەکەمی سەرۆک پڕی دەکاتەوە.

ئەگەر بۆشاییەکە پۆستی جێگری یەکەمی سەرۆک بوو، ئەو پۆستە تا کۆنگرەی گشتیی داهاتوو بەچۆڵی دەمێنێ.

ئەگەر بۆشاییەکە پۆستی جێگری دووەمی سەرۆک بوو کە میوانداریی کۆنگرەی گشتیی داهاتوو دەکا، کۆمیتەی بەدواداچوون دەسەڵاتی هەیە لە ڕێی هەڵبژاردنی بەڕێوەبەری کارگێڕیی هەر ئاژانسێک کە ئامادە بێ میوانداریی کۆنگرەی گشتی بکا، ئەو پۆستە پڕ بکاتەوە.

١١-٦ کۆمیتەی بەدواداچوون لە لایەن سەرۆکەوە بانگهێشتن و سەرۆکایەتی دەکرێ و ئەگەر ئەو نەبوو جێگری یەکەمی سەرۆک ئەم کارانە دەکا و پێویستە کۆمیتەکە بەلایەنی کەمەوە دوو مانگ پێش کۆنگرەی گشتی کۆ بێتەوە بۆ ئامادەکردنی پێشوەختی کارنامە و دابەشکردنی بەسەر ئاژانسە ئەندامەکاندا پێش کۆنگرەی گشتی بەسێ هەفتە بەلای کەمەوە.

١١-٧ ئەگەر بەپێویست زانرا، دەکرێ کۆمیتەی بەدواداچوون کۆبوونەوەیەکی نائاسایی ئەنجام بدا.

١١-٨ ژمارەی یاسایی بۆ بەڕێوەبردنی کار لە کۆمیتەی بەدواداچووندا سێیە.

مادەی ١٢: سکرتێری گشتی

١٢-١ دەبێ سکرتێری گشتی بۆ ماوەی سێ ساڵ هەلبژێردرێ و دەکرێ هەڵبژێررێتەوە.

١٢-٢ داواکان بۆ پۆستی سکرتێری گشتی دەبێ ئاراستەی کۆمیتەی بەدواداچوون بکرێن پێش ئەوەی بچنە کۆنگرەی گشتی.

١٢-٣ بەرپرسیارییەکانی سکرتێری گشتی ئەمانەن:

- مسۆگەرکردنی بەردەوامیی کارە کارگێڕییەکان لە نێوان کۆنگرە گشتییەکاندا،
- مسۆگەرکردنی هاوئاهەنگی لە نێوان ئەندامەکاندا،
- ئامادەکردنی بەڵگەنامەی پێویست بۆ ئەو بڕیارانەی نیاز هەیە لە دانیشتنە ئاسایی و نائاساییەکانی کۆنگرەی گشتیدا بدرێن،

- مسۆگەرکردنی هاوئاهەنگی لەگەڵ دامەزراوەکانی تری هاوشێوەدا،
- پاراستنی پارەی هاوپەیمانییەکە بەڕەزامەندیی نووسراوی سەرۆک و سەرپەرشتیی جێبەجێکردنی بودجە لە سنووری ئەو سەرپشککردنەی لە لایەن کۆنگرەی گشتییەوە کراوە،
- پێشکێشکردنی بودجەی ساڵانە بەکۆنگرەی گشتی.

## بەشی چوارەم: بابەتگەلی گشتی

مادەی ١٣: نوێنەرایەتی

١٣-١ هەر ئاژانسێکی ئەندام لە لایەن بەڕێوەبەری گشتییەوە لە هاوپەیمانییەکەدا نوێنەرایەتی دەکرێ. ئەگەر ئەو نەیتوانی ئامادە بێ، بۆی هەیە دەسەڵاتی خۆی بەنوێنەرێکی ئاژانسەکەی بدا.

١٣-٢ لە کۆبوونەوەکانی کۆنگرەی گشتی و کۆمیتەی بەدواداچووندا، هەر بەڕێوەبەرێکی گشتی دەتوانێ یەک ئەندامی تری ئاژانسەکەی لەگەڵ خۆیدا بهێنێ بەبێ ئەوەی مافی دەنگدانی هەبێ. واتە هەر ئاژانسێک بۆی هەیە تەنیا دوو کەس بەشدار بکا لەو کۆبوونەوانەدا نەک زیاتر.

مادەی ١٤: زمانەکان

١٤-١ ئەو زمانانەی لە هاوپەیمانییەکەدا بەکار دێن بریتین لە عارەبی و ئینگلیزی و فرەنسی. زمانی نووسراوەکانی هاوپەیمانیش ئینگلیزییە.

١٤-٢ پێڕۆکە بەزمانەکانی عارەبی و ئینگلیزی و فرەنسی داڕێژراوە. ئەگەر هەر کاتێ کێشە لەسەر وەرگێڕانەکە هەبوو دەقە ئینگلیزییەکە دەکرێتە پێوانە.

مادەی ١٥: ناکۆکی لەسەر پێڕۆ

ئەگەر ناکۆکی لەسەر لێکدانەوەی پێڕۆدا هەبوو، لە کاتی کۆبوونەوەی کۆنگرەی گشتیدا، چ ئاسایی بێ یان نائاسایی، لیژنەیەک پێک دەهێنرێ لە سێ نوێنەر لە نێو ئەندامانداندا هەڵدەبژێردرێن بەمەبەستی دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەک. ئەو لیژنەیە پێویستە لە ماوەی دوو مانگدا ئەندامان لە بڕیاری خۆی ئاگەدار بکاتەوە. بڕیاری لیژنەکەش لە کۆبوونەوەی داهاتووی کۆنگرەی گشتیدا گفتوگۆی لەسەر دەکرێ.

مادەی ١٦: هەموارکردنی پێڕۆ

تەنیا کۆنگرەی گشتی دەتوانی پێڕۆ هەموار بکا، ئەویش لە کۆبوونەوەیەکی نائاساییدا و بەبڕیاری زۆرینەی سێ چارەکی ئەندامانی ئامادەبوو و بەپێی هەردوو مادەی ٧-٣ و ٩.

مادەی ١٧: هەڵوەشاندنەوە

تەنیا کۆنگرەی گشتی دەتوانێ هاوپەیمانییەکە هەڵوەشێنێتەوە، ئەویش لە کۆبوونەوەیەکی نائاساییدا و بەبڕیاری زۆرینەی سێ چارەکی ئەندامانی ئامادەبوو و بەپێی هەردوو مادەی ٧-٣ و ٩.

مادەی ١٨: ئەدرێسی فەرمیی هاوپەیمانییەکە

ئەدرێسی فەرمیی هاوپەیمانییەکە، ئەدرێسی سکرتێری گشتی دەبێ.

مادەی ١٩: یاسای گونجاو

لەو پرسانەدا کە بەئاشکرا لەم یاسایەدا باس نەکراون، یاسای فرانسەیان بەسەردا جێبەجێ دەکرێ.

مادەی ٢٠: جێبەجێکردن

ئەم پێرۆیە یەکسەر لەگەڵ مۆرکردنی لە لایەن ئاژانسەکانی ئەندامەوە دەچێتە واری جێبەجێکردنەوە.

ئەندامانی AMAN: ئاژانسی ئەنادۆڵ- تورکیا، ئاژانسی فرانس پرێس، ئاژانسی زانیاریی مۆریتانیا، ئاژانسی دەنگوباسی ئەتینا- یۆنان، ئاژانسی نیشتمانیی ستامپا ئەسۆسیاتا- ئیتالیا، ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی جەزائیر، ئاژانسی تێلیگرافی ئەلبانیا، ئاژانسی دەنگوباسی قوبرس، ئاژانسی EFE- ئیسپانیا، ئاژانسی دەنگوباسی کرواتیا، ئاژانسی دەنگوباسی ئەلجەماهیریە- لیبیا، ئاژانسی دەنگوباسی پۆرتۆگال، مەغریب عەرەبی پرێس- مەراکش، ئاژانسی دەنگوباسی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست- میسر، ئاژانسی دەنگوباسی نیشتمانی- لبنان، ئاژانسی دەنگوباسی عارەبیی سووریا، ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی سلۆڤین، ناوەندی نێودەوڵەتیی

ڕۆژنامەوانی- سربیا-مۆنتنیگرۆ، ئاژانسی تونسی ئەفریقا، ئاژانسی دەنگوباسی فەلەستین.

فیدراسیۆنی ئاژانسەکانی دەنگوباسی عارەب FANA

ئێستا فیدراسیۆنی ئاژانسەکانی دەنگوباسی عارەب لە ١٨ ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسی وڵاتانی عارەب پێک دێ و ئامانجەکەی پتەوکردنی پێوەندییە پیشەییەکانی نێوان ئەو ئاژانسانە و بڵاوکردنەوەی فرەوانتری هەواڵە لە نێو وڵاتانی عارەب و بڵاوکرکردنەوەی دەنگوباسی عارەبە لە جیهاندا.

بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجەش، فیدراسیۆنەکە هەوڵ دەدا بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی پیشەیی ئاژانسە ئەندامەکان لە ڕێی دابینکردنی ڕاوێژ و هاندانیان بۆ ئاڵوگۆڕی شارەزایی و ئەنجامدانی گردبوونەوەی وەرزی بۆ بەڕێوەبەرانی ئەو ئاژانسانە، یان ڕێکخستنی کۆبوونەوەگەلی تایبەتمەند، هەروەها کار دەکا بۆ پێشخستنی هاوئاهەنگی لە بواری زانیاری و تێکنۆلۆجیا لە نێو ئەندامان و ئاژانسگەلی نیشتمانی تر لە هەموو جیهاندا.

لە ساڵی ١٩٦٤وە هەوڵ دراوە بۆ دروستکردنی فیدراسیۆنی ئاژانسەکانی عارەبی دەنگوباس و یەکەمین کۆبوونەوە بۆ ئەم مەبەستە لە ١٩٦٥ لە عەممان- ئوردون کرا. لە کانوونی دووەمی ١٩٧٤دا کۆمەڵەی وڵاتانی عارەب بانگهێشتنی بەڕێوەبەرانی ئاژانسەکانی دەنگوباسی عارەبی کرد بۆ کۆبوونەوەیەک کرد لە بارەگای خۆی لە قاهیرە، بەمەبەستی دووبارە کۆڵینەوە لە بابەتی دروستکردنی فیدراسیۆنەکە. لەو کۆبوونەوەیەدا ڕێککەوتنێک هەبوو لەسەر ئەنجامدانی کۆبوونەوەیەکی دووەم لە نیسانی ١٩٧٤ لە بەغدا و لەوێ بڕیار دران بۆ دامەزراندنی ڕاستەقینەی فیدراسیۆنەکە.

لە تشرینی دووەمی ١٩٧٤، سێیەمین کۆبوونەوەی FANA لە بەیرووت کرا و لەو کۆبوونەوەیەدا یەکەمین ئەندامانی سکرتارییەتی گشتی و سکرتێری گشتی هەڵبژێردران. فیدراسیۆنەکە بەفەرمی لە نووسینگەی سەرەکیی خۆی لە بەیرووت لە سەرەتای ١٩٧٥وە دەستی بەچالاکییەکانی کرد.

ئەندامانی دامەزرێنەری FANA ئەو ئاژانسانەن کە ئەو کاتە لە وڵاتانی عارەبدا هەبوون و هەموویان ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباس بوون لە وڵاتانی ئوردون، تونس، جەزائیر، سعوودیە، عێراق، فەلەستین، لبنان، لیبیا، مەراکش، یەمەن، میسر و سوودان. (ئاژانسی نیشتمانیی کوەیت لەو ساڵەدا لە قۆناخی دامەزراندندا بوو).
FANA لە چوارچێوەی کۆمەڵەی وڵاتانی عارەبدا دامەزرا، وەک چۆن لە مادەی یەکەمی پێڕۆکەیدا هاتووە. دەبێ ئەنجوومەنی کۆمەڵەی عارەب مادەکانی پێڕۆکە پەسەند بکا پێش ئەوەی بچێتە قۆناخی جێبەجێکردنەوە.

فیدراسیۆنەکە ئەنجوومەنێکی باڵای هەیە بەناوی کۆنگرەی گشتییەوە ساڵانە (لە کاتی ئاساییدا لە مانگی تشرینی دووەمدا) یەک جار کۆ دەبێتەوە و بەڕیوەبەرانی گشتیی ئاژانسەکانی ئەندام تیایدا ئامادە دەبن، هەروەها سکرتارییەتی گشتیی هەیە کە ساڵی دوو جار کۆ دەبێتەوە بۆ گفتوگۆ لەسەر چالاکییەکانی فیدراسیۆنەکە. سکرتارییەتی گشتی حەفت ئەندامی هەیە کە لە لایەن کۆنگرەی گشتییەوە بۆ ماوەی دوو ساڵ هەڵدەبژێردرێن لە کاتێکدا سکرتێری گشتی بۆ پێنج ساڵ هەڵدەبژێردرێ و دەبێ کەسێکی خاوەن شارەزایی زۆر و پسپۆڕ بێ لە بواری کاری ئاژانسەکانی دەنگوباس و ڕۆژنامەوانیدا.

فیدراسیۆنەکە توانیویەتی ڕای یەکگرتوو لە نێوان ئاژانسە عارەبەکانی دەنگوباسدا لە بارەی بابەتە پیشەییەکاندا دروست بکا. کۆنگرە ساڵانانە و کۆبوونەوە تایبەتمەندەکانی بوونە هۆکاری پێشکەوتنی هاوکاریی نێوان ئەو ئاژانسانە و بوونە هاوکاری ئاژانسە تازەپەیدابووەکانی عارەب لە ڕێی پێشکێشکردنی هاوکاریی دارایی و یارمەتیی تەکنیکی و گۆڕینەوەی شارەزایی و سەردانی فەرمی و تەکنیکیی نێوان ئاژانسەکانی ئەندامەوە. فیدراسیۆنەکە دوو سیمیناری سازدا، یەکەمیان لە شوباتی ١٩٧٥ لە تونس و دووەم لە ئاداری ١٩٧٧ لە تەرابلوس (لیبیا) تیایاندا ئاژانسە بەشداربووەکانی عارەب و ئەفریقایی گفتوگۆیان لەسەر ڕێوشوێنی هاوئاهەنگیی نێوانیان و لەو ئامرازانەیان کۆڵییەوە کە باشترین ئاڵوگۆڕی هەواڵ لە نێوانیاندا مسۆگەر دەکا. ئەم کۆبوونەوانە دوای پێکهێنانی ئاژانسی دەنگوباسی پان ئەفریقا PANA بەردەوامییان نەبوو.

هەروەها فیدراسیۆنەکە سێ سیمیناری تری ڕێک خست لە (نیسانی ١٩٨٠ لە سووریا، نیسانی ١٩٨١ لە مەکسیک، حوزەیرانی ١٩٨٢ لە مەراکش). بەشداربووانی ئەم سیمینارانە کە ئاژانسەکانی نیشتمانیی ولاّتانی عارەب و ولاّتانی ئەمەریکای لاتین بوون ڕێک کەوتن لەسەر ئەو بنەما کرداریيانە و ئاسانکاریيانەی دەبنە هۆی ئاڵوگۆڕکردنی هەواڵ بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە نێوان خۆیاندا. بەلاّم ئەم سیمینارانەش پچڕان دوای ئەوەی هیچ ئاژانسێکی ئەمەریکای لاتین ئامادەیی بۆ میوانداریی سیمیناری داهاتوو لە ولاّتی خۆیدا نیشان نەدا.

جگە لەمانەش، فیدراسیۆنەکە پێنج کۆبوونەوەی لە نێوان ساڵانی ١٩٧٦ تا ١٩٨٩ سازکرد بۆ گفتوگۆ لە نێوان ئاژانسەکانی عارەب و ئەوروپاییدا لە (تونس، ئیستانبووڵ، لەندەن، پراگ، تونس). ئەم زنجیرە کۆبوونەوانەش پچڕان دوای هەڵوەشانەوەی یەکەتیی سۆڤێت و ئەو گۆڕانکاریيانەی دوابەدوای ئەو هەڵوەشانەوەیە لە هاوسەنگیی هێز لە جیهاندا دروست بوون و ئاژانسە ئەوروپاییەکان چیی تر ئامادە نەبوون بەشداری لەو جۆرە کۆبوونەوانەدا بکەن. چالاکییەکانی فیدراسیۆنەکە و ئەو کۆبوونەوانەی ڕێکیانی دەخست بوونە مایەی کردنەوەی چەند ناوەندێکی کۆکردنەوەی هەواڵ و بلاّوکردنەوەیان لە نێوان ئاژانسە عارەبەکان لە لایەک و گرووپەکانی تری ئاژانسەکانی دەنگوباس لە لایەکەی ترەوە.

لە ڕاستیدا، سەنتەرێکی عارەب لە ڤیەننا دامەزرا بۆ بلاّوکردنەوەی دەنگوباسی عارەب. لەوێ بەلاّڤۆکێک بەناوی FANA نیوس بەزمانی ئینگلیزی لە لایەن فیدراسیۆنەکەوە دەردەچوو و لە ڕێی بارەگای سەرەکیی ئاژانسی دەنگوباسی کوەیتەوە بەم سەنتەرە دەدرا و نزیکەی چل هەواڵی ڕۆژانەی ولاّتانی عارەبی لەخۆ دەگرت. ئاژانسی دەنگوباسی ئەڵمان dpa بەرپرس بوو لە بلاّوکردنەوەی ئەم بەلاّڤۆکە بەسەر ئاژانسەکانی دەنگوباسی ولاّتانی ئەوروپای ڕۆئاوادا و ئاژانسی دەنگوباسی چیکۆسلۆڤاکیا بەسەر ئەوانەی ئەوروپای ڕۆژهەلاّتدا دابەشی دەکرد. بەداخەوە بلاّوکردنەوەی ئەم بەلاّڤۆکە دوای شەڕی ١٩٩٠ی کەنداو وەستا.

ڕێکخراوی FANA کاری کرد بۆ دامەزراندنێکی سەنتەرێکی تریش بۆ کۆکردنەوە و بلاّوکردنەوەی دەنگوباسی عارەب لە ئەمەریکای لاتیندا، بەلاّم ئەو ئاژانسەی بڕیار

بوو هاوكاریی بكا، ئاژانسی ئینتەر پرێسی رۆما، نەیتوانی ئەركی خۆی لە گەیاندنی هەواڵەكان بەئاژانسەكانی ئەمەریكای لاتین جێبەجێ بكا.

فیدراسیۆنەكە وەک ئەندامێكی چاودێر ئامادەی كۆبوونەوەكانی یونسكۆ دەبێ و بەشداری لە كۆنفرانسە میدیاییەكانی دەكا. هەروەها بەشدار دەبێ لە كۆبوونەوەی كۆمیتەی هەمیشەییی میدیای عارەب و ئەنجوومەنی وەزیرانی ڕاگەیاندنی عارەبیشدا. جگە لە مێزگەڕیش فیدراسیۆنەكە ساڵانە سیمینار و ووركشۆپی ڕاهێنان بۆ كارمەندانی ئاژانسەكانی دەنگوباسی عارەب ڕێک دەخا.

ئەندامانی FANA: ئاژانسی دەنگوباسی ئوردون، ئاژانسی دەنگوباسی ئیمارات، ئاژانسی تونسی ئەفریقا، ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی جەزائیر، ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی سعوودیا، ئاژانسی دەنگوباسی عارەبیی سووریا، ئاژانسی دەنگوباسی فەلەستین، ئاژانسی دەنگوباسی قەتەر، ئاژانسی دەنگوباسی كوەیت، ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباس- لبنان، ئاژانسی دەنگوباسی جەماهیرییە، ئاژانسی دەنگوباسی مەغریبی عارەب، ئاژانسی دەنگوباسی مۆریتانیا، ئاژانسی دەنگوباسی یەمەن، ئاژانسی دەنگوباسی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست- میسر، ئاژانسی دەنگوباسی سوودان، ئاژانسی دەنگوباسی عومان، ئاژانسی دەنگوباسی بەحرەین.

كۆمەڵەی ئاژانسەكانی دەنگوباسی بەلكان ABNA

ئاژانسەكانی دەنگوباسی دەوڵەتەكانی بەلكان، دوای پێشنیازێكی ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی مەكەدۆنیا لە تێسالۆنیكی (لە ٢٦ی حوزەیرانی ١٩٩٥) كۆمەڵەی ئاژانسەكانی دەنگوباسی بەلكانیان پێک هێنا. كۆمەڵەی ABNA وەک ڕێكخراوێكی خۆبەخشی قازانج نەویستی پیشەییی ئاژانسە نیشتمانییەكانی دەنگوباسی بەلكان دامەزرا، بۆ بەهێزكردنی ئاڵوگۆڕی زانیاری لە ناوچەكەدا. بەڵگەنامەی دامەزراندنی كۆمەڵەی ئاژانسەكانی دەنگوباسی بەلكان لە تێسالۆنیكی لە لایەن نوێنەرانی حەفت ئاژانسی دەنگوباسی بەلكانەوە مۆر كرا: ئاژانسی ئەنادۆڵی توركیا، ئاژانسی تێلیگرافی بولگاریا، كۆمەڵەی زانیاریی بەلكان BIP، تانیوگی یۆگۆسلافیا، ئاژانسی رۆمپرێسی رۆمانیا، ئاژانسی دەنگوباسی ئەتینای یۆنان و ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی مەكەدۆنیا. یەكەمین پرۆژەی گەورەی ئەم كۆمەڵەیە "بانكی دەنگوباسی بەلكان" بوو،

کە لە لایەن یەکەتیی ئەورووپاوە پارەدار کرا. پرۆگرامەکە لە تەمووزی ۱۹۹۷ دەستی بەکار کرد بەبەشداریی ئاژانسەکانی دەنگوباسی ئەندام لە ABNA. هەر زۆری پێ نەچوو ئاژانسەکانی تێلیگرافی سلۆڤینیا STA و B-H پرێسی بۆسنیا-هێرزۆگۆڤینا ئارەزووی خۆیان لە بوون بەئەندامی ئەم کۆمەڵەیە دەربڕی.

کۆبوونەوەی تەمووزی ۲۰۰۰ی ABNA کە تانیوگ سەرۆکایەتیی کرد، بەبەشداریی ئەم ئەندامانە بوو: ئاژانسی ئەنادۆڵ (تورکیا)، ANA و MPA (یۆنان)، BTA (بولگاریا)، MIA (مەکەدۆنیا) و رۆمپرێس (رۆمانیا)، میوانەکانیش بریتی بوون لە بەرپرسانی ئاژانسی دەنگوباسی STA سلۆڤینیا، HINA کرواتیا، مۆلدپرێس (مۆلداڤیا)، ئاژانسی دەنگوباسی BETAی بەلگراد، MINA (پۆدگۆریکا) و هەروەها نوێنەرانی FENA و SRNA و ONASA و میدیاپلان لە بۆسنیا-هێرزۆگۆڤینا.

ئاژانسی رۆژنامەوانیی مەکەدۆنیا هاوکات لەگەڵ کۆمەڵەی ئاژانسەکانی دەنگوباسی بەلکاندا کار دەکا بۆ دامەزراندنی بانکی زانیاریی بەلکان. بارەگای ئەم بانکی زانیارییە لە ناو بارەگاکانی ئاژانسی مەکەدۆنیادا دەبێ بەڵام نووسینگەکانی هەواڵنێران لە گشت پایەتەختەکانی وڵاتانی بەلکان و شارەکانیان دەبن کە بارەگای ئەو ئاژانسانەیان لێیە کە هاوبەشن لەم پرۆژەیەدا. ئەو نووسینگانە لە رێی لینکێکی ئینتەرنێتەوە زانیاری و بابەتی هەواڵ بەم بانکە دەدەن و لێی وەردەگرن: ئەو هەواڵ و زانیاریانەی لە ۲٤ ساتی رۆژدا لە بانکی زانیاریی بەلکان و ئەو سیستەمی ئاڵوگۆڕی هەواڵەی بانکەکە دەگەنە گشت هۆکارەکانی راگەیاندنی ئەو وڵاتانەی نووسینگەکانی ئەم بانکەیان لێ دەبن.

لەو کۆبوونەوەیەی ABNA کە لە تێسالۆنیکی (لە ۲۳ی حوزەیرانی ۲۰۰۳) کرا بەشداربووان بریتی بوون لە ئاژانسەکانی نیشتمانیی دەنگوباسی تورکیا و یۆنان و رۆمانیا و بولگاریا و مەکەدۆنیا و سربیا و مۆنتنیگرۆ و ئەلبانیا. لەو کۆبوونەوەیە باسی بەشداربوونی ئاژانسگەلی کەرتی تایبەت وەک چاودێر لە ABNA کرا. بڕیاریش درا وێبسایتێک بۆ ABNA دروست بکرێ و خەڵاتێکی رۆژنامەوانی دابهێنرێ و پرۆگرامی ئاڵوگۆڕ بۆ ئەو رۆژنامەوانانەی لە ئاژانسەکانی ناوچەیدا کار دەکەن جێبەجێ بکرێ.

لە یادی دە ساڵەی دامەزراندنی ABNA لە کانوونی یەکەمی ۲۰۰٤، ئەندامەکانی

برێتی بوون لە ANA و MPA یۆنان، ATA ئەلبانیا، ئەنادۆڵی تورکیا، BTA بولگاریا، رۆمپرێسی رۆمانیا، تانیوگی سربیا-مۆنتنیگرۆ، MIA فایرۆم، SRNA بۆسنیا-هێرزۆگۆڤینا. ئاژانسەکانی STA سلۆڤینیا و FENA بۆسنیا هێرزۆگۆڤینا و مۆلدپرێسی مۆڵداڤیا وەک چاودێر ئامادەی کۆبوونەوەکە بوون. بەڕێوەبەری گشتیی MPA و سکرتێری گشتیی ABNA بەڕێز سپیرۆس کۆزینۆپۆلۆس وتی لە ماوەی دە ساڵی تەمەنیدا ڕێکخراوی ABNA توانیویەتی سەرباری ئەو سەختییانەی ڕووبەڕووی بوونەتەوە بمێنێ. وتیشی ABNA کار دەکا بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجانەی لە سەرەتاوە بۆ خۆی داناوە و یەکەمینیان سڕینەوەی ئەو سنوورانەی بۆ زانیاری دانراون و کارکردن لە دژی ناسیۆنالیزم و ترس لە بێگانە و ڕەگەزپەرستی.

کۆنگرەی گشتیی ABNA لە کۆبوونەوەی ٣ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٤ لە تێسالۆنیکی بڕیاری دا دەروازەیەک لە ئینتەرنێتدا بۆ ABNA دروست بکا بۆ پێشاندانی هەموو ئاژانسەکانی دەنگوباس لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا و داهێنانی خەڵاتی ساڵانە بۆ ئەو ڕۆژنامەوانانەی بەکارەکانیان هاوکار بوونە لە پێشکەوتنی هاوئاهەنگیی نێو بەلکان و لە ئاشتی و ئارامیی ناوچەکەدا.

ئەنجوومەنی جیهانیی ئاژانسەکانی دەنگوباس

پێکهێنانی کۆمەڵەیەکی جیهانی بۆ ئاژانسەکانی دەنگوباس، لە کۆبوونەوەیەکی نوێنەرانی ٥٨ ئاژانسی دەنگوباس لە ئیستانبووڵ لە نیسانی ٢٠٠٣ پێشنیاز کرا. ڕاگەیاندنی کۆتایی ئەو لووتکە سێ ڕۆژییەی ئاژانسەکانی دەنگوباسی جیهان پەیمانی هاوکاریی دا لە پێناو ئاشتیی جیهانی و لەیەک گەیشتن و مسۆگەرکردنی ڕاستگۆیی لە هەواڵەکاندا کار بکا و ئاماژەشی بۆ گرینگیی هەواڵی دادوەر و بابەتی کرد.

ڕاگەیاندنەکە وتی "ڕۆژنامەوانیی بێلایەن و سەربەخۆ هەنگاوی یەکەمە بەرەو ئاشتی و دیموکراسی".

هەروەها لووتکەکە بڕیاری دا کە نابێ ئاژانسەکانی دەنگوباس ڕێگیرییان لێ بکرێ لە بەجێهێنانی ئەرکی گواستنەوەی هەواڵ لە کاتی ئاشتیدا و زیاتریش لە کاتی شەڕدا کە خەڵک پێویستیان بەهەواڵی بابەتی و ڕاست هەیە. "دەبێ هەموو

هەواڵە پێویستەکان وەگەڕ بخرێن بۆ مسۆگەرکردنی سەلامەتیی ئەو ڕۆژنامەوانانەی هەواڵ وەردەگرن و دەیگوێزنەوە لە هەموو بارێک و هەموو شوێنێکدا".

نزیکەی ١٢٠ بەشدار لە ئاژانسەکانی ئەندام لە کۆمەڵەی ئاژانسەکانی دەنگوباسی بەلکان ABNA و هاوپەیمانیی ئاژانسەکانی دەنگوباسی دەریای ناوەڕاست AMAN و هاوپەیمانیی ئەوروپای ئاژانسەکانی دەنگوباس EANA و ڕێکخراوی ئاژانسەکانی دەنگوباسی ئاسیا-پاسیفیک OANA لەو لووتکەیەدا بەشدار بوون کە ئاژانسی ئەنادۆڵی تورکیا میوانداریی کرد. ئیتار-تاسی ڕووسیا پێشنیازی کرد کۆنگرەی ئاژانسەکانی دەنگوباسی جیهان لە مۆسکۆ لە ئەیلوولی ساڵی داهاتوودا ساز بکرێ.

یەکەمین کۆنگرەی ئاژانسەکانی دەنگوباس لە ٢٤ و ٢٥ی ئەیلوولی ٢٠٠٤ لە مۆسکۆ بڕیاری دا ڕێکخراوی خۆی- ئەنجوومەنی جیهانیی ئاژانسەکانی دەنگوباس دروست بکا.

ڤیتالی ئیگناتینکۆ بەڕێوەبەری گشتیی ئیتار-تاسی خانەخوێی کۆنگرەکە وتی "بێگومان ئەمە ئەنجوومەنێکی گشتی دەبێ. ئاشکرایە کە سەرانی کۆمەڵەکان و نوێنەرانی ئەو ئاژانسانەی ئەوان دەستنیشانیان دەکەن کۆ دەکاتەوە بۆ ئەوەی کارە پراکتیکەکە ئەنجام بدەن".

ئوفە سۆرنسن، بەڕێوەبەری کارگێڕیی ئاژانسی دەنگوباسی دانیمارک ریتزۆز بیرۆ و سەرۆکی پێشووی هاوپەیمانیی ئەوروپای ئاژانسەکانی دەنگوباس بانگهێشتن کرا بۆ ئەوەی سەرۆکایەتیی سکرتاریەتی ئەنجوومەنی جیهانیی ئاژانسەکانی دەنگوباس بکا.

ئەنجوومەنی نێودەوڵەتیی گەیاندنی ڕۆژنامەوانی IPTC

ئەنجوومەنی نێودەوڵەتیی گەیاندنی ڕۆژنامەوانی IPTC لە ١٩٦٥ دامەزرا بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی هۆکارەکانی گەیاندنی ڕۆژنامەوانی لە جیهاندا. بەڵام لەگەڵ پێشکەوتنی کاتدا ڕووی کردە پێویستیی نوێتری تێکنۆلۆجیایی.

ئەم ئەنجوومەنە بریتییە لە یەکیەتیەک کە ئەندامەکانی گەورە ئاژانسەکانی دەنگوباسی جیهان و بڵاوکەرەوەکانی هەواڵ و فرۆشیارانی سیستمی پیشەسازیی

هەواڵ و وڵاتە پیشەسازییە گەورەکانی جیهانن. سەرچاوەی داهاتی IPTC بریتییە لە ئابوونەی ئەندامیەتی. بارەگای سەرەکیی IPTC لە بریتانیایە، بەڵام چالاکییەکانی هەموو جیهان دەگرنەوە. IPTC لە کارەکەیدا جەخت لەسەر لایەنی بازرگانیی پیشەسازیی هەواڵ دەکا. ستانداری تەکنیکی دادەڕێژێ و پیادە دەکا بۆ بەهێزکردنی ئاڵوگۆڕی ئازادانەی هەواڵ کە هەموو گەورە بەرهەمهێنێکی هەواڵ لە جیهاندا پیادەیان دەکا. ستاندارەکانی IPTC بەبێ بەرامبەر دەست دەکەون.

ئەندامانی IPTC دوو جۆرن:

ئەندامانی کارا: ئاژانسی فرانس پرێس- فرانسە، ANSA - ئیتاڵیا، ئەسۆشیەیتد میدیابەیس لیمتد- بریتانیا، ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی نەمسا، ئینساتی BBC - بریتانیا، بزنس وایەر- ئەمەریکا، کەنەدا نیوس وایەر- کەنەدا، کەنەدیان پرێس- کەنەدا، CCN ماتیۆس- کەنەدا، CINTEC - هۆنگ کۆنگ، dpa - ئەڵمانیا، دیالۆگنیوس ئێدج- ئەمەریکا، داو جۆنز و کۆمپەنی- ئەمەریکا، هاوپەیمانیی ئەوروپای ئاژانسەکانی دەنگوباس، کۆمەڵەی بڵاوکەرەوە و نووسیارانی ڕۆژنامە لە ژاپۆن، کیستۆن _ سویسرا، ئاژانسی کیۆدۆ- ژاپۆن، کۆمەڵەی ڕۆژنامە لە ئەمەریکا، PA نیوس لیمتد- بریتانیا، PR نیوسوایەر- بریتانیا، ڕۆیتەرز لیمتد- بریتانیا، SDA ATS- سویسرا، ئەسۆشیێتد پرێس- ئەمەریکا، کۆمپانیای نیویۆرک تایمز- ئەمەریکا، TT- سوید، TMNEWS - APCOM- ئیتاڵیا، یونایتد پرێس ئینتەرناشناڵ- ئەمەریکا، کۆمەڵەی جیهانیی ڕۆژنامەکان.

ئەندامانی هاوکار: AFX نیوس لیمتد- بریتانیا، ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی بێلگا- بەلجیکا، ئاژانسی EFE- ئیسپانیا، ANP - هۆڵەندا، ئاژانسی دەنگوباسی ئەتینا- یۆنان، ئاژانسی تێلیگرامی AS- نەرویج، ئاتێکس میدیا کۆمماند- ئوسترالیا، CCI ئەوروپا- دانمارک، ئیست کۆ لیمتد- ژاپۆن، ئیدۆس میدیا- ئیتاڵیا، فینگەرپۆست لیمتد- بریتانیا، هاریس و بەیسڤیو- ئەمەریکا، HINA - کرواتیا، IBM - ژاپۆن، IFRA - ئەڵمانیا، ئیتار-تاس- ڕووسیا، لا ریپەبڵیکا- ئیتاڵیا، MTI- هەنگاریا، نیوسلینک- بریتانیا، ئۆی سۆمێن تیتۆتۆیمستۆ- فینلاند، ریلاکسنیوس- فرانسە، ریتزاو بیرۆ- دانمارک، ریڤکۆم- بریتانیا، XML تیم سۆلیوشنز- ئەمەریکا.

# کرۆنۆلۆجیا

١٨٣٢ چارلس لویس هاڤاس ئاژانسێکی وەرگێڕانی ڕۆژنامەی بێگانەی دامەزراند.

١٨٣٥ ئاژانسەکەی هاڤاس بووە ئاژانسی هاڤاس کە بەیەکەمین ئاژانسی نێودەوڵەتیی دەنگوباس دەژمێردرێ.

١٨٤٠ بەبەکارهێنانی کۆتر، هاڤاس نیوەڕۆیان هەواڵەکانی ڕۆژنامەکانی بەیانیی بەلجیکای دەگەیاندە ژوورەکانی هەواڵ لە پاریس و سات سێی دوای نیوەڕۆش هەواڵەکانی ئەو ڕۆژەی ڕۆژنامەکانی بریتانیای دەگەیاندە پاریس.

١٨٤٤ مۆرس تێلیگرافی داهێنا.

١٨٤٥ ئاژانسی هاڤاس بووە یەکەمین بەکارهێنەری هێڵی تێلیگرافی پاریس ـ ریۆن.

١٨٤٨ پاوڵ یۆلیۆس، رۆیتەر (لە ٢١ی تەممووزی ١٨١٦دا بەناوی ئیسرائیل بیر یۆزافات لە کاسل لە ئەڵمانیا لەدایک بوو و لە ١٦ی تشرینی دووەمی ١٨٤٥ لە کڵێسایەکی لەندەندا بوو بەپاوڵ یۆلیۆس رۆیتەر) کە ئەو کاتە هاوپشک بوو لە کتێبفرۆشییەکی بەرلین، دوای ئەوەی چەند نامیلکەیەکی سیاسیی بڵاو کردەوە لە ئەڵمانیا ڕای کرد و لە پاریس وەک وەرگێڕ لە ئاژانسی دەنگوباسی هاڤاس کاری کرد.

١٨٤٨ لە مانگی ئایاردائەسۆشیێتد پرێس وەک کۆمەڵەیەکی دەنگوباسی شاراوە لە نیویۆرک لەدایک بوو.

١٨٤٩ ڤولفشس تێلیگرافشس بیرۆ WTB لەدایک بوو ـ کە یەکەمین ئاژانسی دەنگوباسی ئەڵمانیا بوو و تا ساڵی ١٩٣٣ گرینگترینیان بوو.

١٩٤٩ یۆزێف توڤۆرا لو ڤیەننا دەستی بەئوستریخیشە کۆرێزپۆندێنس کرد.

١٩٤٩ دانیێل کرەیگ یەکەمین نووسینگەی APی لە دەرەوە لە هالیفاکس لە نۆڤا سکۆتیا دامەزراند.

١٨٥٠ پاوڵ یۆلیۆس رۆیتەر کۆتری بەکار هێنا بۆ گواستنەوەی نرخەکانی بازاڕی پشکەکان لە نێوان ئاخن و برۆکسلدا.

١٨٥١ رۆیتەر نووسینگەی لە لەندەن کردەوە (١ رۆیال ئێکسچەینج بیلدینگ، لە ١٠ی تشرینی یەکەمدا)، کە ئەو کات پرسەکانی بازاڕی پشکی لە نێوان لەندەن و پاریسدا دەگواستەوە، بەبەکارهێنانی کێبڵی کالای-دۆڤەر.

١٩٥٣ دامەزراندنی تێلیگرافیک نۆتیزیاریۆ ستیفانی لە ٢٦ی کانوونی دووەمدا لە ئیتاڵیا.

١٨٥٩ یەکەمین هەواڵ لە ئەورووپاوە ڕاستەوخۆ بەکێبڵی نێوان ئۆقیانووسەکاندا هات. کە بۆ AP نێررابوو و لە ٤٢ وشە پێک هاتبوو و کورتکراوەی پێنج هەواڵ بوو بەشێوازی ناونیشان و لە کۆتاییدا دەیگوت: "بەرهەڵستکاری کپ دەکرێتەوە، هەموو هیندستان ئارام دەبێتەوە".

١٨٦٠ یەکەمین ئاژانسی دەنگوباسی سەر بەحکوومەت، ک ک تێلیگرافن کۆرێزپۆندنس بیرۆ، لە لایەن حکوومەتی نەمسا-هەنگاریاوە دامەزرا.

١٨٦٠ یەکەمین ئاژانسی دەنگوباسی هۆڵەندا، دێلمار، دامەزرا.

١٨٦١ ژمارەیەک هەواڵنێری ئەسۆشیێتد پرێس ڕەوانەی شەڕگەکان کران بۆ داپۆشینی هەواڵەکانی شەڕی ناوخۆی ئەمەریکا.

١٨٦٣ رۆیتەرز هێڵی تێلیگرافی لە نێوان وێڵز و ئێرلەندا بنیات نا.

١٨٦٥ کۆمپانیای تێلیگرامی رۆیتەرز بووە کۆمپانیایەکی گشتی.

١٨٦٥ WTB بوو بە کۆمپانیایەکی هاوپشک بەناوی کۆنتینێنتال تێلیگرافن ئەگێنتووە، بۆ ئەوەی سەرمایەی نوێ بەدەست بهێنێ. حکوومەتیش دەستی بەپشتگیریکردنی کرد و وەک دەزگایەکی نیوچە فەرمی سەیر دەکرا.

١٨٦٥ نایل ماریا فابرا یدیز، رۆژنامەوان و پیشەسازی کاتالیایی سەنتەری هەواڵنێرانی لە مەدرید دەست پێ کرد.

١٨٦٦ هنری کۆلنز گەیشتە بۆمبەی بەمەبەستی دەستکردن بەچالاکییەکانی رۆیتەرز لە هیندستاندا.

١٨٦٦ تروبینکۆڤ، بازرگانێکی دەوڵەمەند کە حەزی لە رۆژنامەوانی دەکرد، یەکەمین ئاژانسی دەنگوباسی رووسیاییی دامەزراند بەناوی رووسکۆ تێلیگرافنۆ ئاگێنتستڤۆ RTA.

١٨٦٦ ئاژانسی دەنگوباسی دانیمارک، ریتساو، لە لایەن ئێریک نیکۆلای ریتساوەوە دامەزرا.

١٨٦٧ لە پاریس فابرا لە رێی گەرانەوەی لە ڤیەننا چاوی کەوت بەئۆگۆست هاڤاس و سەنتەری هەواڵنێرانەکەی خۆی کردە ئاژانسی فابرا، کە لقێک بوو لە هاڤاس.

١٨٦٧ ئاژانسی نۆرسک تێلیگرامبیرا NTB وەک خزمەتگوزارییەکی هەواڵی کەرتی تایبەت دامەزرا و خاوەنەکەی رۆژنامە سەرەکییەکانی نەرویج بوون.

١٨٦٧ یەکەمین ئاژانسی دەنگوباس لە سوید، سڤینسکا تێلیگرامبریا، دامەزرا.

١٨٦٨ پرێس ئەسۆشییەیشن PA لە لایەن گرووپێک لە خاوەن رۆژنامە ناوخۆییەکانی بریتانیاوە دامەزرا. رۆیتەرز یەکەمین رێککەوتنی لەگەڵ ئەم ئاژانسەدا بۆ پێشکێشکردنی هەواڵی دەرەوە بوو.

١٨٦٨ ئاژانسی دەنگوباسی تێلیگرافیا کۆنتۆرا لە ریگا دامەزرا.

١٨٦٩ رۆیتەرز هەوڵی دا ڤولف بیرۆ WTB بکرێ، بەڵام بسمارک وای کرد ئەم کارە سەرنەکەوێ. ئاژانسی WTB گواسترایەوە ناو بەشێکی باڵەخانەی ئێستگەی تێلیگرافی فەرمانگەی پۆستە لە بەرلین کە ئەمەش قازانجێک بوو بۆ ئاسانکردنی کارەکە و تا ساڵی ١٨٧٧ لە بارەگای رایشسپۆستدا مایەوە.

١٨٧٠ لە ١٧ی کانوونی دووەمدا رێککەوتنێک لە نێوان هاڤاس و رۆیتەرز و ڤولف مۆر کرا بۆ پێکهێنانی بازنەیەکی جیهانیی هەواڵ (بەکارتلیش دەناسرا). رۆیتەرز خزمەتگوزاریی هاوبەشی هەواڵیشی لەگەڵ پرێس ئەسۆشیەیتدی بریتانیادا هەبوو.

١٨٧٢ رۆیتەرز ئاژانسگەلێکی لە ئاسیای دووردا کردەوە.

١٨٧٢ ئاژانسی دەنگوباسی رووسیا MTA لە لایەن کراجیڤسکییەوە دامەزرا، کە

ڕکابەرێکی تروبنیکۆڤ بوو.

١٨٧٣ ئاژانسی تێلیگرافی سایبیریا لە ئیرکوتسک دامەزرا.

١٨٧٤ ڕۆیتەرز ئاژانسگەلێک لە ئەمەریکای باشووردا دەکاتەوە.

١٨٧٤ فابرا کۆتری بەکار هێنا بۆ گەیاندنی هەواڵی ئەو کەشتییانەی لە تەنگەبەرەکانی گیبرالتار دەرباز دەبن، بۆ ئەم مەبەستەش کۆترخانەی لە ڤالێنسیا و بەرشەلۆنە و پالما دی مالۆرکا دامەزراند.

١٨٧٥ ئەسۆشیێتد پرێس بووە یەکەمین ئاژانسی دەنگوباس کە هێڵێکی تێلیگراف بۆ خۆی بەکرێ بگرێ.

١٨٧٩ ئاژانسی هاڤاس بووە کۆمپانیایەکی گشتیی سنووردار. لە پاڵ هەواڵدا هاڤاس دەستی بەکارکردن لە بواری ڕێکلامدا کرد.

١٨٧٩ کۆمەڵەی ڕۆژنامەوانیی نیو زیلاند NZPA دامەزرا و خاوەنەکانی بریتی بوون لە ٣١ ڕۆژنامەی ڕۆژانە.

١٨٨٠ ماگیار تاڤیاتی ئیدۆرا MTI ئاژانسی دەنگوباسی هەنگاریا، کە مۆڵکی حکوومەت بوو، دامەزرا.

١٨٨٠ کاتکۆف، کە خاوەنی ڕۆژنامەیەک بوو لە مۆسکۆ، ئاژانسی تێلیگرافی پیتەرسبێرگ-مۆسکۆی کردەوە.

١٨٨٢ دامەزراندنی هێڵەکانی هەواڵی داو جۆنز.

١٨٨٢ لە ڕووسیا، هەردوو ئاژانسی ڕوسکۆ تێلیگرافنۆ RTA و مێژدونارۆدنۆ تێلیگرافنۆ - لایەکیان گرت و بوون بەئاژانسی سیڤێرنۆ تێلیگرافنۆ STA.

١٨٨٦ دامەزراندنی ئاژانسی شیمبون یۆتاتسو کایشا، کە یەکەمین ئاژانسی دەنگوباسی ژاپۆنە.

١٨٨٧ لە ١ی تشرینی دووەمدا ئاژانسی تێلیگرامی فینلەندا دەستی بەگواستنەوەی هەواڵ کرد لەو وڵاتەی ئەوساکە دۆکنشینی فینلەندا بوو.

١٨٨٩ ستیفانی لە هاڤاس جیابووەوە (کە خاوەنی نیوەی بوو، بەڵام دوای دەستوەردانی سەرۆک وەزیران فرانسیسکۆ کریپسی خزمەتگوزارییەکانی لە

ڕێی ڕۆیتەرزەوە وەردەگرت).

١٨٨٩ دامەزراندنی یەکەمین ئاژانسی دەنگوباس لە ڕۆمانیا، ئاگێنس دی ڕۆومەین و یەکەمین ئاژانسی دەنگوباس لە بولگاریا، ئاگێنس بالکانیک و یەکەمین ئاژانسی دەنگوباس لە تورکیا، ئاگێنس دی کۆستانتینپۆل.

١٨٩٣ ئەسۆشیێتد پرێس نوێ کرایەوە وەک هاوبەشییەکی نەتەوەیی لە ئەمەریکا بۆ ئەوەی جێی هەموو کۆمەڵە ڕۆژنامەوانییەکانی ناوچە جیاجیاکان بگرێتەوە. ڕۆیتەرزیش پێشنیازی ڕێککەوتنی پاوانداریی لەگەڵدا کرد (کە پێشتر ئەو ڕێککەوتنەی لەگەڵ یونایتد پرێسی نیویۆرک هەبوو، ئەم یونایتد پرێسە ئەوە نییە کە سکریپس دایمەزراند). پێشنیازەکەی یەکسەر لە لایەن ئەسۆشیێتد پرێسەوە پەسەند کرا.

١٨٩٣ یەکەمین نووسینگەی WTB لە کۆلن کرایەوە.

١٨٩٤ ئاژانسی ڕووسیسکۆ تێلیگرافنۆ RTA کەوتەوە کار وەک ئاژانسێکی دەنگوباسی نیمچە فەرمی.

١٨٩٥ کۆمپانیایەکی کەرتی تایبەت، ئاژانسی ستیفانۆپۆلی تێلیگرافیک لە یۆنان دەستی بەکار کرد.

١٨٩٧ یونایتد پرێسی نیویۆرک هەرەسی هێنا.

١٨٩٨ ئاژانسی دەنگوباسی بولگاریا، بولگارسکا تێلیگرافنا BTA، کە ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسی بولگاریایە بەقەرمانی میر فێردیناندی یەکەم دامەزرا.

١٨٩٩ ئەسۆشیێتد پرێس تێلیگرافی بێتەلی گوگلیێلمۆ مارکۆنیی بەکار هێنا بۆ داپۆشینی هەواڵەکانی کێبەرکێی یەختی ساندی هۆک لە نیو جێرسی، ئەمەش یەکەمین تاقیکردنەوەی تێلیگرافی نوێ بوو لە بواری گواستنەوەی هەواڵدا.

١٩٠٠ یەکەمین ئاژانسی دەنگوباسی ئەرجەنتین ANS، لە لایەن کارلۆس ساپۆریتی لە بۆینس ئایرس دامەزرا.

١٩٠٠ ژمارەی ئاژانسەکانی دەنگوباس لە جیهاندا گەیشتە ٢٩ ئاژانس.

١٩٠٠ کۆمەڵە هەرێمییەکانی ئەسۆشیێتد پرێس یەکیان گرت و ئەم ئەسۆشیێتد پرێسە مۆدیرنە وەک کۆمپانیایەکی هاوبەشی قازانج نەویست لە شاری نیویۆرک دروست بوو و مێلڤیل ستۆن یەکەمین بەڕێوەبەری گشتیی بوو.

١٩٠٠ لە ئیتاڵیا ئاژانسی ستیفانی بووە کۆمپانیایەکی هاوپشک و نیوەی هی تیۆدۆرۆ مایەر (نووسیاری پیچۆلۆ) بوو و نیوەکەی تریشی هی گوسیپی ڤۆلدی دی میسوراتای سەرمایەدار بوو.

١٩٠١ ئاژانسی دەنگوباسی دێنتسووی ژاپۆن دامەزرا، کە کاری ڕێکلام و بازرگانیی هەواڵیشی دەکرد.

١٩٠٢ ئاژانسی تۆرگۆڤۆ تێلیگرافنۆ TTA دەستی کرد بەخزمەتکردنی دەوڵەتی ڕووسیا لە ڕووی دارایی و بازرگانییەوە.

١٩٠٣ ڕێککەوتنێک لەگەڵ WTB مۆڵەتی بە AP دا نوێنەری لە نووسینگەی ڤولف لە بەرلین هەبێ بابەتەکان بەپێی بەهاکانیان لای جەماوەری ئەمەریکا ڕێک بخا.

١٩٠٤ ئاژانسی تێلیگرافی سانت پیتەرسبێرگ SPTA یەکەمین ئاژانسی فەرمیی دەنگوباسی ڕووسیا و باوکی ITAR_TASSلە ١ی ئەیلوول دەستی بەکار کرد. ئاژانسی ڕووسیسکۆ تێلیگرافنۆ RTA لە لایەن حکوومەتەوە داخرا لەبەر ئەوەی پشتی بەئاژانسی ڤولفی ئەڵمانیا دەبەست و ئاژانسە نوێکەی حکوومەت TTAی بەکار دەهێنا، بۆ پڕ کردنەوەی شوێنەکەشی ئاژانسی تێلیگرافی سانت پیتەرسبێرگ SPTA دامەزرا.

١٩٠٥ ئاژانسی ستیفانۆپۆلی تێلیگرافیکی یۆنان بووە ئاژانسی دەنگوباسی ئەسینا ANA و حکوومەت بووە یەکێ لە ئابوونەدەرانی.

١٩٠٦ سکریپس، دەسەڵاتی بەسەر پەبلیشەرز پرێسدا کڕی، کە خزمەتگوزارییەکی بچووکی هەواڵ بوو لە ڕۆژهەڵات.

١٩٠٦ سکریپس مەکری پرێس ئەسۆشیەیشن SMPA تەلەفۆنی بۆ گەیاندنی هەواڵ بەکار هێنا، ئەم کارە کینت کووپەر بۆ ئاژانسەکەی کرد.

١٩٠٧ سکریپس ئاژانسی یونایتد پرێسی UP دامەزراند ئەویش بەکۆکردنەوەی سێ خـزمـەتگوزاریی هەرێمـیی هەواڵ، دووانیـان سکریپس مـەکـری پرێس ئەسۆشیەیشن بوون لە ڕۆئاوای ناوەڕاست و سێیەمەکەش سکریپس نیوس ئەسۆشیەیشن بوو لە کەناری پاسیفیک، کە هەرسێکیان لە لایەن ئەوە دامەزرابوون و پەبلیشەر پرێسیشی کڕیبوو.

١٩٠٩ دەسەڵاتداری بواری میدیا ویلیەم ڕاندۆڵف هێرست ئاژانسی ئینتەرناشناڵ نیوس سێرڤسی دامەزراند.

١٩٠٩ یونایتد پرێس دەستی کرد بەپێشکێشکردنی خزمەتگوزاریی کێبڵ بەنیپۆن دیمپۆ تسوشین شا، ئاژانسی دەنگوباسی تێلیگرافی ژاپۆن، کە دواتر تێکەڵ بەئاژانسی دۆمەی بوو.

١٩٠٩ لە ٣١ی کانوونی یەکەمدا، SPTA خرایە ژێر دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی ئەنجوومەنی وەزیرانی ڕووسیا.

١٩١٠ کەشاب چاندرا ڕۆی نووسینگەیەکی ڕۆژنامەوانیی دامەزراند کە لە کۆتاییدا بوو بەئەسۆشیێتد پرێسی هیندستان API.

١٩١٢ دامەزراندنی ئاژانسی تێلیگرافی ئەلبانیا ATA.

١٩١٣ ئاژانسی تێلیگرافن یونیۆنی ئەڵمانیا TU دامەزرا. کە بەشێوەیەکی یاسایی لە ژێر دەسەڵاتی پیشەسازیدا بوو و سەر بەباڵی ڕاستڕۆی پارێزکاری هوگنبێرگ هۆڵدینگ بوو.

١٩١٤ ئاژانسی دەنگوباسی کۆکوسای ژاپۆن دەستی پێ کرد، بەڵام پابەند کرا بەبڵاوکردنەوەی هەواڵی بیانی.

١٩١٤ AP دەستبەرداری تەکنیکی مۆرس بوو و دەست بەبەکارهێنانی تێلیپرینتەر کرد.

١٩١٤ لە ١٩ی ئابدا، دوای ڕۆژێک لە بڕیاری نیکۆلاسی دووەم بەگۆڕینی ناوی شاری سانت پیتەرسبێرگ بەپێترۆگراد، SPTA ناوی خۆی گۆڕی و بووە ئاژانسی تێلیگرافی پێترۆگراد PTA.

١٩١٥ ترانسئۆشن TO دامەزرا، لە لایەن سەندیکای دۆیچە ئوبەرزیدێشت، کە سەندیکایەک بوو بەپێشنیازی حکوومەت دامەزرابوو و لە لایەن کەرتی پیشەسازی و بازرگانییەوە خەرجیی بۆ دابین دەکرا. لە کاتی شەڕی یەکەمی جیهانیشدا وەزارەتی دەرەوەی ئەڵمان ئەم ئاژانسەی بۆ پرۆپاگاندا بۆ پرسی ئەڵمانیا بەکار دەهێنا.

١٩١٥ یونایتد پرێس یەکەمین فایلی خۆی لە ئەمەریکای باشوور دەست پێ کرد.

١٩١٥ ئاژانسی تێلیگرامی فینلەندا لەگەڵ ئاژانسێکی تر تێکەڵ کران و سوۆمین تێتۆتۆمیستۆ STT ئاژانسی دەنگوباسی فینلەندای لێ کەوتەوە.

١٩١٦ ئەسۆشیێتد پرێس و چەند ڕۆژنامەیەکی ئەندام سەرچاوەکانیان تێکەڵ کرد بۆ داپۆشینی هەڵبژاردنە نیشتمانییەکان.

١٩١٦ دوای ئەوەی ڕۆمانیا لە شەڕی یەکەمی جیهاندا بەشداریی کرد. ئاژانسی تێلیگرافی رادۆر جێی ئاژانسی تێلیگرافی ڕۆمانیای گرتەوە.

١٩١٧ ئاژانسی دەنگوباسی کەنەدا CP وەک بارهەڵگرێک هاتە کایەوە بۆ ڕێ خۆشکردن بۆ بڵاوکردنەوەی هەواڵەکانی ئەسۆشیێتد پرێس بەسەر ڕۆژنامەکانی کەنەدادا.

١٩١٧ حکوومەتی بۆلشێفیک (سۆڤنارکۆم) بڕیاری دا PTA ببێتە ئاژانسی ناوەندیی هەواڵی سەر بەحکوومەت.

١٩١٨ بارەگای PTA گواسترایەوە بۆ مۆسکۆ و لەوێ لە مانگی حوزەیراندا لەگەڵ نووسینگەی ڕۆژنامەوانیی حکوومەتدا تێکەڵ کران. لە ٧ی ئەیلوول لیژنەی هەمیشەییی ڕاپەڕاندن بڕیاری دا ناوی PTA و نووسینگەی ڕۆژنامەوانیی حکوومەت بگۆڕێ و بکرێتە ئاژانسی تێلیگرافی ڕووسیا ROSTA و ئەمیش بووە ئاژانسی ناوەندیی دەنگوباسی هەموو یەکەتیی کۆمارەکانی سۆشیالیستی سۆڤێتی ڕووسیایی.

١٩١٨ ئاژانسی تێلیگرافی پۆڵەندا PAT و ئاژانسی دەنگوباسی ئەرمەنپرێس لە ئەرمینیا و ئاژانسی تێلیگرافی ئێستۆنیا ETA دامەزران.

١٩١٩ لا پرێنسا لە بۆینس ئایرس دەستی بەبەکارهێنانی خزمەتگوزارییەکانی یونایتد پرێس کرد.

١٩١٩ ئەسۆشیێتد پرێسی هیندستان API بەتەواوی بووە موڵکی رۆیتەرز.

١٩١٩ لە ٤ی ئادار، حکوومەتی کاتیی لاتیڤیا، لە لیپایا ئاژانسی لاتۆپرێسی سەر بەحکوومەتی دامەزراند. لاتۆپرێس گەیشتە رێککەوتنی هاوپشکی لەگەڵ ئاژانسی دەنگوباسی ئیستۆنیا ئیستور (ئێستا بووەتە ETA) و لەگەڵ ئاژانسی دەنگوباسی پۆڵەندا PAT (ئێستا بووەتە PAP). هاوکاریی ئەم ئاژانسە لەگەڵ پۆڵەندا بووە مایەی پێوەندی لە بواری هەواڵی رادیۆیی لە نێوان ریگا و وارشۆدا.

١٩٢٠ ئاژانسی هاڤاس لەگەڵ کۆمپانیایەکی رێکلام یەکیان گرت.

١٩٢٠ لە مانگی ئاداردا ئاژانسی دەنگوباسی ئازەرتاجی سەر بەحکوومەتی کۆماری ئازەربایجان دامەزرا و لە ١ی نیسان ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسی لیتوانیا ELTA دامەزرا و لە ٦ی نیسان ئاژانسی ئەنادۆڵی تورکیا AA دامەزرا.

١٩٢٠ لە ٥ی ئایاردا، ئەنجوومەنی وەزیرانی حکوومەتی کاتیی لاتڤیا ئاژانسی تێلیگرافی لاتیڤیای دامەزراند و ناوەکەی لە لاتۆپرێسەوە بۆ LETA گۆڕی.

١٩٢٠ پیێر ماری ئۆلیڤێر و مۆریس تراڤیلێ ئاژانسی رۆژنامەوانیی تێلیگرافی بەلجیکایان لە ٢٠ی ئابدا دامەزراند کە سەرمایەکەی پێنج ملیۆن فرانکی بەلجیکی بوو لە لایەن ٢٣٤ کۆمپانیا و ١١ کەسەوە دابین کرابوو. لە ١ی کانوونی دووەمی ١٩٢١ ئاژانسەکە یەکەمێن کۆمەڵە هەواڵی خۆی بڵاو کردەوە.

١٩٢١ دامەزراندنی ئاژانسی دەنگوباسی مۆنگۆلیایی لە لایەن حکوومەتەوە بەناوی ئاژانسی تێلیگرافی مۆنگۆلیا.

١٩٢١ خزمەتگوزاریی راستەوخۆی یونایتد پرێس بۆ رۆژنامەکانی ئەورووپا لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانەوە دەستی پێ کرد و گەیشتە کڕیارەکانی لە کۆلن و فرانکفۆرت و ڤیەننا.

١٩٢١ ئاگرپرێس دوای ئەوەی لە ١٦ی حوزەیراندا وەک دامەزراوەیەکی فەرمیی ڕۆژنامەوانی دامەزرا، دەستی گرت بەسەر کەلوپەلەکانی ئاژانسی رادیۆی ڕۆژهەڵات رادۆردا، ئەم ئاژانسە بەتەواوی لە ژێر دەسەڵاتی وەزارەتی دەرەوەدا بوو.

١٩٢٢ بریتیش یونایتد پرێس، توانیی خزمەتگوزارییەکانی بگەیەنێ بەگشت ڕۆژنامەکانی سەرتاسەری ئیمپراتۆریای بریتانیا.

١٩٢٣ ڕۆیتەرز بۆ گواستنەوەی هەواڵ بەشێوەیەکی نێودەوڵەتی رادیۆی بەکار هێنا.

١٩٢٤ ترانسئۆشن خزمەتگوزارییەکی ڕۆژانەی بەزمانی ئینگلیزی دەست پێ کرد.

١٩٢٤ ئاژانسی تێلیگرافی پۆڵەندا PAT بوو بەکۆمپانیایەکی سەر بەحکوومەت.

١٩٢٤ ئاژانسی ناوەندیی دەنگوباس CNA کە ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسە لە تایلاند لە ١ی نیسان دامەزرا.

١٩٢٤ لە مانگی حوزەیراندا ڕێکخراوی ئاژانسە هاوپەیمانەکان AA یەکەمین کۆبوونەوەی خۆی لە بێرنی سویسرا ئەنجام دا.

١٩٢٤ مانلیۆ مۆرگاگنی، بەڕێوەبەری کارگێردایی پێشووی ڕۆژنامەی پۆپۆلۆ دی ئیتاڵیا کە لە لایەن مۆسۆلینییەوە دامەزرابوو، بوو بەخاوەن و سەرۆکی ئاژانسی ستیفانی.

١٩٢٥ کۆمەڵەی ڕۆژنامەوانیی بریتانیا توانیی ببێتە خاوەنی زۆرینەی پشکەکانی ڕۆیتەرز لیمیتد.

١٩٢٥ ئاژانسی ئەنادۆڵ لە تورکیا بەگۆڕانکارییەک لە بنیاتدا تێ پەڕی و بووە کۆمپانیایەکی خاوەن ئۆتۆنۆمی.

١٩٢٥ لە ١٠ی تەممووزدا، ئاژانسی تێلیگرافی یەکەتیی سۆڤێت TASS دامەزرا و وەک ئاژانسی ناوەندیی ئەو وڵاتە دەستی بەسەر چالاکییە سەرەکییەکانی ئاژانسی تێلیگرافی ڕووسیادا گرت. TASS بووە خاوەن مافی پاوانداری لە کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی هەواڵ لە دەرەوەی یەکەتیی سۆڤێتدا، هەروەها مافی بڵاوکردنەوەی هەواڵی دەرەکی و ناوخۆیی لەناو یەکەتیی سۆڤێت و،

مافی بەڕێوەبردنی کاروباری ئاژانسەکانی دەنگوباسی کۆمارەکانی یەکێتیی سۆڤێیەتیشی وەرگرت. TASS ئاژانسەکانی هەموو کۆمارەکانی یەکێتیی سۆڤێیەتی لە ژێر باڵی خۆی نا: راتاو (ئۆکرانیا)، بێلتا (بێلارووسیا)، ئۆزتاگ (ئۆزبەکستان)، کازتاگ (کازاخستان)، گروزئینفۆرم (جۆرجیا)، ئازەرئینفۆرم (ئازەربایجان)، ئێلتا (لیتوانیا)، ئاتێم (مۆلداڤیا)، لاتئینفۆرم (لاتڤیا)، کیرتاگ (قیرغیزیا)، تاجیکتا (تاجیکستان)، ئەرمەنپرێس (ئەرمینیا)، تورکمەنئینفۆرم (تورکمەنیا)، ئیتا (ئیستۆنیا).

١٩٢٥ ئاژانسی دەنگوباسی رینگۆی ژاپۆن بەتێکەڵکردنی هەردوو ئاژانسی کۆکوسای (خزمەتگوزاریی دەنگوباسی نێودەوڵەتی) و ئاژانسی ناوخۆییی دەنگوباس تۆهۆ (ڕۆژهەڵات) هاتە کایەوە.

١٩٢٦ ئاژانسی Fides-AIP، ئاژانسی نێودەوڵەتیی بڕوای سەر بەڤاتیکان دامەزرا.

١٩٢٦ ئەسۆشیێتد پرێس دیمانەی بۆ یەکەمین جار بەکار هێنا، یەکەمینیان لەگەڵ بۆبی جۆنز بوو کە پاڵەوانی گۆڵفی کراوەی بریتانیا و ئەمەریکا بوو.

١٩٢٧ سوامینانت ساداناند ئاژانسی فری پرێسی FPA لە هیندستاندا دامەزراند.

١٩٢٧ لە ١٧ی ئاداردا سەرۆک یانیس کاکستە یاسای دامەزراندنی ئاژانسی تێلیگرافی لاتڤیای LETA مۆر کرد.

١٩٢٧ ئەسۆشیێتد پرێس خزمەتگوزارییەکی وێنەی دەست پێ کرد. ڕۆیتەرزیش تێلیپرینتەری بۆ ناردنی زانیاری بۆ ڕۆژنامەکانی لەندەن بەکار هێنا.

١٩٣٠ وێب میلەری هەواڵنێری یونایتد پرێس، تەنیا هەواڵنێر بوو خۆپێشاندانی "سۆڵت مارچ"ی داپۆشی کە لە لایەن مۆهانداس گاندییەوە لە شاری داراسانا لە هیندستان ڕێک خرابوو، کە تێیدا بەسەدان لە لایەنگرانی گاندی کەوتنە بەر لێدان.

١٩٣١ ئاژانسی دەنگوباسی چینهوا لە ٧ی تشرینی دووەمدا دامەزرا.

١٩٣١ ئاژانسی یونایتد پرێس بارەگای خۆی بۆ ٣٦ ستۆرەی نیووس لە شاری نیویۆرک گواستەوە.

١٩٣١ ئاژانسی هاڤاس دەستی بەبەکارهێنانی تێلیپرینتەری مۆدێرن کرد.

١٩٣٢ ب سین گوپتا، کە دەستی لە کار کێشابووەوە لە ئاژانسی فری پرێس، لە کالکوتتا ئاژانسی یونایتد پرێسی هیندستانی دامەزراند.

١٩٣٣ ئەسۆشیێتد پرێس هەواڵی نووسراوی بەو رادیۆیانە دەدا کە مۆڵکی رۆژنامە ئەندامەکانی بوون، بەڵام تەنیا لەو کاتانەی هەواڵەکان "زۆر گرینگ" بوونایە.

١٩٣٣ کڕیارەکانی ئەسۆشیێتد پرێس ناوی خۆیان نا کۆمەڵەی نووسیارە کارگێڕەکانی ئەسۆشیێتد پرێس APME.

١٩٣٣ یونایتد پرێس دەستی پێ کرد هەواڵ بەئێزگەکانی رادیۆ بدا.

١٩٣٤ رۆیتەرز و ئەسۆشیێتد پرێس رێککەوتنێکیان مۆر کرد رێی بە ئەسۆشیێتد پرێس دا هەواڵەکانی خۆی لە سەرتاسەری جیهاندا بڵاو بکاتەوە.

١٩٣٤ ئاژانسی دەنگوباسی ئێران IRNA بەناوی PARS دامەزرا.

١٩٣٤ ئاژانسی دێنگوباسی نیشتمانیی هۆڵەندا ANP لە لایەن رۆژنامە رۆژانەکانی هۆڵەنداوە دامەزرا.

١٩٣٥ تۆڕی وایەرفۆتۆی ئەسۆشیێتد پرێس لەدایک بوو، یەکەمین فۆتۆی ئەم تۆڕە وێنەی تێکشکانی باڵەفڕەین بوو لە دەوروبەری نیویۆرک.

١٩٣٥ ئاژانسی زانیاریی باختار BIA لە کابول دامەزرا.

١٩٣٥ دامەزراندنی ئەسۆشیێتد پرێسی ئوستralیا AAP وەک کۆمپانیایەکی هاوپشک.

١٩٣٥ ساداناند ئیفلاسی کرد بەهۆی ئەو هەموو سزایەی بەناوی پێشێلکردنی یاسای ئیمپراتۆریاوە بەسەریدا سەپێنرابوون و ئاژانسی فری پرێسی FPA لە هیندستان داخست. ئەو ئاژانسە یەکەمین ئاژانسی هیندستان بوو لە ساڵانی ١٩٣٢ تا ١٩٣٥ خزمەتگوزارییەکی جیهانیی کاریگەری هەبێ.

١٩٣٦ ئاژانسی دەنگوباسی دۆمەی بەهاوکاریی حکوومەتی ژاپۆن دامەزرا و بووە جێگرەوەی رینگۆ و دەست بەسەر چالاکییەکانی دەنگوباس و گەیاندنی دێنتسوشدا گرت.

١٩٣٧ و ج مۆنۆلەی، بەڕێوەبەری گشتیی ڕۆیتەرز تێلیپرینتەری هێنایە هیندستان. ئەسۆشییێتد پرێسی هیندستانیش API یەکەمین بازنەی تێلیپرینتەری خۆی لە نێوان بۆمبەی و کالکوتتا کردەوە.

١٩٣٧ ئاژانسی دەنگوباسی ئیندۆنیسیا Antara لە ١٣ی کانوونی یەکەمدا دامەزرا.

١٩٣٨ کۆمەڵەی ڕۆژنامەوانیی باشووری ئەفریقا SAPA دامەزرا و بەهاوبەشی موڵکی ڕۆژنامەکان بوو.

١٩٣٩ ڕۆیتەرز بارەگای خۆی بۆ ٨٥ فلیت ستریت لە لەندەن گواستەوە.

١٩٣٩ دامەزراندنی ئاژانسی EFEی ئیسپانیا.

١٩٣٩ ئاژانسی PAT پۆڵەندای لەگەڵ حکوومەتی دەرکراوی ئەو وڵاتەدا بەجێ هێشت. دواتر خۆی لە پاریس دامەزراندەوە و دوای ئەوە لە پاڵ حکوومەتە کۆچەرەکەی پۆڵەندا چووە لەندەن.

١٩٤٠ لە ژێر داگیرکاریی سۆڤێیەتدا ئاژانسی تێلیگرافی لاتڤیا بووە یەکەیەک لە ئاژانسی تاسی سۆڤێیەت.

١٩٤٠ لە ١ی ئابدا و لە لەندەن، پاوڵ لویس برێت ئاژانسی AFI دامەزراند.

١٩٤٠ لە مانگی تشرینی دووەمدا، بەیاسا هەردو و خزمەتگوزاریی هەواڵ و ڕیکلامی ئاژانسی هاڤاس لەیەک جیا کرانەوە و بەشی کۆکردنەوەی هەواڵ بووە موڵکی حکوومەت و بووە نووسینگەی زانیاریی فرانسەیی OFI.

١٩٤١ لە ٢٤ی حوزەیران ئاژانسی RIA نۆڤۆستی پەیدا بوو.

١٩٤١ یونایتد پرێس یەکەمین ڕاپۆرتی خۆی لەمەڕ هێرشی ژاپۆن بۆ سەر پێرل هاربەر بڵاو کردەوە.

١٩٤١ ڕۆیتەرز ترەست پێک هێنرا بەمەبەستی "پاراستنی بێلایەنی و سەربەخۆیی ڕۆیتەرز".

١٩٤١ لە ١ی نیساندا بەفەرمی ئەسۆشییێتد پرێس وەشانی بەتەل دەست پێ کرد لە ئێزگەی WSBی ئەتلانتا و WQXRو WOR و WNYCی نیویۆرک. کەسانی "پسپۆڕ" چیرۆکە هەواڵەکانیان بۆ ئەم خزمەتگوزارییە دەنووسی بەجۆرێکی

تایبەت بەگوێگرتن.

١٩٤٢ لە ١٥ی تشرینی دووەمدا لە جەزائیر، پاوڵ لویس برێت ئاژانسەکەی دامەزراند.

١٩٤٣ لە ٢٥ی تەمووزدا سەرۆکی ئاژانسی ستیفانی مانلیۆ مۆرگاگنی بەگوللە خۆی کوشت.

١٩٤٣ بەبڕیاری دادوەر لێرند هاند دەرگەی ئەندامیەتیی لە ئەسۆشیێتد پرێسی بەڕووی هەموو ڕۆژنامە تۆمارکراوەکانی ئەمەریکادا کردەوە.

١٩٤٣ بارەگای ئاژانسی ستیفانب گوێزرایەوە باکوری ئیتاڵیا و دواتر بووە موڵکی دەوڵەت و زمانحاڵی RSI.

١٩٤٣ دامەزراندنی ئاژانسی NAT لە یۆگۆسلاڤیا.

١٩٤٤ ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی پۆڵەندا PAP لە مۆسکۆ دامەزرا.

١٩٤٤ لە ١٥ی ئادار لە ئەلجەزائیر، حکوومەتی کاتی هەردوو ئاژانسی FDI و FAی تێکەڵ کرد و ئاژانسی AFDPی دروست کرد.

١٩٤٤ لە ١٤ی نیسان و لە فرانسەی داگیرکراودا، کۆمیتەی بەرگریی نەتەوەیی فرانسە ئاژانسی AIDی دروست کرد.

١٩٤٤ لە ٢٠ی ئابدا، کۆمەڵێ لە شەڕکەرانی بەرگری چەکەکانی خۆیان فرۆشت و ئامێری چاپیان بەپارەکەی کڕی و هەردوو ئاژانسی OFI و AIDیان تێکەڵ کرد و ئاژانسی فرانس پرێسیان AFP پێک هێنا و مارشال بۆرگۆن بووە یەکەمین بەڕێوەبەری کارگێڕیی ئاژانسەکە.

١٩٤٤ لە ٣٠ی ئەیلوولدا بەیاسایەک AFP بەشێوەیەکی کاتی کرایە کۆمپانیایەکی کەرتی گشتی.

١٩٤٥ ئاژانسەکانی ANSAی ئیتاڵیا و ئاژانسی دەنگوباسی ڤێتنام VNA و خزمەتگوزاریی دەنگوباسی کیۆدۆ و جیجی پرێسی ژاپۆن و تیلینۆتیشیۆسا هۆی تێلامی ئەمەریکایی و ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسی ئەرجەنتین و ئاژانسی تێلیگرافی ئەلبانیا ATS دامەزران.

١٩٤٥ ئاژانسی ستیفانی کۆتایی پێ هات دوای ئەوەی دوایین بەڕێوەبەری، ئێرنستۆ داکوانۆ، لەگەڵ کۆمەڵی لە سەرکردەکانی فاشیستدا لە ٢٨ی نیسان گوللەباران کران.

١٩٤٥ ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی پۆڵەندا PAP گواسترایەوە بۆ وارشۆ و بووە دامەزراوەیەکی سەر بەدەوڵەت.

١٩٤٥ لە کۆتاییی شەڕی پاسیفیکدا ئاژانسی دۆمای چالاکییەکانی ڕاگرت و لە مانگی تشرینی یەکەمدا هەڵوەشایەوە.

١٩٤٥ یونایتد پرێس تەلی گواستنەوە، هەواڵی وەرزشیی خستە کار.

١٩٤٦ ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی نەمسا APA دامەزرا و خاوەنداریەتیی هاوبەش بوو لە نێوان کۆمەڵەی خاوەن ڕۆژنامەکان و کۆمەڵەی دەزگاکانی وەشان. ئەم ئاژانسە لە ١ی ئەیلوول دەستی بەکار کرد.

١٩٤٦ ئەلگماینەر دۆیچەر ناخریشتندێنشت ADN کە ئاژانسی فەرمیی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات بوو دامەزرا.

١٩٤٦ ئاژانسی ناوەندیی دەنگوباسی کۆریا KCNA کە ئاژانسی حکوومەتیی کۆماری دیموکراتی گەلی کۆریایە دامەزرا.

١٩٤٦ ئەسۆشیێتد پرێس تەلی گواستنەوە هەواڵی وەرزشیی خستە کار.

١٩٤٧ ئەسۆشیێتد پرێسی ئوستراليا AAP و کۆمەڵەی ڕۆژنامەوانیی نیو زیلاند بوونە خاوەنی هاوبەشی ڕۆیتەرز لەگەڵ کۆمەڵەی ڕۆژنامەوانیی بریتانیادا.

١٩٤٧ پرێس ترەستی هیندستان کە کۆمپانیایەکی هاوبەشی قازانج نەویستی ڕۆژنامەکان بوو لە ٢٧ی ئابدا دامەزرا (بەڵام لە ١ی شوباتی ١٩٤٩دا کەوتە کار).

١٩٤٧ ئەنجوومەنی بەڕێوەبەرانی ئەسۆشیێتد پرێس یەکەمین گرووپی ئێزگەکانی رادیۆیان هەڵبژارد بۆ ئەندامیەتیی هاوبەش.

١٩٤٨ ڕۆژنامەکانی بەلجیکا بوونە زۆرینەی خاوەن پشکەکانی ئاژانسی دەنگوباسی بێلگا.

١٩٤٨ یەکەمین ئاژانسی فەرمانی هیندستان، هیندوستان ساماچار، وەک کۆمپانیایەکی سنوورداری کەرتی تایبەت لە لایەن س س ئاپتی دامەزرا. ئەم ئاژانسە یەکەمین ئاژانسی فەرمان بوو کە ئەلفبێی دێڤناگریی بەکار هێنا.

١٩٤٨ یونایتد پرێسی هیندستان دەستی بەخزمەتگوزاریی تێلیپرینتەر کرد.

١٩٤٨ ئەسۆشیێتد پرێسی پاکستان APP دامەزرا (لە ساڵی ١٩٦١ بەنیشتمانی کرا).

١٩٤٩ دۆیچە پرێسە ئەگێنتووە DPA کە یەکێکە لە گەورەترین ئاژانسەکانی دەنگوباس لە ئەوروپا، لە هیچەوە لە بارەگای خۆیەوە لە هامبۆرگ دەستی پێ کرد. ئەم ئاژانسە بەلێکدانی ئاژانسی DENA لە ناوچەی دەسەڵاتی ئەمەریکا و ئاژانسی DPD لە ناوچەی دەسەڵاتی بریتانیا دروست کرا.

١٩٤٩ لە ٢٠ی ئایاردا، ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی ڕۆمانیا ئاگرپرێس خرایە ژێر دەسەڵاتی ئەنجوومەنی وەزیرانەوە.

١٩٤٩ لە مانگی شوباتدا PTI بووە هاوپشک لە ڕۆیتەرز.

١٩٤٩ ئاژانسی ناوەندیی دەنگوباس CNA کە ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسی تایوانە، لە مانگی تشرینی یەکەمدا شانبەشانی حکوومەتی ناسیۆنالیست گوێزرایەوە بۆ تایپێ.

١٩٥٠ یونایتد پرێس یەکەمین ئاژانسی هەواڵی هەڵگیرسانی شەڕی کۆریای ڕاگەیاند.

١٩٥٠ ئاژانسیئیتۆنوت ئیسرائیل میئوتچیدەر ITIM` کە چوار ڕۆژنامە خاوەنی بوون دامەزرا.

١٩٥٠ ئاژانسی فرانس پرێس تێلیپرینتەری رادیۆیی بەکار هێنا.

١٩٥١ یونایتد پرێس و ئەسۆشیێتد پرێس خزمەتگوزاریی تێلیتایپێستەریان TTS دەست پێ کرد، ئەمەش یارمەتیدەری ڕۆژنامەکان بوو بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیک کاری پیت لێدان ڕێک بخەن و ڕاست بکەنەوە لە ڕێی ئەو بابەتانەی بەتەل پێیان دەگا.

١٩٥١ خزمەت گوزاریی رادیۆ فۆتۆی ئەسۆشییّتد پرێس بۆ ئەمەریکای لاتین دەستی پێ کرد و، ئەل مێرکیورۆی سانتیاگۆ ـ چیلی یەکەمین بەشدار بوو لەم خزمەتگوزارییە.

١٩٥١ ئاژانسی فۆتۆگرافی ناوەندی لە وارشۆ دامەزرا.

١٩٥٢ یونایتد پرێس خزمەتگوزاریی وێنەی لووتکەی لە سکریپس کڕی و ناوی نا یونایتد پرێس نیوس پیکچەرز.

١٩٥٢ یونایتد پرێس یەکەمین خزمەتگوزاریی تەلەفزیونیی فیلمی دەنگوباسی دەست پێ کرد.

١٩٥٣ لە مانگی شوباتدا، پرێس ترەستی هیندستان لە هاوپشکیی رۆیتەرز کشایەوە.

١٩٥٣ ئاژانسی فرانس پرێس ناوبانگی جیهانیی دەرکرد بەبڵاوکردنەوەی ڕاستەوخۆی هەواڵی مردنی ستالین لە ٤ی نیساندا.

١٩٥٦ لە ١٤ی ئاداردا پرۆژە یاسایەک لە بارەی پێگەی فرانس پرێسەوە پێشکێش کرا.

١٩٥٦ دامەزراندنی ئاژانسی دەنگوباسی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست MENA لە میسر.

١٩٥٦ ئاژانسی پاکستان پرێس ئینتەرناشناڵ PPI وەک کۆمپانیایەکی سنوورداری کەرتی تایبەت دامەزرا و بارەگاکەی لە کەراچی بوو.

١٩٥٦ هاوپەیمانیی ئێستای ئەورووپایی بەناوی هاوپەیمانیی ئەورووپاییی ئاژانسەکانی رۆژنامەوانی دامەزرا. لە ساڵی ٢٠٠٢دا ناوی گۆڕا و بووە هاوپەیمانیی ئەورووپاییی ئاژانسەکانی دەنگوباس.

١٩٥٦ کۆبوونەوەیەکی نائاساییی خاوەن پشکەکانی dpa بڕیاری دا خزمەتگوزارییەکانی بەرەو دەرەوە فرەوان بکرێن.

١٩٥٧ لە ١٠ی کانوونی دووەمدا، پەرلەمان بەتێکڕایی یاسای AFP پەسەند کرد و ئاژانسەکە پێکهاتەیەکی یاسایی نوێی بەدەست هێنا.

١٩٥٧ دامەزراندنی ئاژانسگەلی دەنگوباسی GNA گانا و MONTSAME مۆنگۆلیا و

ئاژانسی حکوومەتیی تێلیگرافی مۆنگۆلیا و AZAP زاییر.

١٩٥٧ خزمەتگوزاریی ئەورووپاییی dpa دەستی بەبەکارهێنانی شەپۆلی درێژی گواستنەوە کرد و خزمەتگوزاریی ئەوبەری دەریاکانی dpa بەزمانی ئینگلیزی بەپێنج شەپۆلی کورت دەست بەگواستنەوەیان کرا.

١٩٥٧ هیندوستان ساماچار بووە کۆمپانیایەکی بەکۆمەڵ و ناوی بووە کۆمەڵەی هاوبەشی هیندوستان ساماچار و بارەگاکەی لە نیو دێلهی بوو.

١٩٥٨ یونایتد پرێس و ئینتەرنەیشناڵ نیوس سێرڤس لە ٢٤ی ئایاردا یەکیان گرت و یونایتد پرێس ئینتەرنەیشناڵیان UPI پێک هێنا. UPIش تۆڕی دەنگیی UPIی خستە کار کە یەکەمین تۆڕی تێلی خزمەتگوزاریی رادیۆیە.

١٩٥٨ یونایتد پرێسی هیندستان داخرا.

١٩٥٨ لە ١ی تشرینی یەکەمدا نووسینگەی AFP لە بەکین کرایەوە.

١٩٥٨ dpa دەستی بەبەکارهێنانی وایەری بیلدفونک کرد بۆ گواستنەوەی وێنە.

١٩٥٩ خزمەتگوزاریی dpa بەزمانی ئیسپانیایی دەستی پێ کرد.

١٩٥٩ پشکداریی پاوانکارانەی PTI لەگەڵ رۆیتەرزدا بۆ کڕینی هەواڵ کۆتاییی پێ هات.

١٩٥٩ ئاژانسگەلی پرینسا لاتینا PL (کووبا)، مەغریب عەرەبی MAP (مەراکش)، ئاژانسی رۆژنامەوانی سەنگال APS و، ئاژانسی دەنگوباسی عێراق INA دامەزران.

١٩٦٠ ئاژانسی رۆژنامەوانیی کامیرۆن و ئاژانس رۆژنامەوانیی گینیا و ئاژانسی رۆژنامەوانیی مۆریتانیا AMP کە لە ١٩٩٠دا ناوی گۆڕا بۆ AMI هاتنە دامەزراندن.

١٩٦١ ئاژانسی رۆژنامەوانیی تونسی ئەفریقا TAP و ئاژانسی رۆژنامەوانیی بێنین ABP و ئاژانسی رۆژنامەوانیی ئایڤۆری API و ئاژانسی دەنگوباسی جەزائیر APS و ئاژانسی زانیاریی نۆڤۆستی APN و یونایتد نیوسی هیندستان ANI دەمەزران.

١٩٦١ له كانوونی یەكەمدا ڕێکخراوی ئاژانسەكانی دەنگوباسی ئاسیایی OANA پێک هێنرا.

١٩٦٢ له ١ی شوباتدا BBC دەستی بەبەشداری لە AFP كرد.

١٩٦٢ راستریيا ساماچار سامیتی RSS (نیپال)، نەیشناڵ نیوس ئەجنسی NNA (لبنان) و مادپرێس (ماداگاشکار) دامەزران.

١٩٦٣ دامەزراندنی ئەم ئاژانسانەی بەخۆوە دی: ئاژانسی دەنگوباسی كینیا KNA، ئاژانسی دەنگوباسی ئوگاندا UNA، ئاژانسی دەنگوباسی میانمار MNA، ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی بورکینا فاسۆ ABP.

١٩٦٣ سەتەلایتی تاقیگەریی سیكۆم ٢ كە لە خولگەیەک لە دووریی ٣٦٤٨٠ كیلۆمەتر دەسووڕێتەوە لە ٤ی ئابدا بۆ گواستنەوەی تێلیفۆنو و هەواڵی ئاژانسەكانی لە نێوان ئەفریقا و ئەمەریكادا بەكار هێنرا.

١٩٦٤ ڕۆیتەرز دەستی بەخزمەتگوزاریی ستۆكماستەر كرد بۆ گەیاندنی زانیاریی دارایی.

١٩٦٤ دەستپێكردنی ئاژانسەكانی: ئینتەرپرێس سێرڤس IPS، جەماهیرییەی لیبیا JANA، سووریای عارەبی SANA.

١٩٦٥ ئەنجوومەنی گەیاندنی ڕۆژنامەوانیی نێودەوڵەتی IPTC دامەزرا، ئامانجەكەش پاراستنی بەرژەوەندییەكانی گەیاندنی ڕۆژنامەوانی بوو لە جیهاندا.

١٩٦٥ ئاژانسی دەنگوباسی ئوردرن (پەترا) وەک ئاژانسێكی سەر بەحكوومەت دامەزار.

١٩٦٦ دووەمین ئاژانسی فەرمانی هیندستان، ساماچار بهارتی و ئاژانسی دەنگوباسی مالاوی MANA دامەزران.

١٩٦٧ بەبەكارهێنانی سەتەلایت ئەسۆشیێتد پرێس توانیی بۆ یەكەمین جار وێنە لە هۆنۆلۆلۆوە بۆ لەندەن بگوێزێتەوە.

١٩٦٧ خزمەتگوزاریی ئەڵمانیی dpa بووە ٢٤ سات لە ڕۆژدا. خزمەتگوزاریی عارەبیی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست كەوتە كار و خزمەتگوزاریی ئەمەریكای لاتین

لە ٦ ساتەوە بووە ١٢ سات ڕۆژانە و خزمەتگوزاریی ئینگلیزیش زیاد کرا.

١٩٦٧ ڕاپۆرتی ئابووریی ئەسۆشیێتد پرێس- داو جۆنز، کە کارێکی هاوبەش بوو لە نێوان ئەسۆشیێتد پرێس و داو جۆنز ئەند کۆ بڵاوکەرەوەی وۆڵ ستریت جۆرناڵ، دەستی پێ کرا بۆ کۆکردنەوەی هەواڵی دارایی لە هەموو جیهانەوە.

١٩٦٧ ئاژانسی بەرنامای مالیزیا دامەزرا و لە ٢٠ی ئایاردا کەوتە کار.

١٩٦٨ ئاژانسی نۆتیمەکس (مەکسیک) و KPL (لاوس) هاتنە کایەوە.

١٩٦٨ بەنیشتمانیکردنی ئاژانسی دەنگوباسی تیلامی ئەرجەنتین.

١٩٦٨ دەست بەبەکارهێنانی کۆمپیوتەر لە ڕێکخستن و نووسینەوەی هەواڵدا کرا.

١٩٦٩ لە ١ی کانوونی دووەمدا خزمەتگوزاریی عارەبیی AFP دەستی پێ کرد.

١٩٦٩ لە تشرینی یەکەمدا لە AFP بنیاتێکی ڕاوێژکاری لە نێوان یەکتییەکانی بازرگانی و بەڕێوەبردندا هاتە جێبەجێکردن.

١٩٦٩ ئاژانسی دەنگوباسی زامبیا ZANA لە لوساکا دامەزرا.

١٩٧٠ چووە قۆناخی گواستنەوەی ئێلیکترۆنیی هەواڵ بەناردنی کۆپییەک لە شاشەی کۆمپیوتەرێکەوە لە کۆلۆمبیا، کارۆلاینای باشوور، بۆ کۆمپیوتەری سەرەکی لە ئەتلانتا و لەوێوە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیک گەڕایەوە بۆ هێڵی وەشانی کارۆلاینای باشوور.

١٩٧٠ ئاژانسی دەنگوباسی ڕۆژهەڵات ENA کە سەر بەکەرتی تایبەتە لە ١٧ی ئاداردا لە داکا دامەزرا و، باڵە نێودەوڵەتییەکەی بەناوی بەنگلادیش نیوس ئینتەرناشناڵ BNI ناسرا.

١٩٧٠ ئاژانسی لاتینۆ ئەمەریکانا دی ئینفۆرماسیۆن LATIN و ئاژانسی ئێستادۆ و ئاژانسی دەنگوباسی SABA و ئاژانسی یەمەنی سەر بەحکوومەت دامەزران.

١٩٧١ ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی سعوودیە SPA دامەزرا کە یەکەمین ئاژانسی دەنگوباسی نیشتمانیی عارەبستانی سعوودیایە.

١٩٧١ ناوی ئاژانسی تێلیگرافی لاتڤیا گۆڕا و بووە LATINFORM.

١٩٧١ ئەسۆشیێتد پرێس دەستی بەبەکارهێنانی فرەوانی CTR (لوولەی تیشکی

کاتۆد) کرد لە نووسین و نووسینەوەی هەواڵدا.

١٩٧١ لە ١ی ئابدا AFP سەتەلایتی بۆ گواستنەوە بەکار هێنا.

١٩٧٢ ئاژانسی بەنگلادیش سانگباد سانگستس BSS و ئاژانسی دەنگوباسی فەلەستین WAFA دامەزران.

١٩٧٢ کۆمپیوتەر بۆ نووسین و نووسینەوە و ڕێکخستنی چیرۆک بۆ وایەری نیشتمانیی هەواڵەکانی AP بەکار هێنرا و جێی تایپرایتەر و تێلیتایپسێتەرەکانی گرتەوە.

١٩٧٣ ئاژانسی دەنگوباسی فیلیپین و ئاژانسی دەنگوباسی ئەرجەنتین دامەزران.

١٩٧٣ نەوەی یەکەمی ERNAی ئێلیکترۆنی خرایە کار و ڕۆژنامەوانانی dpa دەستیان بەنووسینەوەی دەقەکان لەسەر شاشەی کۆمپیوتەر کرد.

١٩٧٣ دەستەی کارگێریی AFP بڕیاری بەکۆمپیوتەریکردنی AFPیان دا.

١٩٧٣ ڕۆیتەر مۆنیتەر بۆ بازارەکانی بیانیی ئاڵوگۆڕی ئێلیکترۆنی دەستی پێ کرا (خزمەتگوزاریی ڕۆیتەر مۆنیتەر بۆ نرخی دراوەکانیش وردەوردە لە حوزەیراندا لە لەندەن کەوتە کار).

١٩٧٤ ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی ناوەندی ئەفریقا ACP دامەزرا، دوای ئەوەی نووسینگەی بانگیی AFP خۆماڵی کرا.

١٩٧٤ یەکەمین وەشانی زیندووی رادیۆی AP بەخوێندنەوەی هەواڵنامە لە لایەن تۆم مارتنەوە دەستی پێ کرد.

١٩٧٤ ئاژانسی ئۆ گلۆبۆ دامەزرا وەک بەشێک لە دامەزراوەی گلۆبۆی برازیل کە پێک هاتبوو لە تۆڕێکی وەشانی تەلەفزیۆن و کۆمپانیایەکی بڵاوکردنەوە و تۆڕێکی رادیۆ و بەشێکی ئینتەرنێت و سێ ڕۆژنامە.

١٩٧٤ خزمەتگوزاریی دابەشکردنی هەواڵەکانی AFP لە ڕێی کۆمپیوتەرەوە بەشێوەیەکی سەرەتایی دەستی پێ کرد.

١٩٧٥ ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی ئەنگۆلا Angop و ئاژانسی زانیاریی مۆریتانیا AMI و ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی ڕواندا ARP و ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی تۆگۆ ATOP و

ئاژانسی دەنگوباسی قەتەر QNA و ئاژانسی دەنگوباسی قوبرس CNA و فیدراسیۆنی ئاژانسەکانی دەنگوباسی عارەب FANA دامەزران.

١٩٧٥ لە تشرینی دووەمدا، AFP گەیشتە رێککەوتنێک بۆ کۆمپیوتەراندن.

١٩٧٦ لە شوباتدا، چوار ئاژانسەکەی هیندستان، PTI و UNI و هیندوستان ساماچار و ساماچار بهاراتی، ناسنامە جیاوازەکانی خۆیان تێکەڵ کرد و بوون بەساماچار و وەک کۆمەڵەیەک تۆمار کرا.

١٩٧٦ پوولی (گردبوونەوەی) ئاژانسەکانی دەنگوباسی بێلایەن NANAP هاتە کایەوە و ساماچار هاوبەشە هیندستانییەکە لەو رێکخراوەدا.

١٩٧٦ ئاژانسی لاتینۆ ئەمەریکای کویتۆی ئیکوادۆر ALAI و ئاژانسی دەنگوباسی کاریبی CANA و ئاژانسی دەنگوباسی ئیمارات WAM و ئاژانسی دەنگوباسی نایجیریا NAN دامەزران.

١٩٧٦ خستنەرووی وێنەی لێزەر لە لایەن APوە و پێشکێشکردنی یەکەمین وێنەگەلی بەلێزەر سکانکراو بۆ گواستنەوە.

١٩٧٧ ئاژانسی دەنگوباسی تای TNA و ئاژانسی رۆژنامەوانیی مالی AMAP و ڤێنپرێس کە ئاژانسی نیشتمانیی سەر بەحکوومەتی ڤێنزوێلایە دامەزران.

١٩٧٧ لە نیساندا حکوومەتی هیندستان کۆمیتەی کولدیپ نایاری پێک هێنا بۆ پێداچوونەوە بەپێکهاتەی ساماچاردا و پێشنیازکردنی رێکخستنەوەی. کۆمیتەکە راپۆرتی خۆی لە ئابدا پێشکێش کرد.

١٩٧٨ بارەکە وەکو پێشتری لێ هاتەوە و لە ١٤ی نیسانەوە چوار ئاژانسەکەی هیندستان دووبارە جیا لە یەکتر گەڕانەوە چالاکی، وەک چۆن پێش ساماچار بەجیا کاریان دەکرد.

١٩٧٨ لانکاپۆڤات لیمیتد، ئاژانسی نیشتمانیی دەنگوباسی سری لانکا دامەزرا لە شێوەی کۆمپانیایەکی بەرپرسیاریی سنووردار بەپێنج پشکدارەوە.

١٩٧٩ ئاژانسی دەنگوباسی نیکاراگوا ANN و ئاژانسی دەنگوباسی کوەیت KUNA دامەزران.

١٩٧٩ له لایەن dpa وه فۆرماتی ستانداری بابەتی هەواڵ پێشكێش كرا و بەوەش كڕیارەكان ئیتر توانییان هەواڵ لەسەر شاشە وەرگرن و بەكار بهێنن.

١٩٧٩ له ١٩ی نیساندا، UPI ڕێككەوتنێكی لەگەڵ تێلیكۆمپیوتینگی ئەمەریكا ڕاگەیاند له پێناو گەیاندنی هەواڵە جیهانییەكانی UPI بەشاشەی كۆمپیوتەری ماڵەوەی كڕیارەكان.

١٩٧٩ وایەری APTV كه یەكەمین وایەری هەواڵ بوو كه بەتایبەتی بۆ ئێزگەكانی تەلەفزیۆن، بەرهەم هێنرا.

١٩٧٩ ئەسۆشیێتد پرێس یەكەمین دەزگای هەواڵ بوو كه "تاریكە ژووری ئێلیكترۆنی" بەرهەم بهێنێ، كه بریتییە له كۆمپیوتەرێك نەك تەنیا وێنە دەگوێزێتەوە بگرە كۆمەڵێ ئەركی زۆری تاریكە ژووری ئاسایی كیمیایی جێبەجێ دەكا وەك دیاریكردن و ڕێكخستنی ڕادەی ڕووناكی و جیاكردنەوە.

١٩٧٩ له ٦ی حوزەیراندا كەناڵی سەتەلایتی بۆمبەی- نیویۆرك ساز كرا بۆ وەرگرتنی خزمەتگوزارییەكانی AP له لایەن UNIوە.

١٩٧٩ كرانەوە بەڕووی میدیای نوێ و كڕیاری نامیدیایی دەستی پێ كرد و خزمەتگوزاریی "بەپێی خواست" بۆ بابەتگەلی وەرزش و ئابووری و وەشانی دەنگی و سیستەمەكانی گەیاندنی زانیاری له لایەن AFPوە بەرهەم هێنران.

١٩٧٩ كۆلپرینسا، ئاژانسی نیشتمانیی سەر بەكەرتی تایبەتی كۆلۆمبیا و ئاژانسی دەنگوباسی سیرا لیۆن SLENA كه ئاژانسی نیشتمانیی سەر بەحكوومەتە و ئاژانسی دەنگوباسی یۆنهاپ كه هاوكارییەكی نێوان بەكارهێنەرانە، دامەزران.

١٩٨١ ئاژانسی دەنگوباسی گویانای تانزانیا GNA و ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی بۆتسوانا BOPA و ئاژانسی دەنگوباسی نێوئەفریقای زیمبابوی ZIANA دامەزران.

١٩٨١ ناوی OANA گۆڕا بۆ ڕێكخراوی ئاژانسەكانی دەنگوباسی ئاسیا- پاسیفیك و هەروەها OANA تۆڕی دەنگوباسی ئاسیا- پاسیفیكی ANN دامەزراند.

١٩٨١ ئاگۆرا كه بانكێكی زانیاریی بابەتەكانی هەواڵی AFPە، له ١ی كانوونی

دووەمدا دەستی پێ کرد. هەروەها DEA کە بانکی زانیاریی ANSAە دروست کرا و زیاتر لە سێ ملیۆن بابەتی هەواڵ لەخۆ دەگرێ کە لە ساڵی ١٩٧٥ەوە گوازراوەتەوە و لەگەڵ کورتەیەکی ڕووداوەکانی ساڵانی پێش ئەو ساڵە.

١٩٨١ خزمەتگوزاریی مامەڵەتکردنی ڕۆیتەر مۆنیتەر دەستی پێ کرد.

١٩٨١ بلوومبێرگ دامەزرا.

١٩٨١ بەشی ئابووریی dpa دەستی بەکار کرد.

١٩٨١ لە ڕێی بەکارهێنانی سیستمی هیرمسەوە، بێلگا نووسینەکانی بۆچوونی خۆی بەکۆمپیوتەر کرد.

١٩٨١ کەناڵی سەتەلایتی بۆمبەی- دوبەی UNI لە ١ی نیساندا خرایە کار.

١٩٨٢ بەشی هۆنگ کۆنگی AFP کۆمپیوتەرێنرا. لەو کاتەشەوە ناوچەی ئاسیا- پاسیفیک بارەگای تایبەتی خۆی هەیە.

١٩٨٢ یەکەمین تۆڕی سەتەلایتی وێنەی ڕەنگینی AP بەلێزەر فۆتۆوە دامەزرا، ئەمەش خێرایی و جۆری وێنەکانی APی باشتر کرد.

١٩٨٢ خێزانی سکریپس UPIیان فرۆشت. بەڵێندەرانی تێنیسی و دۆگلاس رووە و ویلیەم گیسلەر لە دەستی خاوەنەکانی زنجیرە ڕۆژنامەی سکریپس- هاوارد دەرهێنا. لە ژێر سایەی ئەواندا UPI بەردەوام بوو لە لەدەستدانی پارە و لە کۆتاییدا داوای پاراستنی کرد لە ژێر بەشی ١١ی پاراستن لە ئیفلاس. بارەگای کۆمپانیاکەش لە نیویۆرکەوە گوێزرایەوە بۆ واشنتۆنی پایەتەخی.

١٩٨٢ لە ١٥ی ئاداردا گرووپێک ڕۆژنامەی ئەرجەنتین dyN یان دامەزراند، وەک ئاژانسێکی کەرتی تایبەت.

١٩٨٢ لە مانگی ئایاردا خزمەتگوزاریی هیندی لە یونایتد نیوسی هیندستان بەناوی UNIVarta دەستی پێ کرد.

١٩٨٣ خزمەتگوزاریی وێنە لە dpa بەشەکانی وێنەی ئێلیکترۆنیی بۆ زیاد کرا.

١٩٨٣ ئەسۆشیێتد پرێس کارەکانی وەشانی خۆی لە بارەگای نیویۆرکی APەوە گواستەوە بۆ بارەگای وەشانی ناوەندی هەواڵەکانی AP لە واشنتۆنی

پایەتەخت. لە ٤ی ئایاردا یەکەمین وەشانی AP لە جێیە نوێکەوە گواستەوە.

١٩٨٣ ئاژانسی دەنگوباسی لیسۆتۆ LENA بەهاوکاریی یونسکۆ دامەزرا.

١٩٨٣ ئاژانسی دەنگوباسی پان ئەفرکان PANA دامەزرا و بارەگاکەی لە داکاری سەنیگال بوو.

١٩٨٤ رۆیتەرز بووە کۆمپانیایەکی گشتی و موڵک و کەلوپەلەکانی خرانە بازاڕی پارەگۆڕینەوەی لەندەن و ناسداکی ئەمەریکا.

١٩٨٤ ئەسۆشیێتد پرێس بووە یەکەمین دەزگای هەواڵ کە خاوەنی سەتەلایتی بڵاوکەرەوەی خۆی بێ.

١٩٨٤ سۆفتوێری بڵاوکردنەوەی زانیاری و نووسینەوە و گۆڕین IDEAS لە لایەن CMC دامەزرێنرا و لە PTI بەکارهێنرا.

١٩٨٤ لە ٢٥ی حوزەیران رۆیتەرز لەگەڵ UPI رێک کەوت بۆ ئەوەی لە ساڵی داهاتوودا خزمەتگوزاریی وێنەی نێودەوڵەتی دەست پێ بکا بەبەدەستهێنانی چالاکییە وێنەییە نائەمەریکاییەکانی UPI.

١٩٨٤ لە ١٥ی تشرینی یەکەمدا خزمەتگوزاریی دەنگیی AFP دەستی پێ کرد.

١٩٨٤ دوای گفتوگۆ و بگرەوبەردەیەکی زۆر خزمەتگوزاریی هەڵبژاردنی بابەتەکان لە dpa پێشکێش کرا، ئێستا کڕیارەکان دەتوانن هەڵبژاردەیەک لەو بابەتانەی خۆیان دەیانەوێ وەرگرن. هەروەها کار بۆ دروستکردنی بانکی زانیاریی dpa دەستی پێ کرد.

١٩٨٤ ئاژانسی دەنگوباسی جامپرێس لە کینگستۆن لە جامایکا دامەزرا.

١٩٨٥ خزمەتگوزاریی نێودەوڵەتیی وێنە و خزمەتگوزارییەکی بیستراو- بینراو لە لایەن AFPوە دەستی پێ کرد.

١٩٨٥ رۆیتەرز ڤیسنیوسی کڕی (ناوی نا تەلەفزیۆنی رۆیتەرز)، هەروەها خزمەتگوزاریی وێنەی خۆی دەست پێ کرد.

١٩٨٥ ئاژانسی PTI دەستی پێ کرد خزمەتگوزاریی تێلیتێکست بەدووردارشان (تەلەفزیۆنی هیندستان) بدا.

١٩٨٥ ئاژانسی UPI بۆ یەکەمین جار تووشی ئیفلاس بوو.

١٩٨٥ ئاژانسی وێنەی ڕۆژنامەوانیی ئەورووپا epa لە هاگ- فرانکفۆرت دەستی پێ کرد.

١٩٨٥ ئاژانسی کۆمۆرۆس پرێس و ئاژانسی سەر بەحکوومەتی سۆ تۆم و پرنسیپ STP دامەزران.

١٩٨٦ بڵاوکەرەوەی مەکسیک ماریۆ ڤازکیز رانا UPIی کڕییەوە و لە ئیفلاس ڕزگاری کرد.

١٩٨٦ ئاژانسی AFP دەستی بەگواستنەوەی خزمەتگوزارییەکانی لە ڕێی مینیتێل کرد.

١٩٨٦ خزمەتگوزاریی وێنەی AFP بڕیاری دا ڕەنگ بەکار بێنێ لە هەموو ئەو ئەرکانەی بەفیلمی ڕەنگین داپۆشراون. هەروەها ئەو وێنانەی بەڕەش وسپی دەگوازرانەوە دەکرێ لەسەر داوای کڕیار ڕەنگ بکرێن.

١٩٨٦ لە نیساندا PTI خزمەتگوزاریی هیندیی دەست پێ کرد بەناوی PTI باشا.

١٩٨٦ ئاژانسی دەنگوباسی عومان ONA بەبڕیارێکی شاهانە دامەزرا.

١٩٨٦ لە کانوونی یەکەمدا AFP مانگرتنێکی هەشت ڕۆژەی بەخۆوە دی. لە ١٨ی ئەو مانگەدا هنری پیجێت دەستی لە کار کێشایەوە.

١٩٨٦ ڕۆیتەرز ئینستینێتی کڕی.

١٩٨٦ دامەزراندنی ئاژانسی دەنگوباسی پۆرتوگال LUSA بەتێکەڵکردنی هەردوو ئاژانسی دەنگوباسی پۆرتوگیسا ANOP و پۆرتوگال NP کە هەردووکیان موڵکی هاوبەشی حکوومەت و ئابوونەدەران بوون.

١٩٨٦ خزمەتگوزاریی وەشانی dpa دەستی پێ کرد. خزمەتگوزاریی جیهانیی میدیا GmbH وەک لقێکی dpa دامەزرا.

١٩٨٦ بێلگا پێشنیازی بڵاوکردنەوەی هەڵبژاردەی خزمەتگوزاریی کرد لە ڕێی فاکس و (دواتر) ئیمەیڵەوە بۆ ئەو کڕیارانەی گرینگی بەهەندێ بابەتی دیاریکراو دەدەن.

١٩٨٧ ئاژانسێکی دەنگوباسی سەربەخۆ بەناوی یونایتد نیوسی بەنگلادیش UNB لە کانوونی دووەمدا دامەزرا.

١٩٨٧ ئاژانسی پۆستفاکتومی ڕووسیا وەک لقێکی خزمەتگوزاریی زانیاریی فاکت دەستی پێ کرد.

١٩٨٧ ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی نایجیریا ANP کە ئاژانسێکی سەر بەحکوومەتە لە نیامی دامەزرا.

١٩٨٧ ئاژانسی AP فۆتۆستریمی پێشکێش کرد کە تۆڕێکی زۆر خێرای کۆکردنەوە و گەیاندنی وێنەیە و بازنەی سەتەلایت و تێکنۆلۆجیای دیجیتاڵ بەکار دێنێ.

١٩٨٧ یەکەمین خزمەتگوزاریی رۆیتەر خرایە سەر تۆڕی زانیاریی یەکگرتوو IDN کە شارێیەکی جیهانیی زانیارییە.

١٩٨٧ لە ٣٠ی کانوونی یەکەم، بەشی زمانی عارەبیی AFP لە قاهیرە گواسترایەوە بۆ نیقۆسیا و بووە بارەگای ناوچەیی.

١٩٨٨ ئاژانسی dpa گلۆبەس کارتندێنستی کڕی و مەوداکەی لە مادەی گرافیک فرەوان کرد. هەروەها دەسبەرداری بەکارهێنانی ئاژانسگەلی هاوپشک بوو بۆ هاوکاریکردنی لە گەیاندنی هەواڵە نێودەوڵەتییەکان بەکڕیارەکانی. لەو کاتەوە dpa تۆڕی پەیامنێرانی خۆی بەپاوانکراوی بۆ داپۆشینی هەواڵەکانی جیهانی بەکار دێنێ.

١٩٨٨ لە ١ی تشرینی یەکەمدا، خزمەتگوزاریی گرافیکی AFP دەستی پێ کرد.

١٩٨٨ ڤازکیز UPIی بەکۆمپانیای ئینفۆتێکی ئیرل برایان فرۆشت.

١٩٨٩ پۆستفاکتوم وەک کۆمپانیایەکی هاوبەشی سەربەخۆ تۆمار کرا.

١٩٨٩ ئەسۆشیێتد پرێس ڕای گەیاند کە بەشی لیف پیکچەری خۆی دادەگرێتە ماڵپەڕەکانی ڕۆژنامە ئەندامەکان بۆ ئەوەی وێنە وەرگرن.

١٩٨٩ ئینتەرفاکس لە لایەن میخائیل کۆمیسار و هاوڕێیانی لە رادیۆی مۆسکۆوە دەستی پێ کرد.

١٩٨٩ هەواڵدانی بێ قەیدوشەرت لە کۆماری ئەڵمانیای دیموکراتەوە دەستی پێ

کــــرد. dpa و ADNی ئەڵمــــانیــــای ڕۆژهـەڵات (ئەلگمــــاینـەر دۆیچــــەر ناخریشتندێنست)، بەرلین، لەسەر هـاوکاری لە بڵاوکردنـەوە و تێکنۆلۆجـیا ڕێک کــــەوتن. dpa و پێنج ئاژانسی تر mecomیان پێک هێنا بۆ ئەوەی خزمەتگوزارییەکانیان لە ڕێی سەتەلایتەوە بگوێزێتەوە.

١٩٨٩ کۆتایی ئەو جیاوک (إمـتیاز)ەی لە ڕۆیتـەرزدا بۆ کۆمەڵەی ڕۆژنـامەوانی و کۆمەڵەی بڵاوکەرەوەکانی ڕۆژنامە هەبوو بەوەی پشکەکانی جۆری A لە ٢٦ی نیساندا کرانە پشکی ئاسایی جۆری B.

١٩٩٠ ئەسۆشیێتد پرێس دەستی بەگەیاندنی وێنە کرد لە ڕێی سـەتەلایتـەوە بۆ بەشەکانی لیف پیکچەری خۆی لەسەر شاشەی کۆمپیوتەرەکانی ڕۆژنامەکان.

١٩٩٠ خزمەتگوزاریی زانیاریی ئەسۆشیێتد پرێس، کە لەم ساڵەدا دەستی پێ کرد، زانیـارییـەکـانی APی دەپێـچـایەوە و دەیگەیانده داوودەزگـا و ئاژانســە حکوومــەتیـیـەکــان و ڕێگەی دا بەو بڵاوکـەرەوانەی هەواڵ دەدەنە بازاڕی هاوبەش زانیارییەکانی AP بەکار بێنن.

١٩٩٠ لە ٨ی کانوونی دووەمدا، ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی ڕۆمانیا، ئاگرپرێس، بەناوی ڕۆمپرێس ڕێکخرایەوە.

١٩٩٠ لە ٣١ی ئایاردائەنجوومەنی وەزیرانی کۆماری لاتڤیای سەر بەسۆڤێیەت ناوی LETA مێژوویی بۆ ئاژانسی زانیارییەکەی ئەو کۆمارە گێڕایەوە.

١٩٩٠ لە ١٧ی ئابدا ئاژانسی دەنگوباسی کرواتیا Hina دەستی بەکار کرد.

١٩٩٠ خزمـەتگوزاریی دەنگوباسی بەلتیک BNS لە نیـسـاندا لە گەرمـەی خـەباتی وڵاتانی بەلتیک بۆ بەدەستهێنانی ئازادی لە مۆسکۆ دامەزرا.

١٩٩٠ لە ئەیلوولدا، ئینتەرفاکس وەک کۆمپانیایەکی سەربەخۆ تۆمار کرا.

١٩٩٠ ڕۆژنامەی توێرینگەر ئەلگماینەی ئیرفورت بووە یەکەمین ڕۆژنامە لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات کـە ڕاسـتـەوخـۆ بەشـداری لە خـزمـەتگوزاریی ئەڵمـانیی dpa بکا. بەهاتنی کۆتایی ئەو ساڵە ٤١ ڕۆژنامە و رادیۆ و تەلەفزیۆنی هەرێمە فیدراڵە تازەکـان بوونە کـڕیاری dpa. لقـە ١٠٠٪ەکەی dpa " dpa– ئاگـێنتـوردێنشـتـە

GmbH" دامـەزرا، بـەرلینیش بەرپرس بوو لە چالاکـیـیـەکـانی ئەڵمـانیـای ڕۆژهەڵات. خزمەتگوزارییەکان لە پێنج هەرێمە فیدراڵە نوێکاندا لە لایەن ١٤ نووسینگەی هەرێمی و نووسینگەیەکی ناوەندی لە بەرلین بەڕێوە دەچوون.

١٩٩٠ بارەگـای ANSA دەسـتی بەبەکـارهێنانی نەوەی دووەمی سـیـسـتـمی نووسینەوەی ئێلیکترۆنی SEAN کرد.

١٩٩٠ ئاژانسی تێلیگرافی لاتڤـیـا LETA باری یاسـاییی خـۆی گـۆڕی و خـۆی بۆ بەتایبەتیبوون ئامادە کرد.

١٩٩١ ئاژانسی ڕۆژنامـەوانیی نامیبیا NAMPA و ئاژانسی ڕۆژنامـەوانیی سلۆڤێن STA و AFX نیوس کە لقێکی ئینگلیزی زمانی ئابووریی AFPیە دامەزران.

١٩٩١ لە ٢٠ی حوزەیراندا، یەکەمین ئاژانسی دەنگوباسی سـەر بەکەرتی تایبـەت لە ڕۆمانیا، میدیافاکس، دامەزرا.

١٩٩١ خزمەتگوزاریی زانیاریی ڕۆژنـامـەی نیزاڤـیزیمایا گـازیتـای ڕووسـیـا، Nega، دامەزرا.

١٩٩١ ئەسـۆشـیـێتـد پرێس دەسـتی بـە گـرافـیـک بانک کـرد کـە یەکـەمین ئارشـیـڤی گرافیکە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بۆ پرۆگرامەکانی دەنگوباسی تەلەفزیۆن.

١٩٩١ فۆتۆستریمی ئەسۆشیێتد پرێس هاتە کایەوە.

١٩٩١ لە وارشـۆ PAT و ئاژانسی ناوەندیی فـۆتـۆ تێکەڵ کـران و ئـاژانسی PAPیان پێک هێنا.

١٩٩١ لە ١٥ی تشـرینی دووەمــدا، داهاتی AFP لە یەک ملیـار فـرەنک تێ پەڕی، لە کاتێکدا پشکی دەوڵەت دابەزییە ژێر ٥٠٪.

١٩٩١ ڕاگـەیاندنی تونس بۆ پێکهـێنانی هاوپەیمانیی ئـاژانسـەکـانی دەنگوبـاسی دەریای ناوەڕاست AMAN لە ٢١ی تشرینی دووەمدا.

١٩٩١ بۆ جاری دووەم UPI لە ئیفلاس دەرهێنرا بەهۆی کڕینیەوە لە لایەن گـرووپێک لە وەبـەرهێنـانی سـعـوودی و مـەودای کـارکـردنی لـە ڕۆژهەڵاتی نـاوەڕاست فرەوان کرا.

١٩٩١ ئاژانسی dpa بووه خاوەنی ٧٥٪ی ئاژانسی ناوەندیی وێنە، بەرلین.

١٩٩٢ تاس ڕیک خرایەوە و بووە ئیتار (ئاژانسی تێلیگرافی زانیاریی ڕووسی) و ئەوەندەی پێ نەچوو بووە هێڵی بڕوا پێکراوی ئیتارتاس بەکار هێنرا بۆ ئەوەی کڕیارەکان لە پێوەندییە کۆنەکە ئاگەدار بکەنەوە.

١٩٩٢ لە ٣٠ی کانوونی دووەمدا ئاژانسی دەنگوباسی کۆماری سلۆڤاک TASR دامەزرا.

١٩٩٢ ئاژانسی دەنگوباسی چیک CTK وەک کۆمپانیایەکی کەرتی گشتی دامەزرا.

١٩٩٢ ئاژانسی دەنگوباسی سەربەخۆی ماکفاکس دامەزرا و لە ئایاری ١٩٩٣دا کەوتە کار. ماکفاکس بەوە ناوبانگی دەرکرد کە یەکەمین ئاژانسی دەنگوباسی کەرتی تایبەتە لە دوای هەڵوەشانەوەی کۆنە یەکێتیی یۆگۆسلاڤیا دەرکەوێ.

١٩٩٢ ANSA دەستی بەبەرهەمهێنانی سی دییەک کرد کە دەقی تەواوی هەموو خزمەتگوزارییەکانی هەواڵی لە ساڵی ١٩٨١ەوە تێدا هەبوون.

١٩٩٣ هەموو ئاژانسی AFP کۆمپیوتەرێنرا. ئارەزووی ئەوەش هەبوو خزمەتگوزاریی ئینگلیزی زمان پێش بخرێ.

١٩٩٣ بێلگا گواستنەوەی فۆتۆگرافی ڕەنگاوڕەنگی لە ڕێی ISDNوە (تۆڕی خزمەتگوزاریی یەکگرتووی دیجیتاڵ) مەیسەر کرد.

١٩٩٤ تەمەنی ٤٠ ساڵەی گواستنەوە بەشەپۆلی درێژ بەکۆتا گەیشت. DENA گوێزەرەوەکانی شەپۆلی درێژی خۆی داخست. هاتنە کایەی گواستنەوەی وێنەی دیجیتاڵ لە ڕێی سەتەلایتەوە. دەسەڵاتی dpa بەسەر ئاژانسی ناوەندیی وێنەدا بووە ١٠٠٪.

١٩٩٤ ڕۆیتەرز TIBKO (تێکنیکرۆنی پێشوو) و کوۆترۆن و LNRی وەشانکاری رادیۆی بریتانیای کڕی و خزمەتگوزاریی تەلەفزیۆنیی ڕۆیتەرزی بۆ بازاڕەکانی دارایی کردەوە.

١٩٩٤ کامیرای دەنگوباسی AP 2000 لە لایەن APوە پێشکێش کرا، کە یەکەمینە لە

زنجیره کامیرایەکی دیجیتاڵی بێ فیلمی تایبەت بەرۆژنامەوانانی وێنەگر.

١٩٩٤ مەڵبەندی دەنگوباسی AP کە سیستمێکە لە سیستمەکانی ژووری هەواڵ بۆ وێتگەکانی تەلەفزیۆن، دامەزرا.

١٩٩٤ ئاژانسی APTV کە ئاژانسێکی جیهانیی کۆکردنەوەی ڤیدیۆیی هەواڵە، دامەزرا.

١٩٩٤ رادیۆی AP ئۆڵ نیوس، کە تۆڕێکی ٢٤ ساتیی هەواڵ و زانیارییە، دروست کرا بۆ ئەوەی بەرنامەی هەواڵی بەردەوام پێشکێشی ئێزگەکانی رادیۆ بکا.

١٩٩٤ ئاژانسی AP خزمەتگوزاریی AP AdSEND ی دامەزراند، کە خزمەتگوزارییەکی گەیاندنی دیجیتاڵی رێکلامە کە رێکلامەکان ڕاستەوخۆ لە رێکلامکەر و ئاژانسەکانەوە بۆ رۆژنامەکان دەگوێزێتەوە.

١٩٩٤ لقەکەی dpa، گلۆباڵ میدیا سێرڤس GmbH دەستی بەسەر "نیوس ئەکتوێل GmbH" هامبۆرگدا گرت. dpa خزمەتگوزاریی ئینگلیزیی نووسینگەیەکی نوێی لە واشنتۆنی پایەتەخت کردەوە.

١٩٩٤ خزمەتگوزاریی ئینگلیزیی ANSA چووە ناو ئینتەرنێتەوە.

١٩٩٥ لە نیساندا AFP دایرێکت دامەزرا بەمەش گواستنەوەی کەسیی خزمەتگوزارییەکانی AFP فەراهەم کرا.

١٩٩٥ ئاژانسە حکوومەتییەکانی دەنگوباس لە بەلکان، لەسەر پێشنیاز ئاژانسی رۆژنامەوانیی ماکدۆنیا، لە حوزەیراندا کۆمەڵەی بەلکانی ئاژانسەکانی دەنگوباسیان ABNA دامەزراند.

١٩٩٥ لە ئەیلوولدا AFP ڕێککەوتنەکەی خۆی لەگەڵ AP سەبارەت دابینکردنی هەواڵەکانی ئەمەریکا هەڵوەشاندەوە و تۆڕێکی تایبەت بەخۆی دامەزراند بۆ کۆکردنەوەی هەواڵ لە ئەمەریکا.

١٩٩٥ خزمەتگوزاریی وێنەی dpa هەموو بەرهەمەکانی خۆی کرد بەدیجیتاڵ لە پاڵ بەکارهێنانی ئارشیڤی بانکی زانیاری.

١٩٩٦ بەڕێوەبردنی خزمەتگوزاریی ئیسپانیی dpa لە هامبۆرگەوە گوازرایەوە بۆ

مەدرید و لەوێ ئاژانسی پرینسا ئالەمانا SL دامەزرا. لەوێ خزمەتگوزاریی ئیسپانیی بەرهەم دەهێنرێ لە پاڵ بەشی سەرنووسیارییەکەی بۆینس ئایرس بەڕێوە دەبرێ.

١٩٩٦ ئاژانسی ECN ئایسلاند لە لایەن رۆیتەرزەوە دامەزرا و رۆیتەرز زۆربەی LNRی بە DMG و ITN و GWR فرۆشت.

١٩٩٦ ئەسۆشیێتد پرێس ڕووداوێکی گەورەی بەبێ بەکارهێنانی فیلم، تەنیا بەکامیرای دیجیتاڵ گواستەوە، ڕووداوەکە یاریی سوپەر باوڵ ئێکس ئێکس ئێکس بوو.

١٩٩٦ ئەسۆشیێتد پرێس خزمەتگوزاریی ناوچەییی ڕۆئاوای دەست پێ کرد و ئەم خزمەتگوزارییە خزمەتی ١٣ لە ویلایەتەکانی ڕۆئاوای ئەمەریکا دەکا.

١٩٩٦ ئەسۆشیێتد پرێس سیستمێکی هەواڵی سەر دێسکتۆپی کۆمپیوتەری بۆ BBC بەرهەم هێنا، ئەم سیستمە دەق و دەنگ و ڤیدیۆ تێکەڵ بەیەک دەکا و پێی دەگوترێ سیستمی بەرهەمهێنانی ئێلیکترۆنیی هەواڵ ENPS.

١٩٩٦ ئەسۆشیێتد پرێس WIREی خستە کار، کە سیستمێکە بەبەردەوامی هەواڵەکانی ئینتەرنێت نوێ دەکاتەوە و دەق و وێنە و دەنگ و ڤیدیۆ بەیەکەوە کۆ دەکاتەوە.

١٩٩٦ لە هەوڵێکی هاوبەشدا، APTV لەگەڵ ترانس وۆرڵد ئینتەرناشناڵ TWI، SNTVیان دامەزراند کە ئاژانسێکی ڤیدیۆییی هەواڵەکانی وەرزشە.

١٩٩٦ ئاسیا پەڵس پتی لیمیتد دامەزرا، کە کۆمپانیایەکی هاوبەشی بەرهەمهێنە سەرەکییەکانی هەواڵ و زانیارییە لە ئاسیا.

١٩٩٦ ئاژانسی ناوەندیی دەنگوباس CNA، ئاژانسە نیشتمانییەکەی تایوان بەشێوەیەکی یاسایی بوو بەقەوارەیەکی گشتیی سەربەخۆ.

١٩٩٦ کۆماری لیتوانیا بڕیاری یاسایەکی تایبەتی دا کە ELTAی کردە ئاژانسێکی دەنگوباسی نیشتمانیی سەربەخۆ.

١٩٩٧ رۆیتەرز بنیاتێکی سەرمایەی نوێی داهێنا بەپێکهێنانی گرووپی رۆیتەرز PLC

و یەک ملیۆن و نیو پاوەنی ستەرلینیی بۆ پشکدارەکانی گەڕاندەوە.

١٩٩٧ یونایتد پرێس ئینتەرناشناڵ Arabia2000ی دامەزراند کە کۆکراوەیەکی چڕۆکگەلی هەواڵی عارەبی زمانە لە ئاژانسەکانی دەنگوباسی حکوومەتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەرگیراون.

١٩٩٧ ئاژانسی تێلیگرافی لاتڤیا LETA بەتایبەت کرا و خاوەنە نوێکانی پارەی تێدا وەبەر دێنن.

١٩٩٧ ئاژانسی dpa ئاگێنتوردێنشتە بەرلین، بەتەواوی لە لایەن dpaوە قووت درا. بەشێکی نووسیاریش لە نیقۆسیا دامەزرا و لە کانوونی دووەمەوە دەستی بەبەرهەمهێنانی خزمەتگوزاریی نێودەوڵەتیی dpa بەزمانی عارەبی کرد. بەشێکی نووسیاریش لە بانکۆک دامەزرا بۆ مامەڵەتکردن لەگەڵ ئەو هەواڵانەی لە ئاسیاوە دێن. هەروەها dpa سێرڤەری MESی بەرهەم هێنا بۆ وەرگرتنی خزمەتگوزاریی وێنەی و dpa ئۆنلاین و dpa گرافیک و دەستی بەخزمەتگوزاریی وەشانی dpa\RUFA کرد. قۆناخی ئەزموونیی dpa ئۆنلاین لە شوبات دەستی پێ کرد. مانگی نیسانیش پێشکێشکردنی خزمەتگوزاریی "گواستنەوەی خێرای وێنەی" dpaی بەخۆوە دی کە هەموو وێنەکانی ڕەنگاورەنگن.

١٩٩٨ ڕۆیتەرز لیپەر ئەنالیتیکاڵ سێرڤسی کڕی (ناوی نا لیپەر Inc) هەروەها ئاژانسی APMشی کڕی و پشکداریی لە داتامۆنیتەریشدا کرد.

١٩٩٨ ئاژانسی PAP وەک کۆمپانیایەکی بازرگانی بەناوی ئاژانسی ڕۆژنامەوانیی پۆڵەندایی تۆمار کرا.

١٩٩٨ دوای ئەوەی ئەسۆشیێتد پرێس ئاژانسی ڤیدیۆی WTNی لە کۆمپانیا باوکەکانی ABC نیوسی ئەمەریکایی و ITNی بریتانیایی و کەناڵی ٩ی ئوستralیا کڕی، APTV بوو بە APTN _هەواڵەکانی تەلەفزیۆنیی ئەسۆشیێتد پرێس.

١٩٩٨ ئاژانسی زانیاریی ماکدۆنیا MIA لە ٣٠ی ئەیلوول دامەزرا.

١٩٩٩ فیدڵ کاسترۆ، دوای ئەوەی پێش ٣٠ ساڵ فەرمانی داخستنی دا، ڕێی دا

ئەسۆشیێتد نووسینگەی خۆی لە هاڤانا بکاتەوە.

١٩٩٩ رۆیتەرز هاردویک ستافۆرد رایتی کڕی، کە زانیاری لەسەر بازاڕی دراو بەپیشەسازیی بریتانیا دەدا و ISB AG BOPPی کڕی کە زانیاری و شیکردنەوە لەسەر بازاڕی دراو بەپیشەسازیی سویسرا دەدا و زۆربەی تاوەر گرووپیشی کڕی کە گرووپێکی شارەزایانی ITی بواری داراییە لە ئەمەریکا.

١٩٩٩ بەشەکانی نووسیاریی خزمەتگوزاریی ئەڵمانیایی و خزمەتگوزاریی ئەورووپاییی dpa ڕێک خرانەوە و بەشێکی نوێی نەرمەهەواڵی گشتیش دامەزرا. بەشی هەواڵی ئابووری dpa-AFX لە دامەزرا و لە ١ی تەمووزدا دەستی بەکار کرد (٥٠٪ی هی dpaیە).

٢٠٠٠ یەکەیەکی نوێی ئەسۆشیێتد پرێس دیجیتاڵ دامەزرا بۆ ئەوەی جەخت بکاتە سەر بابەتە بازرگانییەکان بۆ ئینتەرنێت و سەرچاوەکانی بەرهەمی میدیا جۆراوجۆرەکان و توانای گەیاندنی زانیاری لەسەر بوارە جۆراوجۆرەکانی تێکنۆلۆجیا.

٢٠٠٠ لە شوباتدا ALCATEL و AFP بەیەکەوە تیمی هەواڵ بۆ ئینتەرنێتی گواستراوەیان پێک هێنا.

٢٠٠٠ لە ژاپۆن، AFP بواری نوێی کاری کردەوە، کاتێ دەستی بەبڵاوکردنەوەی وێنەی وەرزشی لەسەر نەوەی سێیەمی تەلەفۆنی مۆبایل کرد.

٢٠٠٠ لە مانگی ئاداردا، AFP پشکی گرووپی فایننانشیال تایمزی لە AFXدا، کە ٥٠٪ بوو، کڕی. لە ئەیلوولیشدا ریکسفیچەرز چووە پاڵ ئیمجفۆرومی AFP.

٢٠٠٠ رۆیتەرز خزمەتگوزاریی زانیاری و شیکاریی داراییی CAMRA و خزمەتگوزاریی زانیارییەکانی ئەلێکس براون ئینڤێستمێنت ترەستس BT و خزمەتگوزاریی زانیاریی ORTی لە فرانسەدا کڕی و زۆربەی پشکەکانی یانکی گرووپی ئەمەریکای بە ٧٢,٥ ملیۆن کڕی.

٢٠٠٠ گرووپی میدیاییی نیوس وۆرڵد کەمیونیکەیشنز، کە سەن میونگ موون دایمەزراندووە و ڕۆژنامەی واشنتۆن تایمزی تێدایە، UPIی کڕی.

٢٠٠٠ نووسینگەی ناوەندیی نوێی dpa لە بەرلین کرایەوە. هەروەها dpa ئینفۆ

دامەزرا و dpa فۆتۆداتابانک لە ئینتەرنێتدا ڕای لەپان خرا.

٢٠٠١ رۆیتەرز بەشێکی ئینستینێتی خستە بازاڕ و سیستمگەلی بریج ئینفۆرمەیشنی و دایاگرامی کڕی.

٢٠٠١ ئاژانسی UPI پێش کەوت و سیستمی نووسیاری و بڵاوکردنەوەی فرەزمانی دەست پێ کرد کە بەبێرنینی ناسراوە و هەموو نووسینگەکانی UPI لە سەرتاسەری جیهاندا بەکاری دێنن.

٢٠٠١ بێلگا خزمەتگوزاریی SMS و WAPی پێش خست و دەستی بەخزمەتگوزاریی ڤیدیۆیی کرد.

٢٠٠٢ AFPو ڤیزیوێر تواناکانی خۆیان لە تەلەفزیۆنی ئاوێتەدا یەک خست.

٢٠٠٢ ئینستینێت کە لقێکی رۆیتەرزە ECN ئایسلاندی ڕکابەری خۆی کڕی و رۆیتەرزیش پشکی خۆی لە LNR فرۆشت.

٢٠٠٢ لە ١ی نیسانەوە، ئاژانسی دەنگوباسی نیوسیس کە لە لایەن هایون چۆیەوە دامەزرا، دەستی بەبڵاوکردنەوەی بابەتی هەواڵی بیانی کرد بەسەر میدیا خۆماڵییەکانی کۆریادا. ناوبراو لە تشرینی یەکەمی ١٩٩٧ەوە هەوڵی وەرگرتنی مۆڵەتی ئاژانسی دەنگوباسی داوە بەڵام حکوومەت ڕەتی دەکردەوە و دوای شەڕێکی یاسایی دووردرێژ توانیی سەرکەوێ.

٢٠٠٢ دووبارە UPI خزمەتگوزاریی ئەمەریکای لاتینی دەست پێ کردەوە و جارێکی تر بابەتەکانی بەزمانی ئیسپانی پێشکێش کردەوە و بابەتەکانی لەمەڕ ئەمەریکای لاتین و ویلایەتە یەکگرتووەکان و جیهانن.

٢٠٠٢ خزمەتگوزاریی نێودەوڵەتیی dpa بەزمانی ئینگلیزی ڕێک خرایەوە و لە مانگی ئابەوە نووسینگەی سەرەکیی نووسیاری لە کۆرکی ئایرلاندا بوو.

٢٠٠٣ لویس د بۆکاردی وەک سەرۆک و بەڕێوەبەری کارگێڕی ئەسۆشیێتد پرێس، دوای ١٨ ساڵ، خانەنشین بوو و تۆماس کیورلیی سەرۆکی پێشوو و بڵاوکەرەوەی یو ئێس ئەی تودەی جێی گرتەوە. هەروەها خزمەتگوزاریی ئەسۆشیێتد پرێسی ئێلیکترۆنی ئاشکرا کرا.

٢٠٠٣ ئەسۆشیێتد پرێس ئەرشیڤێکی دامەزراند بەمەبەستی پاراستنی ڕۆڵی

ئاژانسەکە لە مێژووی ڕۆژنامەوانیدا. هەروەها ئەسۆشیێتد پرێس و ئایپوسس بوونە هاوبەش لە بواری ڕێکخستنی ڕاپرسی بۆ زانینی ڕای گشتی.

٢٠٠٣ ئاژانسی UPI خزمەتگوزارییەکانی خۆی کردە دوو بەشەوە: بەشێکی تایبەت بەهەواڵی کورت لەسەر ڕووداوە نوێکان و بەشی دووەمیش بۆ بابەتی درێژتر و شیکردنەوە و کۆمێنتار و ڕاپۆرتی ورد و درێژ لەسەر بابەتە گرینگەکان.

٢٠٠٤ لە یادی ڕزگارکردنی پاریسدا، AFP ئەرشیڤی خۆی کردەوە.

٢٠٠٤ ئاژانسی UPI دووبارە نووسینگەی خۆی لە بەیرووت کردەوە وەک ناوەندی خزمەتگوزارییە عارەبییەکەی و ئاسانکردنی داپۆشینی ڕاستەوخۆی ڕووداوەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بەزمانی عارەبی.

٢٠٠٤ رۆیتەرز خزمەتگوزاریی هەواڵی تەلەفزیۆنی کردەوە و بەمەش چیرۆکی ڤیدیۆیی لە سەرتاسەری جیهانەوە خستە بەردەستی کڕیارەکانی لە ماڵەکانی خۆیاندا. ئەم خزمەتگوزارییە یەکێکە لە خزمەتگوزارییە یەکەمەکان کە شیاوی بەکارهێنان بوون لەگەڵ مایکرۆسۆفت ویندۆز XP 2005. هەروەها رۆیتەرز دەستی بەخزمەت گوزارییەکی بازرگانی و دارایی کرد لەسەر تۆڕی ڤۆدافۆن لایف بۆ بەکارهێنانی تەلەفۆنی مۆبایل لە بریتانیا.

٢٠٠٤ ئاژانسی دەنگوباسی ئۆپیک OPECNA کە بارەگاکەی لە سکرتارییەتی ڕێکخراوەکەیە لە ڤیەننا، دوایین بەلاڤۆکی خۆی لە ٣٠ی کانوونی یەکەمدا گواستەوە.

٢٠٠٥ رۆیتەرز لەگەڵ CME کە گەورەترین کۆمپانیای ئاڵوگۆڕە لە ئەمەریکا خزمەتگوزاریی CME FXیان لەسەر رۆیتەرز دەست پێ کرد.

٢٠٠٥ ماڵپەڕەکانی ئەسۆشیێتد پرێس و ئازادکردنی زانیاری لە بەشێکی تری تۆڕەکەیاندا دەستیان پێ کرد.

٢٠٠٥ لە ٢٢ی تشرینی دووەمدا، NAM قایل بوو بەزیندووکردنەوەی NANAP (پوول) بەوەی لەگەڵ تۆڕی دەنگوباسی بێلایەن NNN جێگۆڕکێی پێ بکا.

# پێڕست

